لە چاپکراوەکانی ئەمینداریتی گشتی ی رۆشنبیریی و لاوانی

ناوچەی کوردستان

# نووسینی کوردی

# بە ئەلفوبێی عەرەبی

دوکتۆر

ئەورەحمانی حاجی مارف

# پێشەکی

نووسین دەستکەوتێکی مەزنی ئادەمیزادە و پەیدابوونی سەرەتای مێژووی شارستانەتی یە . نووسین لە ژیانی گەلان و تێکرای کۆمەڵ و هەر یەك لە ئەندامانیدا دەورێکی گەورەی بینیوە و دەبینێ و کارێکی زۆری تێ کردووە و تێ دەکا . لەبەرئەوە لێکۆڵینەوە لە سەرەتا و مێژوو ، ڕێباز و شێواز ، پێکهاتن و کارکردن ، ناتەواوی و کۆسپ ، پێشکەوتن و گەشەکردن . . . ی نووسین کارێکی مەزن و پێویست و بەسوودە . لەم ڕێگەیەوە دەتوانرێ چارەسەری گەلێك کێشەی گرنگ بکرێ . بێگومان نووسینی کوردی کە هێشتا زۆر سەری پرە لە پاشاگەردانی ، چاوەنواری لێکۆڵینەوەی قووڵ و تێر و تەسەلە ، چاوەچاوی باسێکیەتی کە لە گشت ڕوویەکی بدوێ و بە بیر و باوەڕی ڕاست و زانستانە گیروگرفتەکانی لە ڕێ لا بدا . . .

وەك ئاشکرایە ، سەرجەمی ڕووناکبیرانی کورد هەمیشە لە بەردەم گیروگرفتەکانی نووسینی کوردیدا تووشی چەندین قۆرت و تەگەرە بوون و دەبن . ئەمڕۆش کە کێشەی نووسینی کوردی بووەتە باسی باسان ، وەنەبێ هۆکەی هەر ئەوە بێ کە مامۆستایان لە گرانیی وتنەوەی گلەیی یانە و قوتابیان لە سەرلێ‌دەرنەکردنی ماندوو بوون و نووسەران و ڕۆژنامەنووسان بە کێشەی هەمەجۆریەوە گیریان خواردووە . بەڵکو هۆ ئەوەشە کە مەسەلەی چۆنیەتیی نووسینی هەر زمانێك لە پلەی یەکەمی کێشەکانی زمانەوانیدا دێت . بێتوو ئەمڕۆ بۆ هەر کێشەیەکی زمانی کوردی کۆڕی لێکۆڵینەوە ببەسترێ ، ڕەنگە بەهەڵەدا نەچم ئەگەر بڵێم چ لە لایەن زانایانەوە و چ لە لایەن ڕووناکبیرانەوە باسی ڕێنووس پتر بایەخی پێ دەدرێت . ئەوەتە دەستەی کوردیی کۆڕی زانیاری عێراق هەر کە بانگەوازی سازکردنی کۆڕێکی بۆ گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی بڵاوکردەوە[1] ئەوەندەی پێ نەچوو چەندین باس و لێکۆڵینەوە گەیشتنە بارەگای کۆڕ . . . وا بزانم مامۆستایەك یان

(١) بانگەوازێك لە دەستەی کوردیی کۆڕی زانیاری عێراقەوە (کۆڕێك بۆ گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی) ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد» ، ب ٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ل ٢٩٦ ـ ٢٩٨ .

قوتاپی‌یەك ، نووسەرێك یان ڕووناكبیرێك نییە چاوەڕوانی و ئاواتی ڕزگاربوون لە كۆسپ و گیروگرفتەكانی ڕێنووس لە چاویدا نەدرەوشێتەوە .

لە زانستی زماندا سەبارەت بە ڕێنووس پرسیارێك دێتە گۆڕێ : كیمیا و فیزیا زانستن ـ بەڵام ئەی ڕێنووس ؟

ئەگەر لەبەر ڕووناكیی ئەو پێناسانەی لە گەلێك كتێب و فەرهەنگدا بۆ (زانست) دانراون ، لە (ڕێنووس) یان بە واتایەكی تەواوتر لە (تیۆریی ڕێنووس) وردببینەوە ، بۆمان دەردەكەوێ ڕێنووس بەشێكە لە زانستی زمان ، هەر وەك چۆن ئەتۆم بەشێكە لە زانستی فیزیا . . . چۆن لە هەر زانستێكدا ئەركی دۆزینەوە و گەشەپێدان و چەسپاندنی شت لە ئەستۆی زانایان و پسپۆڕاندایە ، هەر بەو چەشنە ڕێنووسیش كاری زمانەوانانە . . .

لە بەراوردكردنی ڕێنووس لەگەڵ زانستی تردا ، ئەوە بەدیاردەكەوێ كە ڕێنووس خاوەنی تایبەتی‌یەتێكی خودی‌یە . ئەو تایبەتی‌یەتی‌یەش لەوەدایە كە هەموو كەسێكی خوێندەوار واتە هەر كەسێك بیەوێ بنووسێ ـ پێویستی بە زانینی دەستوورەكانی ڕێنووسە ، چونكە هەر لە سەرەتای دەست‌كردنەوە بە خوێندن تا كۆتایی ژیان دەنووسێ و دەخوێنێتەوە . . . كەچی هەر شتێكی نوێ لە هەر زانستێكدا كە دەدۆزرێتەوە ، ئەگەرچی كەڵكی بۆ سەرپاكی ئادەمیزادیش هەبێ ، ڕەنگە زوربەی خەڵك بەكاری نەهێنن ، یاخود ئەگەر بەكاریشی بێنن بێ بیركردنەوە بەكاری بێنن . بەوێنە یەكێك كە مەكینەی ڕیش‌تاشینی كارەبا یان ئوتووی كارەبا بەكار دێنێ ، دەشێ هیچ لە یاساكانی فیزیا نەزانێ ، یاخود ئەگەر بیشیزانێ شتێكی كەمی لێ بزانێ . . . كەچی تەنانەت بۆ نووسینی شتی سەرەتاییش ، پێویستە هیچ نەبێ دەستوورە سەرەكییەكانی ڕێنووس بزانێ ـ واتە بێ شارەزایی ڕێنووس ، خوێندنەوە و نووسین كارناكەن و خوێندەوار كاتێك كەڵك لە نووسین وەردەگرێ كە سەر لە دەستوورە سەرەكییەكانی دەركات . جا چالاكیی بەكارهێنان ئەو تایبەتی‌یەتەیە كە ڕێنووس لە زانستی تر جیادەكاتەوە . دیارە هەر ئەو تایبەتی‌یەتەشە بووە و دەبێ بە هۆی سازكردنی موناقەشەی گەرم لە باسی هەر كێشەیەكی ڕێنووسدا .

بەڵام وەك چۆن زانینی ڕاكێشانی تەلی كارەبا و چاككردنەوەی ، باش

شارەزایی لە واقیعی یاساکانی فیزیا ناگەیەنێ ، هەر بەو چەشنە پەیداکردنی ئاشنایەتی لە دەستوورەکانی ڕێنووسیش نیشانەی باش چوونە ناو ئەو زانستە نییە .

ڕێنووس بریتییە لە کۆمەڵێك دەستوور کە بە هاریکارییان ئاخاوتنی ئێمە یان پێ دەنووسرێ . ئەوەی دەنووسێ ئەگەر لە دەستوور لابدا ، هەڵەی ڕێنووس دەکات . ئەو جۆرە هەڵانەش کۆسپ دێننە ڕێگەی خوێندنەوەی تێکست . ئەو کۆسپانەش سەرنجی خوێنەر لە تێگەیشتنی ناوەڕۆك کەم دەکەنەوە .

ڕێنووسی هەر زمانێکیش یاسا و دەستووری تایبەتی خۆی هەیە ، کە لەسەر بناغەی دیاریکراو دامەزراوە . بەوێنە ڕێنووسی زمانی کوردی لەسەر ڕێبازی فۆنەتیکی سازکراوە ؛ لە ڕێنووسی زمانی ڕووسیدا ڕێبازی فۆنەتیکی و مۆرفۆلۆژی کاریگەرن[2] ؛ ڕێنووسی ئینگلیزی و فەرەنسی پەیرەوی ڕێبازی چاولێکەری دەکەن ، کە هۆی نووسینی گەلێك وشە بەو شێوەیەی ئێستا وا ڕوون دەکەنەوە گوایا باووباپیرانیان بەوجۆرە نووسیویانە[3] . . .

هەر ڕێنووسێك بە زۆری ، ڕەنگی تایبەتییەتەکانی ئەو زمانە دەداتەوە ، کە ڕێنووسەکەی بۆ دانراوە[4] . جا بۆیە ئاسان نییە ڕێنووسی زمانێك بەسەر زمانێکی دیدا داببڕێ ، هەر وەك چۆن جلی یەکێك پڕ بە بەری یەکێکی تر نییە . بۆیە لە لێکۆڵینەوە و دەستکاری کردنی ڕێنووسدا پێویستە تایبەتێتی و یاساکانی ئەو زمانە بە باشی ڕەچاو بکرێن . . . ئێمەش بەو پێیە لە نووسینی ئەم کتێبەماندا ـ « نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی » ، هەوڵمان داوە لەبەر ڕووناکیی یاسا و دەستوورەکانی زمانی کوردیدا لەو کێشەیە بکۆڵینەوە .

کاتێ خەریکی نووسینی کتێبی « زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا » بووم « لە سەرەتادا نیازم وا بوو ، باسی (فۆنەتیك) و ( نووسین) بە یەك کتێب بڵاوبکەمەوە ، چونکە ئەو دوو باسە بە تەواوی پێکەوە بەستراون و ئێجگار

---

(٢) ب . ز . بوکچینا ، ل . پ . کەلاکۆتسکایا ، ل . ك . چێلتسۆڤا ، نامە دەربارەی ڕێنووس ، مۆسکۆ ، ١٩٦٩ ، ل ٣٧ .

(٣) هەمان سەرچاوە ، ل ٣٧ .

(٤) دیارە ئەو ڕێنووسانە نەبێ کە پەیرەوی ڕێبازی چاولێکەری دەکەن .

تێکچرژاون ، بەڵام وا هاتە پێشەوە کە بیانکەمە دوو کتێبی سەربەخۆ[٥] . ئەوەبوو ساڵی ١٩٧٦ کتێبی یەکەمیانم بڵاوکردەوە . واش بەتەما بووم کە دووەمیان دوای ماوەیەکی کەم تەواو بکەم ، بەڵام بۆم ڕێ نەکەوت . کەرەستەی ئەم کتێبەم کە چەند ساڵێك بوو کۆم کردبووەوە ، لەم دواییەدا ـ واتە دوای بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەی کۆڕ ـ هێنایە بەردەست . لە پێشدا کەوتمە لێکۆڵینەوە لە مێژووی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، بەو مەبەستەی دەورەکانی پێشکەوتنی دیاری بکەم ، چونکە لە لێکۆڵینەوەی هەر کارێکی نوێدا ئاوردانەوە لە کاری پێشوو بایەخ و سوودی خۆی هەیە . دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر ئەو بەشەم تەواو کرد و وەك وتارێك بە ناوی « کورتەیەکی مێژووی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی » یەوە لە « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » دا بڵاوم کردەوە[٦] . ئەو شوێنکەوتن و لێکدانەوەیەی نووسینی کوردی و هەروەها کەڵك وەرگرتن لە داخوازییەکانی زانستی زمان و چوونە ناو فۆنەتیك و ڕێزمانی کوردییەوە ، ئەو ڕێگەیەیان بۆ خۆش کردم کە باسێك لەبارەی کۆسپ و تەگەرەی ڕێنووسی کوردییەوە ئامادە بکەم و بەناوی «گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی» یەوە بیکەمە وتارێك بۆ بەشداری کردن لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردیدا[٧] .

---

(٥) بڕوانە : د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ١١ ، پەراوێزی ژمارە ١١ .

(٦) د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، کورتەیەکی مێژووی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ژ ٨ ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ٦٦ ـ ١٢٠ .

(٦) د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد» ، ژ ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٦ ـ ٧٧ .

(٧) بەدوا ئەو دوو وتارەدا ، چەند وتارێکی تریشم بڵاوکردەوە کە پێوەندییان بە نووسین و ڕێنووسەوە هەیە . بەوێنە بڕوانە :
أ ـ د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕێنووسی کوردی لە ڕۆژنامەی « تێگەیشتنی ڕاستی » دا ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد» ، ب ١٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٧٦ ـ ١٣١
=

وابزانم باسی (نووسینی کوردی به ئەلفوبێی عەرەبی)م - واتە کۆڵینەوەو توێژینەوە لەو کێشانەی پێوەندییان بە مێژووی پێشکەوتنی ئەلفوبێی دەستکاری کراوی عەرەبی و گیروگرفتەکانی ڕێنووسی ئەمڕۆی کوردییەوە هەیە تارادەیەك لەو دوو وتارەدا شی کردوّتەوە . جا بۆیە وام بە پێویست زانی کۆیان بکەمەوە و بە کەرەستەی باشی نوێ تەواو دەوڵەمەند و فراوانیان بکەم و لە شێوەی کتێبێکدا بیانخەمە بەردەستی خوێنەرانی بەڕێز . بۆ باشتر مەبەست پێکان لەبارەی نیشانەکانی خاڵبەندیشەوە دواوم و کردوومەتە بەشی چوارەمی ئەم بەرهەمە . لەبەر چەند هۆیەکیش وام بە باش زانی هەندێ زانیاری گشتی لەبارەی پەیدابوون و گەشەکردن و جۆرەکان و ئەرك . . . ی نووسینەوە بخەمە سەر . ئەوەتە ئەو جۆرە زانیارییانە بە ناوی «نووسین و جۆرەکان و مێژووی» ەوە بووەتە بەشی یەکەمی ئەم کتێبە .

دوای هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر بۆ گەیاندنە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی[8] ، ئەوەی بۆم کرا کردم و ئەوەی لە توانستمدا بوو

---

= ب - د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، پێداچوونەوەی هەندێ بیروڕای زمانەوانیی مامۆستا مەسعوود محەمەد ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ۹۰ ، بەغدا ، ۱۹۸۲ ، بەشی یەکەم ، ل ۱۰ - ۱۵ ؛ ژ ۹۲ ، بەغدا ، ۱۹۸۲ ، بەشی دووەم ، ل ۱۳ - ۱۸ .

ح - د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، چەند وشەیەك دەربارەی وتاری (لەگەڵ دەنگسازی کوردیدا) ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ۹۰ ، بەغدا ، ۱۹۸۳ ، ل ٦۲ - ٦۹ .

د - د . ئەورەحمان حاجی مارف ، مووڕووی مالاوسێ مەگەر بە شەو بکرێتە مل ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ، ژ ۹ ، بەغدا ، ۱۹۸۲ ، ل ۵۱ - ۷٤ .

هـ - د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، لە ڕێگای ڕاستگۆیی و دەستپاکی و زانستدا ، ڕۆژنامەی « عێراق » ، بەشی یەکەم ، ژ ۲۱٦۰ ، بەغدا ، ۹ ی مارتی ۱۹۸۳ ، ل ۷ ؛ بەشی دووەم ، ژ ۲۱۷۹ ، بەغدا ، ۳۰ ی مارتی ۱۹۸۳ ، ل ۷ .

و - د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، نووسین و جۆرەکانی و مێژووی ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ۸ ، هەولێر ، ۱۹۸۳ ، ل ٤٦ - ۵۰ .

ز - د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ڕیشەوە ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٤ ، هەولێر ، ۱۹۸۳ ، ل ۳۹ - ٤۷ .

(۸) وەك ئاشکرایە ، کورد جگە لە ئەلفوبێی عەرەبی بە چەند ئەلفوبێیەکی دیش دەنووسێ ، وەك : لاتینی ، سلاڤی . . . بەلام لەبەرئەوەی مەبەستی ئەم کتێبەمان لێکۆڵینەوەیە لە نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، بۆیە بایەخمان بە جۆرە نووسینەکانی تر نەداوە .

بەجێم هێنا . . . هیچ گومانم نییە ، کە ئەم کارەی پێشکەش بە نەتەوە خۆشەویستەکەمی دەکەم ، کارێکی تەواو نییەو کەم و کورتی تێداهەیە ، بەڵام ئەوەندەش هەیە سەرەتایەکە لەبارەی کێشەی مێژوو و گیروگرفتەکانی نووسینی کوردییەوە بە ئەلفوبێی عەرەبی و گەلێك کەرەستەی نوێی وەهای تێدایە ، کە تائێستا لە لێکۆڵینەوەی نووسینی کوردیدا باسیان نەکراوە .

پڕ بە دڵ سوپاسی مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم دەکەم ، کە لە دەرکردنی ئەم کتێبەدا گەلێك هاریکاری لەگەڵ کردم . هەروەها زۆر سوپاسم بۆ کرێکاران و لێپرسراوی چاپخانە هەیە ، کە بەڕاستی دڵسۆزانە لە چاپدانی ئەم کارەیان بۆ هەڵسوڕاندم .

مایەی بەختەوەریم دەبێ وهیوا و ئاواتێکی گەورەم دێتەدی ، ئەگەر بەم کارە خزمەتێکی بچووکم پێشکەش بە زانیاری گەلەگەکەمان کردبێ و لەبارەی نووسینی کوردییەوە چەند وشەیەکی بەکەڵکم نووسیبێ .

د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف





# نووسین و جۆرەکانی و مێژووی

لە بەراوردکردنی ئاخاوتنەوە لەگەڵ نووسین ، ئەوە دەردەکەوێ کە ئاخاوتن زۆر لە نووسین کۆنترە . تەمەنی ئاخاوتن لە (٤٠٠ ـ ٥٠٠) هەزار ساڵ کەمتر نییە ، بەلاّم تەمەنی نووسین هەر هەشت نۆ هەزار ساڵێك دەبێ[1] .

نووسین وەسیلەیەکە بۆ لە یەکتر گەیشتن و تەواوکەری ئاخاوتنە . پێویستی ئادەمیزاد بۆ لە یەکتر گەیشتن لە دوورەوە و لە کاتی جیاوازدا بووە بەهۆی پەیدابوونی نووسین . دیارە قسە ئەگەر بەهۆی نیشانەی تایبەتی یەوە لەسەر شتێك نەنووسرێ ، ئەوە نە کەسێکی دوور دەتوانێ لێی ئاگادار بێ و نە بۆ دەمێکی دواتریش دەمێنێتەوە[2] . بەوێنە یەکێك بیەوێ هاورێیەکی لە شارێك یان ولاّتێکی تر پاش ساڵێك کارێکی بۆ جێبەجێ بکا ، ئەوە دەتوانێ نامەیەکی بۆ بنووسێ و بیخاتە زەرفێکەوە و لەسەری بنووسێ ، کە دوای ساڵێك بیکاتەوە . جا پاش ساڵێك ماوەیەك بەسەر نووسینی ئەو نامەیەدا تێدەپەرێ و رەنگە دوو هاورێکەش هەزاران کیلۆمەتر لە یەك دوور بن ، بەلاّم ئەو نووسینە مەبەستەکەی پاراستووەو گەیاندوویە . ئەگەر ئەم داوایە نەنووسرایە و هەر وەك قسە بکرایە ، نە دەگەیشتە جێ و نە دەمایەوە . . هەروەها دەزانین ، ئەگەر دوو کەس چەندیش دەنگە گەورە بن ، لە چوار پێنج کیلۆمەتر دوور لە یەکترەوە ناتوانن بە باشی گوێیان لە یەکتر بێ و چاك لە یەك تێبگەن .[3]

پەیدابوون و بوونی نووسین وەك وەسیلەیەکی تایبەتی بۆ لە یەکتر گەیشتن ، دەورێکی دیاری بووە و هەیەتی . نووسین یارمەتی ئادەمیزادی داوە لە کورتکردنەوەی دووری و کاتدا ، تەجروبەی ئادەمیزادی پاراستووە و دەپارێزێ و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دی هێشتۆتەوە و دەهێڵێتەوە و لە گەڵێکەوە بۆ

---

(١) پ . ن . گۆلۆڤین ، سەرەتایێکی زمانناسی ، چاپی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٢٣٦ .

(٢) ڤ . ئی . کۆدۆخۆف ، سەرەتایێکی زمانناسی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٩ ، ل ١٥٦ .

(٣) بێگومان ، ئەگەر تەلەفوون و رادیۆ و هەندێ وەسیلەی دی تەکنیکی لەنەزەر نەگرین .

گەلێكی تری گەیاندووە و دەگەیەنێ . بەهۆی نووسینەوە هەر مرۆڤێـك دەتوانێ كەڵك لە تەجروبەی مرۆڤایەتی وەربگرێ و گەشەی پێ بدا .
هەرچی دیاردەیەكی گەورەی سیاسی یان ئەدەبی یان زانستی هەیە ، كە لە ناوچەیەكدا لەدایك بووە ، بەهۆی نووسینەوە گەیشتووەتە هەموو جیهان .
دەنگی ئادەمیزاد بە بێ ئامرازی تایبەتی وەك : تەلەفوون و رادیۆ و . . . هتد تەنیا لە سنوورێكی تەسكدا دەمێنێتەوە و لە چوارچێوەی گوێ لێ بووندا كاردەكات .
ئەوەی پێوەندی بە مانەوەشیەوە هەیە لە رووی كاتەوە ، دەمێكە قسەی نەستەقی وا وتراوە كە نووسینی بە گرنگتر لە ئاخاوتن داناوە . بۆنموونە رووسەكان دەڵێن : « وشە چۆلەكە نییە ، كەچی دەشفرێ و ناگیرێ» بەڵام « ئەوەی بە قەڵەم نووسراوە ، بە تەوریش نابڕێتەوە » . ئەمەش نزیكی لەگەڵ ئەو قسە نەستەقە لاتینی یەدا هەیە ، كـە دەڵێ : « Verba volant — scripta manent » واتـە « وشـە دەفـرێ ، نـووسـین دەمێنێتەوە »[4] .

راست وایـە پەیـدابوونی نـووسین بگـەڕێنینەوە بـۆ ئەو سـەردەمانـەی كە قسەكەران پێویستیان بەوە بووە ، زەحمەتیی گەیاندنی دەنگی خۆیان بە هۆزێك یان نەوەیەكی دی ئاسان بكەن . بۆیە لە رووی ئەركەوە جۆری هەرە دێرینی نووسین ، نامە و نووسراوی سەر كێلی گۆڕ بووە ، بەڵام ئەم جۆرە نووسینەش هەر وەك زمانی ئاخاوتن زوو بەسەرچوو . بەدوا ئەمەدا نووسراوی هـەڵكەنـراوی سـەر بـەرد و دیواری ئەشكەوت و تاقی سەركەوتن . . . هتد هاتە كایەوە . لەگەڵ پێشكەوتنی كۆمەڵی ئادەمیزاددا نووسینیش پێش كەوت و ئەركی پاشان وردە وردە فراوانتر بوو و جۆری نوێی لێ پەیدا بوو . ئەو نووسینانەی ئەمڕۆ دەیانبینین لە ئەنجامی هەوڵ و تەقەلای دوور و درێژ و بەردەوامیی شەن و كەو كردنی ئەوەی زووتر لەو بارەیەوە كراوە ، هاتۆتە بەرهەم .
نووسین كە كەرەستەیەكی تەواوكەری زمانی ئاخاوتن و لە یەكتر گەیشتنە ، لە شێوە و جۆری هەمەچەشنی خۆیدا لە سەردەمی جیاوازدا بە چەشنی جیاواز پێوەندی لەگەڵ زمانی گفتوگۆدا بووە .

---

(٤) ئا . ئا . ریفۆرماتسكی ، سەرەتایێكی زمانناسی ، چاپی چوارەم ، مۆسكۆ ١٩٦٧ ، ل ٣٤٨ .

لەگەڵ یەك نەبوونی بیر و رای هەندێ زاناشدا ، بەر لە هەر شت پێویستە گومانی پەیدابوونی نووسین لە پێش زمانەوە بڕەوێنینەوە . ئەگەر مرۆڤ زمانی نەبێ ، نووسینیشی نابێت . نووسین لە هەموو پلەکانی پێشکەوتنی ئادەمیزاددا تەواوکەری ئاخاوتنە ـ واتە دووەم وەسیلەی لە یەکتر گەیشتنە . دەربڕینی زمان بەهۆی ئەلفوبێوە هی دەورێکی زۆر درەنگی پێشکەوتنی نووسینە . . وا دیارە لە سەرەتادا پەیام پەیدا بووە . لەم بارەیەوە هیرادۆتی مێژوونووسی یۆنانی (سەدەی ٥ ی پ . ز .) نووسیویتی ، کە وا کاتێ ئەسقووفەکان لەگەڵ فارسەکاندا شەڕیان دەکرد پەیامێکیان بۆ ڕەوانە کردن کە لەم گیاندارانە : (بۆق ، مشك ، مەل) و پێنج تیر پێکهاتبوو ، کە واتای « ئەگەر ئێوەی فارس وەك بۆق لە زەلکاودا قونەقون بکەن و وەك مشك لە کوندا خۆتان بشارنەوە و وەك مەل بفرن ، ئەوە وەك گەلای دار بە تیرەکانمان دەتان خەین » . ئەم نموونەیە نیشانەیەکی ڕەمزییە ، کە هەر شتێك تێیدا ڕاستەوخۆ ڕەمزێك نیشان دەدا ، وەك (مە ل ـ فڕین . . . هتد) . مانای گشتیی ئەو پەیامە لە لایەن ڕەبەنەکانی دارای پادشای فارسەوە لێكدرایەوە[5] .

لەتەك ئەو نیشانە ڕەمزییە ، هەروەها نیشانەی مەرجیش هەیە ، ئەویش ئەوەیە کە شتەکان هیچ دەرنابڕن ، بەڵام وەك نیشانەی مەرجی بەکاردەهێنرێن . بەوێنە پەیامێکی بە (کیپو) بەناوبانگی ناوچەی پیرۆ (لە خوارووی ئەمەریکا) کە بریتییە لە : دارێك پەتی هەمەڕەنگی پێدا هەڵواسراوە و گرێی جۆربەجۆریان لێ دراوە (بڕوانە : وێنەی ژمارە ١) . یاخود پەیامێکی خێڵی ئیرۆکیزی[6] ، کە بە (وامپۆم) ناسراوە بریتییە لە : پشتێنێك و گوێچکە ماسیی هەمەڕەنگی گەورە و بچووکی پێوە کراوە (بڕوانە : وێنەی ژمارە ٢)[7] .

ئەم جۆرە پەیامانە بە زۆری هەواڵی بەڵا و وێرانییان دەگەیاند . . . لە بارەی واتای گرێی پەتەکان و دانانی گوێ ماسییەکانەوە ، بێگومان پێویستە زووتر ئەوە بزانرێ کە کێ نامەی وا دەنووسێ و کێ وەری دەگرێ . جا ڕەبەنەکان ئاگاداری

---

(٥) هەمان سەرچاوە ، ل ٣٤٩

(٦) یەکێکە لە خێڵە هیندییەکانی خوارووی ئەمەریکا .

(٧) سەرچاوەی ناوبراو ، ڤ . ئی . کۆدۆخۆڤ ، سەرەتایێکی زمانناسی ، ل ١٥٧ .



وێنەی ژمارە ١



وێنەی ژمارە ٢

ئەوە بوون و بۆیە بەئاسانی لە مەبەست تێدەگەیشتن(٨) .

بەم جۆرە بە واتایەکی فراوان ، دەتوانرێ هەموو شێوەیەکی لە یەکتر گەیشتنی مرۆڤ بە یاریدەی نیشانەی بینراوەوە دەرببڕرێ - واتە بە هەر نیشانەیەك کە چاو ببینێ . . . ناوەرۆکی ئەم دیاری کردنە تەنیا نووسین و چاپ ناگرێتەوە ، بەڵکو هەموو نیشانەیەکی تری وەك : نیشانەی هاتوچۆ و نیشانەی سەر قوتوی شیر و گۆشت . . . یش دەگرێتەوە .

* * *

---

(٨) سەرچاوەی ناوبراو ، ئا . ئا . ریفۆرماتسکی، سەرەتایێکی زمانناسی ، ل ٣٤٩ - ٣٥٠ .

زانست سێ جۆری سەرەکی نووسینی لێ ئاشکرایە ، کە بەپێی پلەی مێژوو بەدوا یەکدا هاتوون :

یەکەم جۆری نووسین لە مێژووی ئادەمیزاددا ، نووسینی وێنەیی (Pictography ـ الکتابة التصويرية) یە . نموونەی نووسینی پیکتۆگرافی[9] چ لە لایەن زانایانی ئاسەوار و چ لە لایەن ئەتنۆگرافەکانەوە دۆزراوەتەوە .

لە نووسینی وێنەیی‌دا وێنەی مرۆڤ ، بەلەم ، گیانلەبەر . . . بە خەت کێشراوە . بێگومان چ ئەوانەی بە مێژووی هونەر و چ ئەوانەی بە ئەتنۆگرافیاوە خەریکن ، لێکۆڵینەوەی ئەو جۆرە وێنانەیان بەلاوە گرنگە ، چونکە هونەر و نووسین لەم رووەوە بەیەکەوە بەستراون ، بەڵام لە رووی ئەرکی نووسینەوە ، مەسەلەی هونەری گرنگ نییە .

وێنەی ژمارە (٣) کە « یادداشت » ی راوکەرێکی ئەسکیمۆیە و وێنەی ژمارە (٤) کە « داواکاری » ی هیندییەکانە ، دوو نموونەی جوانی نووسینی وێنەیین . یەکەمیان خوێندنەوەی ئاسانترە ، چونکە ناوەرۆکەکەی باش دیارە «مرۆڤێك چوو بۆ راو ، پێستی درندەیەکی دەستکەوت ، دواتر پێستێکی تریش ، راوی فیلی ئاویی کرد ، لەگەڵ راوکەرێکی دیدا سواری بەلەم بوون ، شەو مایەوە» . لێرەدا ریزی هێڵەکانی وێنەکە واتای ریزی هێلەکانی رووداوەکە نیشان دەدەن .

وێنەی دووەم داواکاریی خێڵە هیندییەکانە لە سەرۆکەکەیان ، کە دەیانەوێ رێگەیان بدات بچن لە ناوچەی دەریاچە جێ‌نشین بن . ئەم پیکتۆگرافی‌یە خوێندنەوەی گرانترە ، چونکە جگە لە باسی گیاندار ، هەروەها مەبەستی واتای داخوازیی خێڵە هیندییەکان باسەکە فراوانتر دەکات[10] .



وێنەی ژمارە (٣)

---

(٩) پیکتۆگرافی ـ Pictography لە دوو وشەی (Pictus ـ جوان ، قەشەنگ)ی لاتینی و (grapho ـ دەنووسم) ی یۆنانی پێکهاتووە . بەم جۆرە وشەی پیکتۆگرافی بە مانای ـ جوان نووسین ـ دێت .

(١٠) سەرچاوی ناوبراو ، ئی . ئا . رێفۆرماتسکی ، سەرەتایێکی زمانناسی ، ل ٣٥١ ـ ٣٥٣ .



وێنـەی ژمارە (٤)

بۆ تەواو ڕوونکردنەوەی ئەم جۆرە نووسینە با بۆنمـوونە دوو هـاوڕێی ئەم سەردەمەش بێنینە پێش چاومان ، کە ویستویانە نامەی وێنەیی بۆ یەك بنووسن . یەکێکیان وێنەی مانگ لە تاریکاییدا دەکا و ئنجا ڕۆژ لە کەلەوە ، بەدوا ئەمەشدا وێنەی ئەسپێك لەسەر ئاوی سەرچنار . . . دووەمیان ـ وێنەی ڕۆژ دەکا لە کەلەوە ئنجا مانگ لە تاریکاییدا ، بەدوا ئەمەدا وێنەی پیاوێك لەسـەر مێزێـك و بوتـڵێ لەبەردەمیدا . وابزانم نووسراوی یەکەم دەڵێ : «سبەینێ بەیانی بە سواری ئەسپ دەچم بۆ سەرچنار» . دووەمیشیان دەڵێ : «ئەمڕۆ ئێوارە دەخۆمەوە» .

لە بەراوردکردنی ئەو نموونانەوە ، دیارە کـە لە نـووسینی وێنەیی دا هـەموو ئەوەی لە بەرچاوە واتای ڕاستەوخۆ دەگەیەنێ ، بەڵام هەرچی واتای گشتی یـەتی بەگران لێك دەدرێتەوە .

نووسینی وێنەیی پێوەندی بە ئەلفوبێوە نییە ـ واتە بریتی نییە لە کۆکردنەوەی نیشانەی دیاری کراو و هەروەها بە فێرکردنی خوێندنەوەشەوە بەند نییە ، چـونکە مەبەست ، گەیاندنی واتای پێویستی یەکە . . . بێ پێوەنـدێتی نووسینی وێنـەیی بە زمانێکی دیاری کراوەوە ، بووەتە هۆی ئەوەی بتوانێ ببێ بە وەسیلەیەکی لەبار بۆ لە یەکتر گەیشتنی هۆزی خاوەن زمانی جیاواز .

هەرچەندە ئێستا نووسینی وێنەیی وەك چەشنێکی سەرەکی نووسین لە کاردا نەماوە ، بەڵام لە هەندێ بواردا بەکاردێنرێ ، بەوێنە : لە جاغانە و پڕوپاگنـدە و . . دا .

لەگەڵ پێشکەوتنی ئادەمیزاد و گەشەکردنی بیر و هەستیدا ، پێویستی وا هاتە ناوەوە کە ئیتر نووسینی وێنەیی نەتوانێ ئەو ئەرکە بەجێ بێنێ و ئەو دەمە نووسینی ئیدیۆگرافی (Ideography)[11] ـ واتە (نووسینی بیر) هاتە مەیدان . لەم جۆرە نووسینانەدا نیشانەکان واتای ڕاستەوخۆی دیاردەکان نادەن ، بەڵکو ئەو بیرە ڕادەگەیەنن کە لە مێشکی ئادەمیزاددا پەیدا دەبێ .

پەیدابوونی نووسینی ئیدیۆگرافی پێوەندی بە پێویستی دەربرینی ئەو شتانەوە هەیە کە نەدەتوانرا لە ڕێگەی وێنەوە نیشان بدرێن . بەوێنە ، بۆ گەیاندنی واتای (بینین) ، وێنەی ئەو ئەندامەی لەش (واتە ـ چاو) دەکرا کە شت بەهۆیەوە دەبینرێ . بەم جۆرە لە هەنگاوی یەکەمی ئیدیۆگرافی دا هەمان ڕێگەی پیکتۆگرافی ـ واتە ڕێگەی وێنە ـ دەگیرا ، بەڵام لە گەیاندنی واتادا جیاوازی هەبوو : لە نووسینی پیکتۆگرافی دا وێنەی چاو واتای « چاو » ی دەگەیاند ، کەچی لە ئیدیۆگرافی دا مانای « بینین » ی دەدا ـ واتە لە ئیدیۆگرافی دا وێنە واتای ئەرك یاخود ئەنجامی بەکارهێنانی ئەو شتەی مەبەست بوو . هەر بەم شێوەیە دەکرێ واتای « دۆستایەتی » بە هۆی وێنەکردنی دوو دەستەوە دەربرێ ؛ یاخود دەشێ مانای «دوژمنایەتی» بە وێنەی دوو چەنگ بگەیەنرێ کە لە شێوەی خاچێکدا لێك درابن . . هتد .

لەم بارانەدا وێنە لە شێوەی مەجازدا مانا دەگەیەنێ . ئەم واتا مەجازییانەی وێنە زۆر لە ئیستیعارەی هەندێ وشە دەچن . بۆنموونە (زمان ـ لسان) ، (زمان ـ لغة) . . . هتد . لەم قۆناغەی پێشکەوتنی نووسیندا ، یەك وێنە وەك چۆن واتای ڕاستەوخۆ دەگەیەنێ ، هەروەها مانای مەجازیش نیشان‌دەدا ، جا بۆیە خوێندنەوەی ئەو جۆرە نووسینانە ئاسان نییە . پێویستی خێرایی نووسین و پێویستی دەربرینی تێکستی ئاڵۆز چ لە ڕووی ناوەرۆك و چ لە ڕووی ڕوخسارەوە بوونە هۆی ئەوەی ڕێگەی دەربرینی مەبەست بە هۆی وێنەوە بگۆڕێت بە نیشانەی مەرجی ـ هیرۆگلیف (Hieroglyph)[12] .

---

(١١) ئیدیۆگرافی ـ Ideography لە دوو وشەی (idea ـ بیر) و (grapho ـ دەنووسم) ی یۆنانی‌یەوە سازبووە .

(١٢) هیرۆگلیف لە وشەی (Hieroglyphoi) ی یۆنانییەوە وەرگیراوە ، کە بە واتای (نووسینە پیرۆزەکان) دێت . دەقی تەواویشی (نەقشی ڕەبەنەکان) ە . بۆیەش بە (نەقشی =

پێشکەوتنی تەکنیکی نووسین ـ واتە دۆزینەوەی کەرەستەی لەبارتری لەسەر نووسین و ئامرازی نووسین ـ بووە هۆی ئەوەی لەبریتی بەرد و پارچەدار و توێکڵەدار ، ئامرازی تایبەتی بەکاربهێنرێ . لە میسر لە قامیش تەبەقی گەورەی لوول کراویان هێنایە بەرهەم ؛ لە ولاتانی تر پێستی هەمەچەشنەیان خۆش دەکرد ؛ سەرئەنجامیش لە چین ، کاغەز دروست کرا . لەبریتی ئامرازی نەقش و نەقاری ئامرازی نووسین پەیدا بوو و توانرا بە مەرەکەبی چینی و بە فڵچە زۆر خێراتر نیگاری نیشانەکان بکێشرێن .

نووسینی هیرۆگلیفی لەوەدا لەبارە کە نیشانەکانی دەتوانن بە ڕوخساریش و ناوەرۆکیش نیشان بیێکن . . ئاشکرایە بۆ ئەوەی شت بنووسرێ و بخوێندرێتەوە ، پێویست بە کۆمەڵێك نیشانەی دیاری کراو هەیە و ئەمە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی مەسەلەی ئەلفوێ . بەڵام نیشانەکانی هیرۆگلیفی ناتوانن بە باشی ئەم ئەرکە بەجێ بێنن ، چونکە هێندە زۆرن لەبیرنەکردنیان زەحمەتە .

هەرچەندە نیشانەکانی نووسینی هیرۆگلیف وشە لە ڕووی فۆنەتیك و ڕێزمانەوە سازناکەن ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو جۆرە نووسینێکی هیرۆگلیفیدا ، ڕیشەی نیشانەی دەنگ هەیە ، جا بۆیە لە لێکدانەوەی نووسینی ئەو دەمەدا مەینەتێکی نوێ پەیدا دەبێ ، چونکە هەر ئەو نیگارە ئیدیۆگرافی یە لە هەمان کاتدا دیاردەیەکی فۆنەتیکی یش (برگە ، دەنگ) نیشان دەدات .

بەهۆی کۆمەڵێك ڕووداوی مێژوویەوە ، لە ولاتانی ڕۆژهەڵاتی نێزیکدا دەورێکی نوێ لە پێکشەوتنی نووسیندا سەری هەڵدا[13] .

لەم دەورەی پێشکەوتنی نووسیندا شتی سەرەکی ئەوەبوو ، کە دەبوو نووسین بۆ ئەوانەی بەکاری دێنن پتر لەبار بێ . بەهۆی پێشکەوتنی بێوچانی ئادەمیزاد و زیادبوونی پێویستی یەکانی و گەشەکردنی دەریاوانی و بازرگانی و هاتوچۆ و پێوەندی نێو

= ڕەبەنەکان) ناونراوە ، چونکە ڕەبەنەکان : ١ ـ نەیان دەنووسی ، بەڵکو لەسەر ئێسقان و شتی تر نەقشیان دەکرد ؛ ٢ ـ ئەوان نهێنیەکانی نووسینی هیرۆگلیفیان دەزانی .

(١٣) سەرچاوەی ناوبراو ، ئی . ئا . ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتایێکی زمانناسی ، ل ٣٥٧ .

دەوڵەتان . . ەوە ژمارەی ئەو کەسانەی بەکاریان دەهێنا زۆر پەرەی سەند[14] .

بەم بۆنەیەوە بۆ ئاسانکردنی نووسین هەوڵی جۆربەجۆر درا . ئەو هەولانە ، لەرووی پێوندی زمان بە نووسینەوە جیاواز بون :

**یەکەم ـ لە رووی پێوەندی وشەوە .**

نووسینی چینی بەمڕێگەیەدا ڕۆیشت ، بەوێنە بۆ ڕاگەیاندنی واتای « فرمێسك » پێویست بوو دوو نیشانەی (چاو) و (ئاو) لەیەك بدرێن ؛ بۆ نیشاندانی مانای « وەڕین » دەبوو دوو نیگاری (سەگ) و (لمۆز) بکێشرێن ؛ بۆ دەربرینی مەبەستی « قیژاندن » دوو وێنەی (منداڵ) و (دەم) بکرێن ؛ بۆ «تەماشاکردن» (مرۆڤ و درەخت) ؛ بۆ « ڕووناکی » (ڕۆژ و مانگ) ؛ بۆ « دارستان » (دوو درەخت) . . . بێگومان لەبەر زۆریی ئەو هیرۆگلیفانە و هەروەها هەندێ جاریش باش ڕوون نەبوونی مانایان کاتێکی زۆر و ماندووبوونێکی زۆر پێویست بوو .

**دووەم ـ لە رووی ڕێزمانەوە .**

ڕێگەیەکی دی کورتکردنەوە و ئاسانکردنی نووسینی ئیدیۆگرافی بە مەسەلەی ڕێزمانەوە بەندە . ئەویش ئەوەیە کە ڕەگی وشە دەهێلرایەوە . هەرچی ئەو وشانەشە کە لەو ڕەگانەوە ڕۆدەنران نیگاری تەواوکەریان لەگەڵ دادەنرا ، کە واتای ئافیکس بگەیەنن . بەلام ئەم ڕێبازە تەنیا بۆ ئەو زمانانە دەگونجا کە وشەیان تێدا بەسەر ڕەگ و ئافیکسدا دابەش دەکرا . لەگەڵ ئەوەشدا ئەم شێوازە دەوری لە کورتکردنەوە و ئاسانکردنی نووسیندا زۆر کەم بوو ، چونکە ژمارەی ڕەگ بێسنوورە و هەر ڕەگێکیش پێویستی بە نیگاری سەربەخۆ هەبوو .

**سێیەم ـ لە رووی فۆنەتیکەوە .**

ڕێگەی هەرە لەبار و گونجاو نووسینی فۆنەتیکی بوو ، چونکە ئەمە قالبێکی وای دا بە نووسین کە نەك تەنیا لە رووی پێکهاتنی ڕێزمانییەوە ئاوێنەی زمان بێ ، بەلکو لە رووی قەوارەی فۆنەتیکیشەوە وشەی تێدا ببینرێ .

---

(١٤) ف . ئا . ئیسترین ، گەشەکردنی نووسین ، چاپی یەکەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ ، ل ٦٢ ـ ٦٣ .

کاتی خۆی میسری یەکان و بابلی یەکان هەوڵی ئەوەیان دا نووسین بخەنە سەر ڕێی فۆنەتیکی . بابلی یەکان وشە ناسادەکانیان کەرت دەکرد و بەم پێیە لەو دەمەدا هیرۆگلیف وای لێ هات کە بە برگە (المقطع ـ Syllable) مانا بدات . بەم جۆرە هەنگاوی یەکەمی پێشکەوتنی نووسینی فۆنەتیکی نرا .

باشترین نموونەی شێوەی نووسینی برگەیی ، نووسینی هیندیی کۆنە ، کە تێیدا هەر نیگارێك ، وەك دەستوور نیشانەی کۆنسۆنانت لەگەڵ بزوێنی (ا) ی دەدا ، واتە برگەی (دا ، را ، شا ، زا . . . هتد) ؛ بۆ ئەوەی بزوێنێکی تر بخوێندرێتەوە نیگارەکە دەگۆڕرا ؛ ئەگەر بویسترایە تەنیا کۆنسۆنانتەکە بخوێندرێتەوە ، ئەوە نیشانەی « قەدەغە » ی لەگەڵ دادەنرا ؛ بۆ کۆبوونەوەی چەند کۆنسۆنانتێکیش لە برگەیەکدا نیشانەی « پێکەوە بەستن » بەکاردەهێنرا[١٥]

نووسینی برگەیی کە نیشانەکانی هێندەی برگەکانن ، ژمارەیان ئێجگار زۆر نییە و بۆیە ئەم شێوە نووسینە تا ڕادەیەك ئاسانە .

هەنگاوێکی تر لە پێشکەوتنی نووسینی فۆنەتیکیدا لە نووسینی کۆنی جوولەکە و فینیقی یەکاندا نرا ، کە وا کۆنسۆنانتەکانی ڕەگی وشەیان تێدا بە پیت دەردەبررا و ئەو بزوێنانەش کە فۆرمی ڕێزمانی بەجێ دێنن بە نیشانەی تایبەتی جیا دەکرانەوە (لە عیبریدا بە « شوا » و لە عەرەبیدا بە «حەرەکات» دەردەبرران[١٦] ) .

ئەم جۆرە نووسینانەش لە زانستی زماندا بە نووسینی «کۆنسونانتی» ناسراون[١٧] .

دوا هەنگاوی نووسینی فۆنەتیکی لەلایەن یۆنانەکانەوە نرا ، ئەویش ئەوەبوو ڕێبازی بەکارهێنانی ئەلفوبێیان لە فینیقی یەکان وەرگرت . بەڵام ئەمان پیتیان هەر بۆ دەنگە کۆنسۆنانتەکان دانەنا ، بەڵکو بۆ بزوێنەکانیشیان سازکرد ، چونکە وەك ئاشکرایە ، لە زمانی یۆنانیدا ، لە پێکهاتنی ڕەگ و ئافیکسدا تەنیا کۆنسۆنانت بەشداری ناکات ، بەڵکو بزوێنیش هەیە . یۆنانەکان هاتن بۆ بەشێك لە دەنگە بزوێنەکانی زمانەکەیان وێنەی ئەو دەنگە کۆنسۆنانتە فینیقی یانەیان دانا ، کە لە یۆنانیدا نین .

---

(١٥) سەرچاوەی ناوبراو ، ئی . ئا . ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتایێکی زمانناسی ، ل ٣٥٩ .

(١٦) هەمان سەرچاوە ، ل ٣٦٠ .

(١٧) ئۆ . س . ئاخمانۆڤا ، فەرهەنگی زاراوەکانی زمان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٣٢٤ .

بەم چەشنە ئەلفوبێی یۆنانی بەو دەستکاری کردنەوە ، یەکەم ئەلفوبێ‌یە کە لەسەر بناغەی وێنەی دەنگ سازکرابێ و لە دواییشدا بووە بە بناغەی دانانی ئەلفوبێی لاتینی و سلاڤی و گەلێکی تر[18] . پێویستە پەنجە بۆ ئەوەش رابکێشین ، کە وەنەبێ پیتەکانی ئەم جۆرە ئەلفوبێ‌یانە بە شێوەیەکی ساکار هەر وێنەی دەنگ بن ، بەڵکو بەشێوەیەکی سەرەکی وێنەی فۆنیمن .

لەسەر بناغەی ئەلفوبێی سامی کۆن ، نووسینی ئارامی پەیدابوو ، کە ئەمیش لە رۆژهەڵاتەوە تا لای ئوگور و مەغۆل . . . گەیشت و لە خوارووشەوە بۆ لای عەرەب و میللەتانی کەنار ئۆقیانووسی ئەتڵەس پەلی هاویشت.

هەموو ئەو میللەتانەی هاتنە سەر ئاینی ئیسلام : فارس ، تورك ، کورد ، تەتەر ، ئازەر . . ئەلفوبێی عەرەبییان وەرگرت .

رۆمانەکانیش پاش شەن و کەو کردنی ئەلفوبێی یۆنانی ، توانییان ئەلفوبێ‌یەکی باش و لەبار بۆ نووسینی زمانی خۆیان سازبکەن و ئنجا بە هەموو میللەتانی گروپی رۆمانە ـ جەرمەنی‌یەکان : (فەرەنسەیی و ئیسپانیایی و ئیتالیایی و پرتوگالی و ئەڵەمانی و ئینگلیزی و سویدی و نەرویجی و دانیمارکی . . . ) ی بدەن . هەروەها (فینلەندی و مەجەری و ئیستۆنی و لاتیشی و لیتۆڤی و ئەلبانی و هەندێ میللەتی سلەڤیانی ـ پۆڵەندەیی و چیکی و سلۆڤاکی) یش ئەلفوبێی لاتینی‌یان وەرگرت[19] .

ساڵی ١٩٢٩ تورکەکان هاتنە سەر بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی . لە یەکێتی سۆڤێتیشدا ئەو میللەتانەی بە ئەلفوبێی عەرەبی دەیاننووسی ، وەك تورك و ئێرانییەکان و هەندێ لە میللەتانی قەفقاس لە ساڵانی بیستدا نووسینیان بوو بە لاتینی .

ئەلفوبێ‌یەکی زۆر دێرین ، کە بەتەواوی چۆنیەتی پەیدابوونی ئاشکرا نییە ، ئەو نووسینەیە کە ئەرمەن و جۆرجی بەکاری‌دێنن . . لە سەدەی

(١٨) سەرچاوەی ناوبراو ، ڤ . ئا . ئیسترین ، گەشەکردنی نووسین ، ل ٩٣ .

(١٩) سەرچاوەی ناوبراو ، ئی . ئا ، ریفۆرماتسکی ، سەرەتایێکی زمانناسی ، ل ٣٦٢ ـ ٣٦٣ .

چوارەمی زاینیشدا قەشە (ڤۆلڤێل) ئەلفوبێیەکی بۆ ئەڵەمانەکان سازکرد ، کە لەسەر بناغەی نووسینی یۆنانی و ڕوونی پێکی هێنابوو .

ئەحمەدی کوڕی ئەبوبەکری کوڕی وەحشییەی نەبەطی لە کتێبی « شوق المستهام فی معرفة رموز الاقلام » (٢٤١ ك) دا ، باسی ئەلفوبێیەکی کۆنی کوردی کردووە ، کە لەپێش زایینەوە هەبووەو گەلێ کتێبی پێ نووسراوە[٢٠] .

مامۆستا مەلا کاکە حەمەی حاجی مەلا سەیفوڵڵا ئەلفوبێیەکی نوێی بۆ نووسینی کوردی داهێنابوو ، کە لەسەر بناغەی ژمارە و پیت سازی کردبوو[٢١] .

زانای بەناوبانگ و ناسراوی کورد ـ شێخ محەمەدی مەردۆخ لە پێشەکی ئەو فەرهەنگە کوردی ـ فارسی ـ عەرەبییەیدا ، کە ساڵی ١٩٥٦ لە تاران چاپی کردووە ئەلفوبێیەکی تایبەتی بۆ نووسینی کوردی سازکردووە[٢٢] . ئەو نیگارانەی ئەو بۆ دەنگەکانی زمانی کوردی دایناون ، شێوەیان لە نووسینی کۆن دەچێ و بەکارهێنانیان گرانە . هەروەها ئەوەی جێگەی سەرنج بێ ، ئەوەیە دانەری ئەو ڕێنووسە خۆی فەرهەنگەکەی بەو ئەلفوبێیە نەنووسیوە .

مامۆستا محەمەد عەلی کوردستانی ، کە یەکێکە لە کوردەکانی ئازربایجانی سۆڤێت ، ئەلفوبێیەکی جیهانی داناوە . ئەو ئەلفوبێیە لە گرەوی نێودەوڵەتاندا یەکەم دەرچووە و ناوی ئەلفوبێی « هاوڕێیەتی گەلان » ی لێ نراوە[٢٣] .

---

(٢٠) دەربارەی ئەو ئەلفوبێیە ، بڕوانە :

أ ـ گۆڤاری «زاری کرمانجی» ، ساڵی سێیەم ، ژ ١٨ ، ڕەواندز ، ١٩٢٩ ، ل ٢ ـ ٨ .

ب ـ گۆڤاری «هەتاو» ، ساڵی یەکەم ، ژ ١ ، هەولێر ، ١٩٥٤ ، ل ١٨ ـ ١٩ .

. . . . . و هەندێکی تر .

(٢١) سەبارەت بە ئەلفوبێی ناوبراو ، بڕوانە :

أ ـ مستەفا نەریمان ، مامۆستای نەمر ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٦٦ ـ ٦٧ .

ب ـ مستەفا نەریمان ، ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ڕیشەوە ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ٥٢ .

(٢٢) شێخ محەمەدی مەردۆخ ، فەرهەنگی « مەردۆخ » ، تاران ، ١٩٥٦ ، ب ١ ، ل ٥ .

(٢٣) بۆ زانیاری لەبارەی ئەو ئەلفوبێیەوە ، بڕوانە : محمد الملا عبدالكريم ، عالم كردی من الاتحاد السوفياتی يؤلف « ابجدية لصداقة الشعوب » ، جريدة « التآخی » ، العدد ، ١٢٦١ ، ١٨ شباط ١٩٧٣ ، ص ٨ .

نووسینی ئەمرۆ کەڵك لە هەموو ئەو شێوازانەی نووسین وەردەگرێ کە بەدرێژایی مێژوو بەکارهاتوون .

پیکتۆگرافی لە هەندێ بواردا کەڵکی لێ وەردەگیرێ ، بەنموونە بۆ یاریدەدانی کەسانی نەخوێندەوار یان کۆلکە خوێندەوار ، وەك وێنەی پیاو یان ژن لەسەر دەرگای ئاودەست ؛ لە کتێبی پۆلە سەرەتاییەکاندا کە منداڵ بەرلەوەی وشەکە بخوێنێتەوە تەماشای وێنەکەی دەکات . . . یاخود وێنەی سەر جانتانە و کەبابخانە و چێشتخانە و زەنگی بەر دەرگای میوانخانە بۆ یەکێك لە ولاتێکی بێگانە بێ و زمانی ئەو ولاتە نەزانێ .

ئیدیۆگرافی (وێنەیی و هیرۆگلیفی) لە گەلێ بواردا بەکاردێنرێ ، بەوێنە لە مەودای هاتوچۆدا وێنەی (خاچ) نیشانەی لێکدانی دوو شەقامە . . . لە پزیشکیدا وێنەی مارێك و پیاڵەیەك ژار رەمزی پزیشکییە لە دەرمانخانە . . . لە کارەبادا نیگاری کەللەسەر و لوولاق نیشانەی قووەت زۆری و مەترسی مەرگە . . . وێنەی ژمارەکان ، نیشانەی هەمەچەشنەی کیمیا و فیزیا و ماتماتیك و جەبر . . . دەچنە ریزی هیرۆگلیفەوە .

پێویستی زانست بە ئیدیۆگرافی لەوەدایە : ١ ـ بناغەی شت بەتەواوی روون بکاتەوە ، بەوێنە کە لە کیمیادا $H_2O$ کراوە بە نیشانەی ئاو ، مەبەست ئەوەیە ئاو بە ساکاری نیشان نەدرێ ، بەڵکو مانا کیمیاوییەکەی دەرببررێ ؛ ٢ ـ کورت و پوخت مەبەست دەربرین ، بۆنموونە ئەگەر لەبریتی ئەو هیرۆگلیفەی کراوەتە رەمزی ئاو ، بە نووسین بنووسرێ زۆری دەوێ ؛ ٣ ـ نووسین قاڵبێکی جیهانیی پێ بدرێ ، بەوێنە لەبەرئەوەی هیرۆگلیف بە زمانێکی دیاری کراوەوە بەند نییە ، پزیشك و ئەندازیار و . . . دەتوانن کەڵك لە گشت ئەدەبیاتێکی مەیدانی زانستەکەی خۆیان وەربگرن بە هەر زمانێك نووسرابێ[٢٤] .

هەرچەندە نووسینی سەرەکی و باوی ئەمرۆ نووسینی فۆنەتیکییە ، کە لەسەر بناغەی وێنەی دەنگەکان سازبووە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ شێوازی دی تێکەڵ بووە . بەوێنە لە نووسینی رووسیدا لەگەڵ بەکارهێنانی پیت وەك نیشانەی فۆنێم ، هەروەها بەکارهێنانی پیت وەك نیشانەی برگەش لەناواندایە .

---

(٢٤) هەمان سەرچاوە ، ل ٣٦٦ ـ ٣٦٧ .

باشترین ئەلفوبێ کە لەسەر بناغەی فۆنەتیك دانرابێ ، ئەوەیە کە ژمارەی پیتەکانی هێندەی ژمارەی فۆنیمەکانی ئەو زمانە بێ[25] .

لەبەر ئەوەی نووسین بە دەورێکی مێژوویی درێژدا تێپەڕیوە و گەلێك پاشماوەی کۆنی تێدا ماوە ، ئەلفوبێی کامڵ نییە . ئەلفوبێی هەرە ناسراو و پتر بەکارهێنراو و لەبار ئەلفوبێی لاتینی یە . هەرچەندە ئەم ئەلفوبێیە لەگەڵ فۆنەتیکی زمانی لاتینیدا باش دەگونجا ، بەڵام پڕ بە پڕی زمانە ئەوروپاییەکانی دی نەبوو ، چونکە ئەو (٢٤) پیتەی بۆ زمانی لاتینی دانرابوون[26] بەشی ئەو زمانە ئەوروپایی یە نوێیانەی نەدەکرد کە پێویستیان بە (٣٦ ـ ٤٠) پیت بوو . بە پێنج پیتی بزوێنی (a ,e ,o ,u ,i) و دواتریش (٧) نەدەکرا ئەو هەموو بزوێنانەی زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی و زمانە ئەوروپاییەکانی دیدا هەن دەربپڕین . یاخود ژمارەیەك دەنگی کۆنسونانتی ئەوتۆ لە هەندێ زمانی ئەوروپاییدا هەن کە لە لاتینیدا نەبوون و پێویستیان بە نیشانە بوو . . . جا بۆ پڕکردنەوەی ئەو ناتەواوییانە ـ واتە لە دانانی پیت بۆ ئەو دەنگانەی لە لاتینیدا نەبوون ـ هەوڵی هەمەجۆر درا ، وەك : دانانی چوکلە لە سەر یان لە ژێر ؛ گەیاندنەوەیەکی هەردوو سەری پیتێك ؛ لێکدانی دوو پیت . . . هتد .

ئەگەر ئەلفوبێ لەسەر بناغەی یەکسانی لەنێوان ژمارەی پیت و ژمارەی فۆنیمدا دابمەزرایە ، ئەوسا کێشەی ڕێنووس نیوەی نەدەما . لەبەرئەوەی ئەلفوبێی کامڵ نییە و تێپەڕینی بە دەوری مێژوویی درێژدا کێشەی بۆ سازکردووە ، بۆیە ڕێنووس ـ (Orthographia) [27] پێویستی بە دەستوورە . هەرچەندە ڕێنووسی هەر زمانێك بگری بنەمای جۆربەجۆری تێدایە و چەند بنەمایەکیشی بوونەتە سەرەکی ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە سازبوونی ڕێنووسدا بنەمای گشتی هەن و پێویستە پەیڕەوی بکرێن .

---

(٢٥) هەمان سەرچاوە ، ل ٣٦٧ .

(٢٦) دواتر بوو بە (٢٦) پیت .

(٢٧) (Orthographia) لە دوو وشەی (orthos ـ ڕاست) و (grapho ـ دەنووسم) ەوە پەیدابووە ، کە لە کوردیدا واتای (ڕاست نووسی) دەگرێتەوە .

# کورتەیەکی مێژووی نووسینی کوردی[1]
# بە ئەلفوبێی عەرەبی

ئەو نووسەرانەی دەربارەی ئەوە نووسیویانە کە لە کەیەوە کورد دەستی بە بەکارهێنانی ئەلفوبێی عەرەبی کردووە ، بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی زانستییان بە دەستەوە بێ ، بێ سێ ودوو مەسەلەکە دەگەڕێننەوە بۆ سەردەمی پەیدابوونی ئیسلام لە کوردستاندا . بەوێنە مامۆستا عەلائەدین سەجادی دوای باسێکی دەوری ماد و

(١) ئەوەی دەربارەی مێژووی نووسینی کوردی بڵاوکراپێتەوە ، تەنیا چەند لاپەڕەیەکی پڕ کەم و کورتی و هەڵەی د . نەبەز و نامیلکەیەکی لەرادەبەدەر سادە و ساکاری مامۆستا حامید فەرەج و کتێبێکی مام ناوەندیی مامۆستا مستەفا نەریمانە .

د . نەبەز لە لاپەڕە (٧٨ ـ ٩٠)ی کتێبی (زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦)دا بە کورتی لەو ئەلفوبێیانە دواوە کە کورد بەکاریان دێنێ . ئەوەی پێوەندی بە باسەکەی ئێمەوەیە ، ئەو پێنج شەش لاپەڕەیەیە کە لە مێژووی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی دواوە تێیدا . سەرنج ڕاکێش هەر ئەوە نییە کە نووسەر زۆر بە ساکاری لەم کێشەیە دواوە ، بەڵکو گەلێ هەڵە و زانیاریی ناڕاستی دوور لە زانستیشی تێدایە . . . لێرەدا درێژەی پێ نادەین و لە چەند پەراوێزێکی لێرە بەدواوە هەندێ باسی ئەو بەشە هەڵدەسەنگێنین .

هەرچی ئەوەی مامۆستا حامید فەرەجە (ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا ، بەغدا ، ١٩٧٦) کە نامیلکەیەکی (٤٢) لاپەڕەییە و لەسەر ئەرکی کۆڕی زانیاری کورد چاپ کراوە ، بریتییە لە پێشاندانێکی سادەی ئێجگار کورتی کەمێك لەو نووسراوانەی پێوەندیان بە ڕێنووسی کوردییەوە هەیە . . . ناتەواوی و هەڵەی ئەم بەرهەمە بەرادەیەکە ، کە هەر لایەکی بگری ڕەخنەی لێ هەڵدەستێ . جا لەبەرئەوەی چەندین لاپەڕەی باسەکەمان بەوەوە نەبەینە سەر و هەروەها لەبەرئەوەش کە مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم زانستییانە زوربەی کەم و کورتی ئەو نامیلکەیەی خستۆتە پێش چاو (« ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا » لەبەر ڕووناکیی ڕەخنەدا ، گۆڤاری «ڕۆژی کوردستان» ، ژ ٤٣ ـ ٤٤ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٥٣ ـ ٥٦) ، خۆمانی پێوە خەریك ناکەین .

بەرهەمەکەی مامۆستا مستەفا نەریمانیش « ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ریشەوە » (بەغدا ، ١٩٨١) ، کە کتێبێکی (٦٨) لاپەڕەییە و لەسەر ئەرکی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی =

هەخامەنشی و ساسانی و هاتنی ئیسلام دەڵێ : «داهاتنی ئەم پیتانە بەرانبەر بە زمانی کوردی مێژوویان ئەگەڕێتەوە بۆ (١٢٠٠ تا ١٢٥٠) ساڵ پێش ئەم ڕۆژە»[٢] . بەڵێ کە ئیسلام لە ناوچەی کوردنشیندا بنجی خۆی داکوتا ، دەبێ هەوڵی بڵاوبوونەوەی ئەلفوبێکەی خۆیشی دابێ ، بەلاّم لە چ دەورێکەوە دەستی بەمەی دووەمیان کردووە و کەی کورد کەوتۆتە سەر ئەوەی بەو پیتانە بنووسێ ، لەم بارەیەوە هیچ شتێکی ئاشکرا نییە و لە بەڵگەی خەیاڵی پتر هیچی دیمان بەدەستەوە نییە . هەرچی بەڵگەی زانستییە تەنیا ئەو دەستنووسە کوردییانەن کە ماونەتەوە و سەردەمی نووسینیان بۆ پێش چەند سەدەیەك دەگەڕێتەوە . جا بۆیە ئێمە هەرچییەك دەربارەی مێژووی زووی ئەو کارە بڵێین هەر قسەی ڕووتە و نرخی زانستی نییە . . .

لەبارەی هەمان باسەوە . د . نەبەزیش نووسیوێتی : « ئاشکرایە ، پاش ئەوەی ئاینی ئیسلام لە کوردستاندا بنجی خۆی داکوتا ، کوردەکانیش وەك فارسەکان دەستیان کرد بە بەکارهێنانی ئەلفوبێی عەرەبی بۆ نووسینی زمانەکەیان »[٣] . نازانم خاوەنی ئەم وشانە بۆئەوەی بۆپێ سەلماندنی ئەو رایەی تاکە بەڵگەیەکی هێنابێتەوە ، چۆن وا ئەوەی لێ « ئاشکرایە » . . .

هەرچی نووسەری کتێبی « ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ریشەوە » یشە[٤] وای دەربڕیوە کە گەلی کورد « لەوساوە کە ئاینی پیرۆزی ئیسلامی قبووڵ کردووە » ، نەك هەر « پیتی عەرەبی لە نووسیندا بەکارهێناوە » ، بەڵکو کتێبیشی « بێ

---

کوردی چاپ کراوە ، ئەگەرچی هەندێ زانیاریی وای تێدایە کە تائێستا باسیان نەکراوە ، بەلاّم هەڵە و نادروستی ؛ ناتەواوی و کەم وکورتی ؛ سادەیی و ساکار . . . ی ئەوەندە زۆرە کە بەڕاستی بەرلەوەی بیخوێنمەوە چاوەڕوانی ئەوەم لێ نەدەکرد . . . لە چەند پەراوێزێکی لێرە بەدواوە ڕووی باش و خراپی ئەو کارە دەخەمە پێش چاو .

(٢) عەلائەدین سەجادی ، دانانی نیشانەکانی پیتی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ١٢ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١٥ .

(٣) د. نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ ، ل ٧٨ .

(٤) مستەفا نەریمان ، ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ریشەوە ، بەغدا ، ١٩٨١ .

چاپ کردووه »[٥] . . مامۆستا نەریمان لەم بەرهەمەی[٦] و لە کتێبی « بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی » دا[٧] دیاری کردووە کە یەکەم کتێب سەرتاپـای کوردی بێت و بـە ئەرکی کورد چاپ کرابێت کتێبی « ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد » ی ئـەمین فـەیزی بەگە ، کە ساڵی ١٩٢٠ لە ئەستەموول چاپی کردووە . جا کە ئەمەنی یەکەم کتێبی چاپکراوی کوردی لەلایەن کوردەوە شەست وپێنج ساڵێك بێت کەچی کوردیش پتر لە هەزار و سێ سەد ساڵ لەمەوبەرەوە ئاینی ئیسلامی وەرگرتبێ ، ئەوە بێ گومان نێوان واقیع و ئەو جۆرە خەملاندنە ئاسمان و ڕێسمانە .

من نامەوێ هیچ خەیاڵ و بیرێکی بێبەڵگە لەمڕووەوە نیشان بدەم ، بۆیە جـارێ ـ واتە تـا ئەو دەمـەی شتێکی ماددیم دەستدەکـەوێ ـ واز لە مێـژووی شاراوەی ئەو کێشەیە دێنم و لەو دەمەوە دەستپێدەکەم ، کە بۆ پێسەلماندنی وتەکانم سەرچاوەی بەڵگە چنگەدەکەوێ .

کۆنترین دەستنووس و چاپکراوی کوردی ، ئەوە دەگەیەنن کە نووسەرانی کورد ، وەك فارسەکان بۆ هەندێك لەو دەنگە کۆنسۆنانتانەی لە زمانی عەرەبیـدا نەبوون و لە ئەلفوبێیاندا نیگاریان دەستنەکەوتووە ، بە دانانی سێ خاڵ وەك : (پ ، چ ، ژ ، ڤ . . .) یاخود دانانی خەتێك ، وەك (گ)[٨] چاریان کردووە . بـەوێنە ئـەو دەستنووسـەی کە سـاڵی ١٢٧٤ ی ك / ١٨٥٨ ـ ١٨٥٩ ی ز مـەلا مەحموودی بایەزیدی بە ناوی « عادات و رسومات نامەی اکرادیە » ەوە نووسیوێتی[٩]

---

(٥) هەمان سەرچاوە ، ل ٦ .

(٦) هەمان سەرچاوە ، ل ١٩ .

(٧) مستەفا سەیید ئەحمەد ، بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٤ .

(٨) لە هەندێ دەستنووس و چاپەمەنی کوردیدا بۆ نیشاندانی دەنگی (گ) لەسەر پیتی کاف سێ خاڵ دانراوە ، بەوێنە بڕوانە : فەرهەنگی (الهدیة الحمیدیة في اللغة الکردیة) ، کە یوسف ضیاء الدین پاشای خالدی ساڵی ١٣١٠ك / ١٨٩٣ز لەئەستەموول چاپی کـردووە : (ل ١٧٦ ، ستوون ١ ، دێڕ ١١ ـ «گا») ؛ (ل ١٨٣ ، ستوون ٢ ، دێڕ ٨ ـ «گرتن») ؛ (ل ١٩٣ ، ستوون ١ ، دێڕ ٢١٤ ـ «گل») . . .

(٩) م . ب . ڕودێنکۆ ، «عادات ورسومات نامەی اکرادیە»ی مەلا مەحموودی بایـەزیدی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ .

تێکرای ئەو پیتە کۆنسۆنانتە کوردییانەی تێدایە کە لە ئەلفوبێی عەرەبیدا نین . بۆغوونە ، بڕوانە : (ل ١٩٦ ، د[10] ٤ - « پوشمانی ») ؛ (ل ١٩٦ ، د ١٤ - « پردە ») ؛ (ل ٢٠١ ، د٨ - « پسماميا ») . . . (ل ١٩٦ ، د ٢ - « کچی ») ؛ (ل ١٩٧ ، د ١٣ - « بچکان ») ؛ (ل ١٩٨ ، د ١٤ - « بچە ») . . . (ل ١٩٦ ، د ٣ - « بیژن ») ؛ (ل ١٩٧ ، د ٧ - « بکوژین ») ؛ (ل ٢٠٢ ، د٥ - « ژ ») . . . (ل ٢٠١ ، د ٢ - « مروڤی ») ؛ (ل ٢٠٢ ، د ١١ - « ناڤی ») ، (ل ٢٠٢ ، د ٩ - «ڤان ») . . . (ل ١٩٥ ، د ٢ - « دگل ») ؛ (ل ٢٠١ ، د ٩ - « اگر ») ؛ (ل ٢٠١ ، د ٤ - « گوتنە ») . . . هتد یاخود ڕۆژنامەی « کوردستان » کە یەکەم ڕۆژنامەی کوردییە[11] بە هەمان ڕێنووس چاپکراوە و پیتەکانی (پ ، چ ، ژ ، ڤ ، گ . . . ) ی تێدا بەکارهێنراوە . بۆغوونە ، بڕوانە : (ژ ١ ، ل ١ ، س[12] ١ ، د ١٢ - « پازدە ») ؛ (ژ ١ ، ل ١ ، س ٢ ، د ٧ - « پاشی ») ؛ (ژ ١ ، ل ١ ، س ٢ ، د ٩ - « پیغمبر »). . . (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ٥ - « چقاس ») ؛ (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ٦ - « چە ») ؛ (ژ ١ ، ل ١ ، س ٢ ، د ٣ - « چاوە ») . . . (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ٢ - « ژ ») ؛ (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٣ - « روژا ») ؛ (ژ ١ ، ل ٢ ، س ١ ، د ١ - « یکژی ») . . . (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ٧ - « دنقیسن ») ؛ (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٣ - « ناڤ ») ؛ (ژ ١ ، ل ١ ، س ٢ ، د ١ - « مروڤ »)[13] . . . (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ٤ - « گلك ») ؛ (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ٥ - « گوند ») ؛ (ژ ١ ، ل ١ ، س ٢ ، د ٩ - « گوتی يە ») . . . هتد .

جا هەرچەندە هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆمان بەدەستەوە نییە ، لێیەوە بزانین لە کەیەکەوە کورد بەو ڕێنووسە دەنووسێ ، بەڵام وێکچوونی ئەوانەی دوو سەدەی پێشوو کە گەیشتوونەتە دەستمان ، باوەڕ بۆ ئەوە دەبەن کە لە سەرەتای دەست کردن بە بەکارهێنانی ئەلفوبێی عەرەبی یەوە کوردیش وەك فارس هەوڵی چاككردنی دابێ .

---

(١٠) د = دێڕ .

(١١) « کوردستان » یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ١٨٩٨ - ١٩٠٢ ، کۆکردنەوە و پێشەکی : د . کەمال فوئاد ، بەغدا ، ١٩٧٢ .

(١٢) س = ستوون .

دوای ئەو پلەیە ئەوەی لە دەستکاری کردنی ئـەو ئەلفـوبێیەدا دەبینـرێ ، ئەوەیە کە نیگاری (ە) و (ی) و (و) بۆ سەر و ژێر و بۆر بەکارهێنراوە . کۆنترین سەرچاوە کـە ئێمە بینیبێتمـان و ئەمـەی تێدا بـەدی‌بکرێ[14] دەستنـووسی ژمارە (٤٤٨) ی کتێبخانەی کۆڕی زانیاری کوردە . ئەم دەستنووسە ساڵی ١١٩٩ ی ك ، واتە ـ ١٧٨٤ / ١٧٨٥ ز لە لایەن سەعید عەبدوڵڵا موکرییەوە نووسراوەتەوە[15] .

---

(١٣) د. نەبەز بێ هیـچ لێکدانـەوە و شوێن‌کـەوتنێك وای لـەقەڵـەم داوە کە لـە دوای ساڵی (١٩٣٣)وە پیتی (ڤ) پەیدابووە . بەم بۆنەیەوە دوای باسی نامیلکەی «خوێندەواریی باو» (١٩٣٣) ، نووسیویێتی : «لەم ماوەیەدا هێندێ گۆڕان هاتە کایەوە . . . و بۆ دەنگی (٧) کە لە فارسیی تازە و عەرەبیدا نیگاری نیە ، تیپی (ڤ) بەکارهێنرا» (زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ ، ل ٨١) . سەیـر ئەوەیـە نووسـەر لە سـەرەتای بـاسی ڕێنووسدا (ل ٧٩) باسی دەوری مەلا مەحموودی بایەزیدی و ئەلێکساندر ژابا دەکات لە نووسینەوە و کۆکردنەوەی تێکستی کوردیدا ، کەچی هەستی بەوە نەکردووە کە لە تێکرای ئەو دەستنووسانەدا پیتی (ڤ) هەیە . بەو پێیە نەك هەر خەیاڵ بەڵکو بەڵگەی ماددی ئەوە ڕادەگەیەنن ، کە وێنەی دەنگی (ڤ) نزیکەی سەدەیەك پێش ئەو مێژووە کە د. نەبەز دیاری‌کردووە بەکارهێنراوە . . .

بوونی نیگاری (ڤ) نەك هەر لە دەستنووسی کۆندا ، دەبینرێ ، بەڵکو لە چـاپەمـەنیی کوردیی زووشدا ئاشکرا دەدرەوشێتەوە . بەوێنە لە فەرهەنگی (الهدیة الحمیدیة في اللغة الکردیة ، استانبول ، ١٣١٠ك / ١٨٩٣ز) و (ڕۆژنامەی کوردستان ، ١٨٩٨ ـ ١٩٠٢)وگەلێ نووسراوی دێرینی‌دی کوردیدا وێنەی هەیە . . . ئەگەر د. نەبەز بەر لەوەی ئەو مێژووانە دەست‌نیشان بکا ، چاوێکی بە دەستنووس و چاپەمەنیی کوردیدا بگێڕایە ، تووشی ئەو هەڵەیە نەدەبوو .

(١٤) لەمەو لە مەسەلەی پەیدابوونی هەر پیتێکی تردا ، ئەو مێژووەی دەست‌نیشانمان کردووە ، وەنەبێ شتێکی کۆتایی بێ ، چونکە ئێمە ئەوەی وتوومانە لەسەر بنچینەی ئەو کەرەستەیە بنیادمان ناوە کە لە بەر دەستماندا بووە . جا ئەگەر سەرچاوەی ئەوتۆی دی دەست ئێمە یان هەر کەسێکی تر بکەوێ ، پێش ئەو دەمانە بکـەوێ کە دیـاریمان کـردوون ، ئەوە بێ‌گومان دەبێ ئەوەی ئێمە لابرێ و ڕاستەکە لەجێ دانرێ .

(١٥) بۆ زانـینی زیاتر لەم‌بارەوە ، بڕوانە : مەلا محەمەدی سیوچی ، تذکرە العوام یـان بەیتی ئـەووەڵ و ئاخـر (لێکۆڵینـەوەی : محەمـەد عەلی قـەرەداغی ، سلێمـانی ، ١٩٧٩ ، ل ٩ ـ ١٢ .

دوای تەماشاکردنی ئەو دەستنووسە ئەوەم بۆ دەرکەوت کە وتەکانی مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی کە دەڵێ : « ئەوەی لەم نوسخەیەدا جێگەی سەرنجە ڕێنووسی دەسخەتەکەیە . نووسەری ئەم دەسخەتە ، هەندێجار ، نیشانە تـایبەتییـەکانی ڕێنووسی ئێستەی کوردی ، وەك (ە ، ی ، و) سەر و ژێر و بۆر بەکارهێناوە »[16] ، پڕ بە پڕ لەگەڵ واقیعی ئەو کارەدا یەك دەگرنەوە . هەروەها مامۆستـا قەرەداغی ئەوەشی زۆر ڕاست دەست‌نیشان کردووە کە نووسەری دەستخـەتەکـە « وەنەبێ هەمیشە ئەم نیشانانە بنووسێ ، بەڵکو گەلێ جار نیشانە هەر دیـار نییە و لـە زۆر شوێندا پەنا بەر سەر و بۆر و ژێر دەبات »[17]

سەرچاوەیەکی کۆنی دی ، کە هەمان دیاردەی بەکارهێنانی نیگاری (ە ، ی ، و) ی تێدا بەدی دەکرێ ، ڕۆژنامەی « کوردستان » ە . ئەگەر تەماشای یـەکەم ژمارەی - (۹ ی نیسانی ۱۸۹۸) - بکەین لە چـەند شـوێنێکی کەمـدا ئەو پیتـانە دەبینین . بەوێنە ، بروانە : (ل ۱ ، س ۱ ، د٦ و ۷ - «چە دبە نابە») ؛ (ل ۱ ، س ۱ ، د ۱۳ - «نـەخونـە») ؛ (ل ۳ ، س ۲ ، د ۲۳ - «امرکـرنە») . . . (ل ۱ ، س ۲ ، د ٤ - «جریدەکی») ؛ (ل ۳ ، س ۱ ، د ۸ - «صنعتکی») . . (ل ٤ ، س ۲ ، د ٥ - «توجارا») ؛ (ل ٤ ، س ۲ ، د ۹ - «کوشتن») . . .[18] .

شایانی باسە ، ئەم دیاردەیە - واتە نووسینی (ە) و (ی) و (و) لەجیاتی سەر و ژێر و بۆر - کە لە دەستنووس و چاپەمەنی زووی کوردیدا ناوەناوە ڕەچاو کراوە ، لە ڕۆژنامەی « تێگەیشتنی ڕاستی »دا[19] باش پەرەی سەندووە . ئەگەرچی ئەمە وەك کارێکی سەرەتایی هەموو وشەکانی نەگرتۆتەوە و گەلێك وشە هەر لەسەر شێوەی

---

(۱٦) هەمان سەرچاوە ، ل ۱۱ .

(۱۷) هەمان سەرچاوە ، ل ۱۱ .

(۱۸) لەو نموونەنانەدا بینیمان کە ڕۆژنامەی « کوردستان » لە هەندێ شوێندا لەبریتی سەر و ژێر و بۆر پیتی (ە ، ی ، و ) بەکارهاتووە ، کەچی مامۆستا نەریمان هەستی بەمە نەکردووە و وا رادەگەیەنێ کە ڕۆژنامەی ناوبراو « سەر و بۆری بۆ هەندێ پیت بەکارهێناوە » (سەرچاوەی ناوبراو ، ڕێنووسی کوردی لە ڕەگە و ریشەوە ، ل ۱۸) .

(۱۹) « تێگەیشتنی ڕاستی » ، بەغدا ، ۱۹۱۸ - ۱۹۱۹ . (بۆ وەرگرتنی زانیاری تەواو لەبارەی ئـەو ڕۆژنامـەیەوە ، بـروانە : د . کـەمال مـەزهەر ، تێگـەیشتنی ڕاستی و شـوێنی لـە ڕۆژنامەنووسـی کوردیدا ، بەغدا ، ۱۹۷۸ .

کۆن نووسراون[٢٠] ، بەڵام لە گشت لاپەڕەیەکدا چەندین نموونەی جوان و لەبار دەبینرێ . بۆ پێ‌سەلماندنێ ئەو وشانە هەر لە لاپەڕە (١) ی ژمارە (١) ەوە چەندین نموونە دەخەینە پێش چاو : (د ٢ و ٧ ـ « تاقی کردنەوە ») ؛ (د ٨ ـ « هەمیشە ») ؛ (د ٩ ـ « امید دەکەین ») . . . (د ٢ ـ « تێگەیشتنی راستی ») ؛ (د ٣ ـ « اقوامی عالم ») ؛ (د ١٠ ـ « چاکەی حکومەتی بەریتانیا ») . . . ( د ٧ ـ «کورد») ؛ (د١٣ ـ «کوشتن») . . . هتد .

سەرەڕای پەرەسەندنی دیاردەی بەکارهێنانی (ە) و (ی) و (و) لەبریتی سەر و ژێر و بۆر لە « تێگەیشتنی راستی » دا هەروەها پێویستە ئەوەش لەیادنەکەین کە ئەو رۆژنامەیە یەکەم چاپەمەنیی کوردییە بە نووسین پەنجە بۆ ئەو پێویستی‌یە رابکێشێ و لەبارەی بایەخ و کەڵکی‌یەوە بدوێ و لەژێر سەرباسی «بعض اصطلاحاتی کوردی » دا بڵێ : « اوروپاییە بو خویندنی نوسینی زمانی شرقیەکان زور مشکلات دەکیشن . ایمە لەبر امە کە ام مشکلاتە بەقدر امکان حل بکین امە صالیکە لە نوسین کوردیدا بە موافقتی فن اثناکان [ آشناکان ] بعض اصطلاحاتمان قبول کرد .

(سر) و (بور) و (ژیر) ی حرفەکان بە (هـ) و (و) و (ی) دەنوسین :

لەباتی کردستان (کوردستان)و لەباتی دکا (دەکا) و لەباتی حکومت کورە (حکومتی کورە) و لەباتی موفقیت اوان (موفقیتی اوان) و همزەش بە (ی) دەنوسین . امە بی‌شبهە بو چاك خوندنەوەی نوسینی کوردی فائدەی زورە کلی اصطلاحاتی تریشمان تصور کردوە اوانش لوقتی خویدا نشر دەکین»[٢١][٢٢][٢٣] .

---

(٢٠) بەوێنە بڕوانە : (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ٢ ـ «خدمتی») ؛ (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ٧ ـ « هرچی ») . . . (ژ ٢ ، ل ١ ، س ١ ، د ـ ١٩ « علم ») ؛ (ژ ٤ ، ل ٢ ، س ٢ ، د ٦ ـ « حکومەت معظمە بریتانیا ») . . . (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ٣ ـ « اکرادان ») ؛ (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ٤ ـ « مبارکن ») . . . هتد .
هەروەها جاروبارێش (ێ) لەبریتی (ی) دەبینرێ ، وەك : (ژ ٤ ، ل ١ ، س ٢ ، د ٢٣ ـ «کولارەێ ایمە») ؛ ژ ٤ ، ل ١ ، س ٢ ، د ٢٤ ـ «هزار کولەێ») ؛ (ژ٥ ، ل ١ ، س ٢ ، د ١٨ ـ «بو . . . موازنەێ دولتان») . . .

(٢١) بە هیچ چەشنێك دەستکاری رێنووس و هەڵەی چاپ و شێوازی ئەم نموونەیە و هەندێ نموونەی ترم نەکردووە ، کە لە (تێگەیشتنی راستی) یان چاپەمەنی‌یەکی دی کۆندا هێناومنەتەوە .

(٢٢) «تێگەیشتنی راستی » ، ژ ٦٣ ، ١٣ ی کانوونی دووەمی ١٩١٩ ، ل ١ .

چەند مانگێك دوای ئەو ڕوونكردنەوەیەی ڕۆژنامەی «تێگەیشتنی ڕاستی» ، گۆڤاری «ژین»ی ئەستەموول بە ناوی «كوردجە حرفلری»» بەوە لیستەی ئەلفوبێی كوردی بڵاوكردەوە[24] . لەو ئەلفوبێیەدا پیتە بزوێنەكان و پیتە كۆنسۆنانتەكان جیاكرابوونەوە و بۆ یەكەمیان (٨) پیت و بۆ دووەمیان (٣٤) پیت دیاری كرابوون . لەنێو پیتە بزوێنەكاندا نیگاری (ە ، ی ، و) هەیە .

سەرەتای ساڵی ١٩٢٧ یش مامۆستا حسەین حوزنی موكریانی لە گۆڤاری « زاری كرمانجی » دا لەو بارەیەوە نووسیویێتی : « قاعیدەیەكی كە لە گۆڤاری زاری كرمانجیدا قبوول كراوە بۆ نووسین ئەمەیە : حرف (ە) عەلامەتی سەرە ، وەكو (اەگەر) و (و) عەلامەتی بۆرە وەكو (بوت) ، (خۆت) ، (ڕووت) و (ی) عەلامەتی ژیرە وەكو (ایدی) بەڵان لە شەرطیكیدا حرفانی (ە، و ، ی) لە اصلی كەلیمە نەبن »[25] [26] .

---

(٢٣) شایانی باسە ، د . كەمال مەزهەر دەربارەی ئەو هەنگاوەی « تێگەیشتنی ڕاستی » دواوە و لێی كۆڵیوەتەوە ، بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی كوردیدا ، ل ١٥١ ـ ١٥٢ .

(٢٤) گۆڤاری « ژین » ی ئەستەموول ، ژ ١٨ ، ٨ ی مایسی ١٣٣٥ ـ ٨ ی مایسی ١٩١٩ . (ئەو ئەلفوبێیە لە ژمارەكانی دواتریشدا بڵاوكراوەتەوە . بەدوا ژمارە (١٨) دا من تەنیا ژمارە (١٩) و (٢١) م بینیوە و لە هەردووكیاندا هەیە .

(٢٥) گۆڤاری « زاری كرمانجی » ، ژ ٧ ، ڕەواندز ، ٣ ی كانوونی دووەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ .

(٢٦) بێگومان جێگەی ڕەخنەیە كە د. نەبەز بێئەوەی بە دەستنووس و چاپەمەنی كوردیدا گەڕابێ و بێئەوەی خۆی بەو باسەوە ماندوو كردبێ ، وای بڕیارداوە كە نیگاری (ە ، ی ، و) لەبریتی سەر و ژێر و بۆر لە دوای ساڵی (١٩٣٣)وە پەیدابووە . لەم بارەیەوە ، دوای باسی كتێبی «خوێندەواریی باو» (١٩٣٣) ، دەڵێ : «لەم ماوەیەدا هێندێ گۆڕان هاتە كایەوە . بۆ وێنە : سەری عەرەبی (فتحە) بە (ـە ، ە) دەنووسرا و ژێر (كسرة) بە (ی) و بۆر بە (و)» (زمانی یەكگرتووی كوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ ، ل ٨١) . . . وەك لە سەرەوە لێی دواوین ، ئەو نیگارانە سەد ساڵێك لەوەوبەر پەیدا بوون ـ واتە پتر لە پەنجا ساڵ پێش ئەو مێژووەی د. نەبەز دەستنیشانی كردووە . . . دواتریش بە بەڵگەوە لەوە دواوین كە چۆن وردە وردە گەشەیان كردووە و لە چاپەمەنییەكانی ساڵانی بیستی ئەم سەدەیەدا پەرەیان سەندووە . بەم چەشنە دەردەكەوێ ، ئەوەی د. نەبەز دەربارەی

پەیدابوونی ئەو پیتانە وتوویە ، بە هیچ چەشنێك لەگەڵ واقیعدا ناگونجێ .

لەمەش سەرنج ڕاکێشتر ئەوەیە ، کە لە باسی دەوری مامۆستا حسەین حوزنی موکریانیدا وتوویە : «یەکێك لەوانەی کە هەر لە کۆنەوە خەریکی بە کوردی نووسین و ڕێکخستنی ئەلفوبێی کوردی بوون ، بەهەشتی ـ داماو ـ حوزنی موکریانی (١٨٩٣ ـ ١٩٤٧)یە . جا چونکە کۆمەڵگەی کوردەواری هێشتا لە دەوری دەرەبەگێتیدایە و بزووتنەوەی نیشتمانی کورد ، لە لایەن دەرەبەگ و وردە بۆرجوازییەوە سەرکردەیەتی دەکرێ و بیروباوەری سۆشیالیزمی نەتەوەیی شۆڕشگێرانە ، هێشتا بنجی خۆی دانەکوتاوە ، دیارە ئەوانەی هەژار و دەستکورت بوون و پایەی (خاوەن بەرزیتی)و (بەگێتی)و (ئاغایەتی)و (دوکتۆری)یان نەبووە و کەچی مازووری کێشانە و تێکوشەرانە خزمەتی گەورە گەورەی ئەم گەلەیان کردووە ـ کە زۆربەی زۆری جوتکار و ڕەنجکێشە ـ نێویان لە کوولەکەی تەریشدا نەهێنراوە . بەڵام ئەوەی تەماشای گۆڤاری (زاری کرمانجی) بکا لە (١٩٢٦ ـ ١٩٣٢) لە ڕەواندز ، داماو دەری‌دەکرد ، بەتایبەتی ژمارە (٧) ، ئەوسا تێدەگا کە داماویش لە مەیدانی دامەزراندنی ئەلفوبێی کوردیدا خزمەتێکی زۆری پێشکەش بە نەتەوەکەی کردووە» (هەمان سەرچاوە ، ل ٨٠) . بێگومان دەوری دیاری مامۆستا حوزنی موکریانی لە زۆر مەیداندا شایانی باس و جێگەی ڕێزە . بەڵام وەك نووسینەکانی نیشانی دەدەن ، کەم خۆی بە مەسەلەی ڕێنووسەوە خەریك کردووە و ئەمەش هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ و بە هیچ جۆرێك لە بەرزیی ئەو زاتە کەم ناکاتەوە . کەچی د. نەبەز دەڵێ : «لە مەیدانی دامەزراندنی ئەلفوبێی کوردیدا خزمەتێکی زۆری پێشکەش بە نەتەوەکەی کردووە»و بۆ بەڵگەی ئەو قسانەشی داوامان لێ دەکا ، تەماشای ژمارە (٧)ی گۆڤاری (زاری کرمانجی) بکەین . بەڵام کە تەماشای ئەو سەرچاوەیە دەکەین لەبارەی ڕێنووسەوە نە وتار و نە لێکۆڵینەوە نابینین . تەنیا لە خوارووی دوا لاپەڕەدا نەبێ ئەو چەند دێرە نووسراوە ، کە لە سەرەوە خستوومانەتە پێش چاو . . . سەرەڕای ئەوەی ، ئەمە نە وتارە و نە لێکۆڵینەوەیە ، هەروەها شتێکی نوێش نییە و ئەو بەکارهێنانە و ئەو جۆرە ڕوونکردنەوانە لە چاپەمەنییەکانی پێش (زاری کرمانجی)شدا دەبینرێن .

لەم باسەدا دوو ڕەخنەم لە د. نەبەز هەیە :

أ ـ ئەو پێنج دێرەی لە خوارەوەی دوا لاپەڕەی ژمارە (٧)ی گۆڤاری (زاری کرمانجی)دا نووسراوە ، کە تەنیا باسی دەستووری بەکارهێنانی پیتی (ە ، و ، ی)ی لەبریتی سەر و بۆر و ژێر دەکات لە گۆڤارەکەدا چۆن دەتوانێ ببێتە بەڵگەی ئەوەی ، ئەمە بە (خزمەتێکی زۆر)ی مامۆستا حوزنی دابنرێ . . . واش دەردەکەوێ کە د. نەبەز بۆیە پەنجەی بۆ ئەو چەند دێرە ڕاکێشاوە ، چونکە لە سەرپاکی ژمارەکانی تری (زاری کرمانجی)دا شتێکی ئەوتۆ لەبارەی گیروگرفتی ئەلفوبێوە نەنووسراوە . بە ڕای من (زاری کرمانجی) لە مەسەلەی ڕێنووسدا زۆر هەژارە ، بەڵام لە هەندێ بابەتی تردا ، بەتایبەتی لە باسی مێژووی کورددا ، هاوتای کەمە . . . جا چۆن پێویست ناکا لە پایەی کەس کەم بکرێتەوە ، هەروەها لێ زیادکردنیشی باش نییە .

کتێبی « دەستووری زمانی کوردی » ی مامۆستا تۆفیق وەهبی (١٩٢٩)[٢٧] وا چاپ کراوە کە لە سەرانسەریدا نیگاری (ە ، ی ، و) لـەجیێ سەر و ژێـر و بۆر دانراوە[٢٨] .

ئـەگەرچی نـووسینی پیتی (و) لەبـریتی بۆر و نـووسینی (ی) لەجیاتی ژێر هەنگاوێکی باش بوو ، بەڵام گیروگرفتێکی پەیداکرد. ئەو گیروگرفتەش ئەوە بوو کە شێوەیان لەگەڵ شێوەی پیتی بزوێنی (ۆ) و (ا) ی درێژ ، کە ئەو سەردەمە بە یەك

---

ب ـ لە سەرەتای ئەم پەراوێزەدا وەڵامی رایەکی سەرپێ‌یی د. نەبەزمان داوەتەوە ، کـە وای داناوە گوایا نیگاری (ە ، و ، ی) لەبریتی سەر و بۆر و ژێر لە دوای ساڵی (١٩٣٣)وە پەیدا بووە . هەروەها ئەو چەند دێرەی (زاری کرمانجی) یش دیسان ئەوە دەگەیەنن ، ئەو پیتانە بەر لەو مێژووەی د. نەبەز دەست‌نیشانی کردووە ، بەکارهێنراون . چونکە وەك ئاشکرایە ، ژمارەی ناوبراوی (زاری کرمانجی) کە ئەو باسەی تێدایە ساڵی ١٩٢٧ بڵاوکراوەتەوە . جا ئەگەر د. نەبەز بۆ دیاری کردنی مێژووی پەیدابوونی ئەو پیتانە بۆی نەلواێ بە دەستنووس و چاپەمەنی کوردیدا بگەرێ ، خۆ دەبوو ئەوەی (زاری کرمانجی) باش تەماشا بکا و دەمی بەکارهێنانی ئەو پیتانە نەخاتە دوای ساڵی ١٩٣٣ .

(٢٧) تۆفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی، جزمی یەکەم، بەغدا، ١٩٢٩ .

(٢٨) وەك لەسەرەوە نیشانمان‌دا دەربارەی بەکارهێنانی پیتی (ە ، ی ، و) بۆ سەر و ژێر و بۆر لە نووسینی کوردیدا لەمێژە سەری هەڵداوە و سەرەرای ئەوەش مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٩ رۆژنامەی « تێگەیشتنی راستی » بە نووسین پەنجەی بۆ ئەو پێویستی‌یە راکێشاوە و مانگی مایسی ١٩١٩ گۆڤاری « ژین » ی ئەستەموول لە لیستەی پیتە بزوێنەکاندا نیگاری بۆ داناون و ساڵی ١٩٢٧ یش گۆڤاری (زاری کرمانجی) لە ژمارە (٧) یدا ئەو دەستوورەی پەسەندکردووە و مامۆستا تۆفیق وەهبیش ساڵی ١٩٢٩ لە چاپی کتێبی «دەستووری زمانی کوردی»دا بۆ خوێنی چێشتیش سەر و ژێر و بۆری نەنووسیوە . . . کەچی مامۆستا نەریمان کە لای خۆی لە رەگ و ریشەی رێنووسی کوردی دەدوێ ، مێژووی دێرینی ئەو پیتانەی نەبینیوە و ساڵانی (٣٠)ی بە دەمی پەیدابوونیان داناوە و ئەو چەند دێرەی ساڵی ١٩٣٣ لەسەر بەرگی کتێبی (خورشیدی خاوەر) لەو بارەیەوە نووسراوە بە «یەکەم بەردی بناغەی» ئەو کارە ژماردووە و واش رادەگەیەنێ ، لەو کتێبانەدا کـە (کوردی و مـەریوانی) لـە سی‌یەکاندا چاپیان کردبوو «یەکەمین جارە لەجیاتی (بزوێن) لە رێنووسی کوردیدا (پیت) بەکارهێنراوە و تا ئەمرۆش پەیرەوی کراوە بۆیە بە بـەردی بناغـەی رێنووس دادەنـرێ» (بـروانە : ل ٢٤ ـ ٢٥) . . بـەداخەوە بـاش وردنەبـوونەوەی مـامۆستـا نـەریمـان لـە دەستنووس و چاپەمەنیی کوردی بووەتە هۆی هەڵە و نادروستی .

(ۆ) و بە یەك (ێ) دەنووسران ، وەك یەكیان لێهات . هەرچەندە تا ناوەراستی ساڵانی بیست هیچ كارێك بۆ جیاكردنەوەی كورتە بزوێنی (و - u) و بزوێنی درێژی (وو - ū) نەكراوە ، بەڵام بەنیسبەت جیاكردنەوەی كورتە بـزوێنی (ێ) و بزوێنی (ی) ی تیژەوە ناوەناوە ئەوە بەدی دەكرێ كە لە كۆتایی وشەوە (ی) ی تیژ یان بە دوو (ی) نووسیوە ، بەوێنە بروانە (تێگەیشتنی ڕاستی) : (ژ ۱ ، ل ۱ ، س ۱ ، د ۲۱ - « خـلقیی ») ؛ (ژ ۲ ، ل ۲ ، س ۱ ، د ۳ - « كـسیی ») ؛ (ژ ۳ ، ل ۱ ، س ۱ ، د ۱ - « سربستیی »)[۲۹] . . .

هەوڵێكی گەورە لە سازاندنی ئەلفوبێی عەرەبی بۆ نووسینی كوردی لەلایەن یوسف ضیائەدین پاشای خالدیەوە دراوە . ئـەویش ئەوەیـە كە لـە چاپكـردنی فەرهەنگی « الهدیة الحمیدیة في اللغة الكردیة » (۱۸۹۳) دا[۳۰] بۆ نیشاندانی دەنگی (ۆ) و (ێ) لەژێر نیگـاری (و) و (ی) دا نیشانـەی (۸) ی داناوە[۳۱] . بـەوێنە ، بـروانــە : (ل ٤۳ ، س ۲ ، د ۲ - « تـوبـه ») ؛ (ل ۵۷ ، س ۲ ، د ۱۳ - « چوكدان ») ؛ (ل ۲۲۷ ، س ۲ ، د ۲ - « نهر ») . . (ل ۳۳ ، س ۱ ، د

---

(۲۹) هەر لەو لاپەرانەدا ، كە ئەو نموونانەم لێوە وەرگرتوون و كردوومنەتە بەڵگەی نووسینی دوو (ی) بۆ دەربرینی (ی)ی تیژ ، ئەوەش بەدیدەكرێ ، كە هەر ئەو وشانە بە یەك (ی) یش نووسراون . بەوێنە بروانە : (ژ ۱ ، ل ۱ ، س ۲ ، د ۲۱ - « خلقی ») ؛ (ژ ۲ ، ل ۲ ، س ۲ ، د ۸ - « كسی ») ؛ (ژ ۳ ، ل ۱ ، س ۱ ، د ۳ - « سربستی ») . . . جا نەك هەر ئەمە و نەك هەر ئەوەی لە پەراوێزی ژمارە (۲۰) دا لەبارەی جاروبار نەنووسینی (ە) و (ی) و (و) ەوە خستوومەتە پێش چاو ، بەڵكو چەندین پیتی‌تر و شێوە نووسینی دی بە هـەمەچـەشن دەبینرێن . بێ‌گـومان ئـەمەش وەنـەبێ هەر لـە ڕۆژنامـەی « تێگەیشتنی ڕاستی » دا بەوجۆرە بووبێ ، بەڵكو لە چاپەمەنی‌یەكانی گەلێ دوای ئەویشدا هەروا بووە ، ئەویش چونكە نووسینی كوردی لە دەوری دروستبووندا بووە . ئەوەتە ئەمرۆش هێشتا بەشێك لەو كێشانە ماون .

(۳۰) ضیاءالدین باشا الخالدی المقدسی ، الهدیة الحمیدیـة في اللغة الكـردیة ، استـانبول ، ۱۳۱۰هـ .

(۳۱) بە پێویستی دەزانم ، پێ لەوە بنێم كە زووتر هەستم بەو هەوڵەی یوسف ضیائەدین پاشا نەكردبوو ، بەڵام لە ڕێی كتێبەكەی مامۆستا نەریمانەوە - (ڕێنووسی كـوردی لە ڕەگ و ڕیشەوە) كە لە لاپەرە ۱۷ - ۱۸ دا باسی كردووە ، لێی ئاگادار بووم .

١٤ - « پیـار » ؛ (ل ٣٢ ، س ١ ، د ٧ - « پێ ») ؛ (ل ٢٢٨ ، س ١ ، د ١٩ - « نیری ») . . .

شایانی باسه ، لـه سەرەتـای سەدەی بیستـەمدا (کـۆمەڵـەی گشتی کردنی خوێندەواری چاککردنی ڕێنووس) و (کۆمەڵەی هیڤی) بـایەخێکی تـایبەتیـان بە چارەسەرکردنی کێشەکانی ڕێنووسی کوردی دابوو . ئەو بەرهەمەی لەم بارەیـەوە هێنابوویانە ئەنجام ، ئەلفوبێیەك بوو لەسەر بناغەی پیتەکانی عەرەبی و هەشت پیتی نوێیان بۆ زیادکردبوو . پیتەکانی ئەم ڕێنووسە بەیەکەوە نەدەلکان . پیتە نوێ پێشنیار کراوەکانیش سەر و بۆر و ژێر و ئەلف و واوی کـراوە و واوی درێژ و یێ لار و دیفتۆنگی (وێ) بوون ، کە لە نووسینی ئەمرۆی کوردیدا هەن . جا هۆ هەرچییەك بووبێ ، ئەم ڕێنووسە پەرەی نەسەند .

دەربارەی کێشەی نووسینی کوردی و ڕێگـەی چارەسـەرکردنی و پێـویستی گرنگی پێدانی و خستنە پێش چاوی ئەو ئەلفوبێ نوێیە لە ژمـارە (٣) ی گۆڤـاری « ڕۆژی کورد » دا بە زمانی تورکی وتارێك بە ناوی « پیتـەکانمـان و ئاسـانکردنی خوێندنەوە » وە بڵاوکراوەتەوە[٣٢] . بەدوا ئەو وتارەشدا نامەیەك چاپ کراوە ، کە کۆمەڵەی گشتی کردنی خوێندەواری و ڕێنووس بۆ گـۆڤاری « ڕۆژی کـورد » یان ناردووە[٣٣] [٣٤] .

لە لیستەی ناوبراوی گۆڤاری « ژین » ی ئەستەموولدا[٣٥] ، هەروەها چوار نیگاری نوێ بۆ دەنگە بزوێنەکان بەرچاو دەکەوێ . ئەو چوار نیگارەش ئەمانەن :

---

(٣٢) م . ص ، ئازیزی ، حروفمز و تسهیـل قرائت ، گـۆڤاری « ڕۆژی کـورد » ، ژ ٣ ، ئەستەموولّ ، ٦ ی ئەمووزی ١٣٢٩ ك / ١٩١٣ ز ، ل ١٢ - ١٣ .

(٣٣) (تعمیم معارف و اصلاح حروف) جمعیت محترمەسی طرفندن وارد اولمشدر : روژ کرد مجموعەسی مدیریت علیه سنه ، گۆڤاری « ڕۆژی کورد » ، ژ ٣ ، ئەستەموولّ ، ٦ ی ئەمووزی ١٣٢٩ ك / ١٩١٣ ز ، ل ١٣ - ١٦ .

(٣٤) مامۆستا نەریمان نەك هەر باسی ئەو بابەتە تایبەتییەی نەکردووە ، بەڵکو یادداشتیشی نەکردووە .

(٣٥) بڕوانە : لاپەڕە (٣٠ ) ی ئەم کتێبە و پەراوێزی ژمارە (٢٤) .

١ - (و - هەشتێك لەسەری) بۆ (ۆ) واوی كراوە .
٢ - (و - حەوتێك لە سەری) بۆ دیفتۆنگی (وی) .
٣ - (ی - هەشتێك لەسەری) بۆ (ێ) یێی كراوە .
٤ - (ی - حەوتێك لەسەری) بۆ بزرۆكەی (اٌ) .

لەبەر چەند هۆیەكی ئاشكرا ، دوای شەڕی یەكەمی جیهان ڕۆژئاواییەكان گرنگییان بە مەسەلەی كوردناسی بە گشتی و زمانی كوردی بەتایبەتی دا و لەوبارەیەوە ژمارەیەك كتێبیان بلاوكردەوە . گەڕان بەناو ئەو نووسراوانەدا ئەو ڕاستییە دەخاتە ڕوو كە هەوڵ بۆ دۆزینەوەی چارەی دەربڕینی دەنگە كوردییەكان دراوە . هەنگاوی هەرە گەورەی ئەو مەیدانە دانانی چوكڵەیە لەسەر پیتی (ل) بۆ نیشاندانی دەنگی (ل) ی قەڵەو . بۆ نموونە ئەم دیاردیەمان لە پێنج بەرهەمدا دۆزیوەتەوە ، كە هەموویان لە ساڵی ١٩١٩ دا لەچاپدراون : یەكەم « انجیل یوحنا »[٣٦] ، بەوێنە بڕوانە : (ل ١ ، د ١ - « خلاّ ») ؛ (ل ١ ، د ٨ - « بلاّ ») . . . دووەم « انجیل متی »[٣٧] ، بڕوانە : (ل ٨ ، د ٦ - « بلیّ ») ؛ (ل ٩ ، د ٩ - « پاكدلاّن ») . . . سێیەم « انجیل لوقا »[٣٨] ، بڕوانە : (ل ٢ ، د ٨ - « دلّی ») ؛ (ل ٢ ، د ١٣ - « لالّ ») . . . چوارەم « انجیل مەرقوس »[٣٩] ، بڕوانە : (ل ٤ ، د ٧ - «دلّ») ؛ (ل ٩ ، د ٣ - «خلاّ») . . . پێنجەم - كتێبی ڕێزمانی كوردی ل . و. فۆسسوم[٤٠] ، بەوێنە بڕوانە : (ل ٢٥٤ ، د ١٠ - «دەلّیّ») ؛ (ل ٢٥٤ ، د ٩ - «بلاّ»)[٤١] . . .

---

(٣٦) ئینجیل یوحەننا ، ١٩١٩ .
(٣٧) ئینجیل مەتتی ، ١٩١٩ .
(٣٨) ئینجیل لۆقا ، ١٩١٩ .
(٣٩) ئینجیل مەرقۆس ، ١٩١٩ .
(٤٠) L.O.Fossum , A Practical Kurdish grammar , Minneapolis , 1919 .
(٤١) بۆ چاپخانەكان ، وەك دواتر لێی دواوم بە هەوڵ و تەقەلاّی مامۆستایان : ئیبراهیم ئەحمەد و عەلائەدین سەجادی پیتی (ۆ ، ێ ، ڵ ، ڕ) هێنرا ، بەلاّم ئەوەتە لەو پێنج سەرچاوەیەی سەرەوەدا بۆ جیاكردنەوەی (ل)ی قەڵەو چوكڵە بەكارهێنراوە . . . دواتریش ، ساڵی ١٩٢٨ مامۆستا سەعید صدقی بۆ جیاكردنەوەی لامی قەڵەو سێ خاڵی لەسەر (ل) داناوە و =

لە ناوەڕاستی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دەورێکی نوێ لە مێژووی پەرەسەندنی چارەسەرکردنی ڕێنووسی کوردی دەست پێ دەکات . ئەمەش یەکێك بوو لە ئەنجامەکانی قووڵبوونەوەی هەستی نەتەوایەتی کە یەکێك لە بەرهەمە ڕۆشنبیرییە گرنگەکانی بریتی بوو لە بایەخدانی خوێندەوارانی کورد خۆیان بە لێکۆڵینەوەی زمان و ئەدەب و مێژووی گەلەکەیان . بۆنموونە لە بەشێکی زۆری ژمارەکانی گۆڤاری «دیاری کوردستان» (١٩٢٥ - ١٩٢٦)دا سەبارەت بە گیروگرفتی نەبوونی وێنەی هەندێ دەنگی کوردی لە ئەلفوبێی عەرەبیدا و هەوڵی چارەسەرکردنی و هەروەها بیرورا لەبارەی نووسینی کوردییەوە بە لاتینی ، ژمارەیەك وتار بڵاوکراوەتەوە ، کە وتاری مامۆستایان : تۆفیق وەهبی[٤٢] ، حەقی شاوەیس[٤٣] ، پیرۆت[٤٤] ، حەسەن کوردستانی[٤٥] . . . لە نێوانیاندا دیارن[٤٦] .

---

= نیشانەی (ᵛ) یشی بۆ نیشاندانی (ۆ)ی کراوە و (ێ)ی لار باس کردووە . . . تەنیا دەمێنێتەوە سەر (ڕ)ی قەڵەو ، ئەمیش هەرچەندە لەساڵی ١٩٥٠ بەدواوە چوکڵەی بۆ بەکارهێنرا ، بەڵام زۆر پێش ئەو دەمە ، نووسەران جیاوازی (ر)ی لاواز و قەڵەویان دەکرد . بەوێنە مامۆستا تۆفیق وەهبی بۆ نیشاندانی (ڕ)ی قەڵەو خاڵێکی لەژێر پیتی (ر)دا دادەنا و هەندێکی دیش بە دوو (ر) دەیان نووسی . . . ئەمە ڕاستی مێژووی پەیدابوونی ئەو پیتانەیە ، کەچی د . نەبەز دەڵێ . «لە (١٩٥٠) بەدواوە . . . بۆ (ل)ی قەڵەو (ڵ) و بۆ (ڕ)ی قەڵەو (ڕ)و هێندێ جار (ڕ) و بۆ (و)ی کراوە (ۆ)و بۆ یێ ی لار (ێ) بەکارهێنرا» (زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ ، ل ٨١) .

(٤٢) تۆفیق وەهبی ، کوردییەکەمان بە چۆن حرووفێك و چۆن بنووسین ، گۆڤاری «دیاری کوردستان» ، بەشی یەکەم ، ژ ٥ ، بەغدا ، ١٢ مایسی ١٩٢٥ ، ل ٥ - ٦ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٦ ، بەغدا ، ٢٩ مایسی ١٩٢٥ ، ل ٥ - ٦ . . .

(٤٣) أ - حەقی شاوەیس ، نووسینی کوردی چۆن بێ ؟ ، گۆڤاری «دیاری کوردستان» ، بەشی یەکەم ، ژ ٥ ، بەغدا ، ١٢ مایسی ١٩٢٥ ، ل ٨ - ٩ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٦ ، بەغدا ، ٢٩ مایسی ١٩٢٥ ، ل ٧ - ٨ .

ب - حەقی شاوەیس ، ئیملای کوردی - حروفاتی عەرەبی ، گۆڤاری «دیاری کوردستان» ، بەشی یەکەم ، ژ ٧ ، بەغدا ، ١٤ تەمووزی ١٩٢٥ ، ل ٧ - ٩ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١٠ ، بەغدا ، ٢١ تشرینی یەکەمی ١٩٢٥ ، ل ٩ - ١٢ .

ج - حەقی شاوەیس ، لاپەڕەی نووسینی تازە و کوردی پەتی : لە نووسین و شێوەدا =

ئەنجامی ئەو هەوڵ و تەقەلا و بایەخ پێدانەش ، لە چاپەمەنیی کوردی ئەو سەردەمەدا تیشکی داوەتەوە و گەلێك گۆڕان بەدی دەکرێ :

لە ڕۆژنامەی «پێشکەوتن»دا (١٩٢٠ - ١٩٢٢)[٤٧] لە هەندێ شوێندا نیشانەکانی (ە ، ی ، و) لەبریتی سەر و ژێر و بۆر بەدی دەکرێن . بەوێنە ، بروانە : (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ١١ - «بکەمەوە») ؛ (ژ ١ ، ل ١ ، س ٢ ، د ٢٠ - «ناوی چاك») ؛ (ژ ١ ، ل ١ ، س ٢ ، د ە - «کوڕ») . . .

لەم ڕۆژنامەیەدا نیگاری (گ) نابینرێ ، بەڵام لە ڕۆژنامەکانی دی ئەو سەردەمەی سلێمانی ، وەك «ڕۆژی کوردستان» (١٩٢٢ - ١٩٢٣)[٤٨] و «بانگی کوردستان» (١٩٢٢ - ١٩٢٦)[٤٩] دا هەیە . جا ئەمە و هەروەها بوونی لە دەستنووسی کۆن و یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیدا (١٨٩٨ - ١٩٠٢) ، ئەوە دەگەیەنێ کە لە مێژەوە ئەو نیگارە دانراوە ، بەڵام هۆی نەبینینی لە ڕۆژنامەی «پێشکەوتن»دا ، دەبێ نەبوونی ئەو پیتە بووبێ لەو چاپخانەیەدا کە لێی چاپ کراوە[٥٠] .

---

= سەربەخۆ ، گۆڤاری «دیاری کوردستان» ، بەشی یەکەم ، ژ ١٣ - ١٤ ، بەغدا ، ٥ مارتی ١٩٢٦ ، ل ١٨ - ٢٠ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١٥ ، بەغدا ، ١٨ مارتی ١٩٢٦ ، ل ١٠ - ١٢ .

(٤٤) پیرۆت ، کوردی بە چی حەرفێ بنووسرێ ، گۆڤاری «دیاری کوردستان» ، ژ ١١ - ١٢ بەغدا ، ٥ کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ ، ل ٩ - ١١ .

(٤٥) حەسەن کوردستانی ، لە حەق نووسین تازە ، گۆڤاری «دیاری کوردستان» ، ژ ١٦ ، بەغدا ، ١١ مایسی ١٩٢٦ ، ل ٨ - ١٠ .

(٤٦) لە کتێبی ناوبراوی مامۆستا نەریماندا باسی ئەو هەوڵە گرنگانە نەکراوە .

(٤٧) ڕۆژنامەی پێشکەوتن ، سلێمانی ، ١٩٢٠ - ١٩٢٢ .

(٤٨) ڕۆژی کوردستان ، سلێمانی ، ١٩٢٢ - ١٩٢٣ (کۆکردنەوە و پێشەکی جەمال خەزنەدار ، بەغدا ، ١٩٧٣) .

(٤٩) بانگی کوردستان ، سلێمانی ، ١٩٢٢ - ١٩٢٦ (کۆکردنەوە و لەسەر نووسینی : جەمال خەزنەدار ، بەغدا ، ١٩٧٤) .

(٥٠) لە هەندێ دەستنووس و چاپەمەنیی کوردی کۆندا ناوەناوە نیگاری دەنگی (گ) بەشێوەی پیتی (ك - سێ خاڵ لە سەری) بەرچاو دەکەوێ .

له رۆژنامەی «پێشکەوتن» و زوربەی رۆژنامەکانی دی ئەو دەمەدا هەروەها نیگاری (ئـ) نابینرێ ، بەلاّم لە هەندێ چاپەمەنی هەمان دەم و پچێک زووتر و کەمێ دواتردا پەیدا بووە . بەوێنە لە ژمارە (١٨)ی گۆڤاری «ژین»ی ئەستەموولّدا ، کە ٨ی مایسی ١٣٣٥ی لەسەر نووسراوە کە دەکاتە ٨ی مایسی ١٩١٩ وتارێکی داوەر ئەردەلاّنی بە ناوی «چۆن بکۆشین ؟» ەوە هەیە (ل ١٦)و لە نووسینی هەندێ وشەدا نیگاری (ئـ)ی بەکارهێناوە بەوێنە : (د ٨ ـ «ئەمرد») ؛ (د ١١ ـ «ئـەم») ؛ (د ١٣ ـ «ئـەمـانـە») ؛ (د ١٤ ـ «ئـەکـۆشـین») ؛ (د ٤٠ ـ «ئەمندە») . . .[٥١]

شایانی باسە ، کە ئەم هەنگاوەی داوەر ئەردەلاّنی کاری کردە سەر هەندێ نووسەری گۆڤاری «ژین» . بۆنموونە یەکسەر لە ژمارەی داهاتوودا ـ واتە لە ژمارەی ١٩دا ، ٢٢ی مایسی ١٣٣٥ ك/١٩١٩ز ـ ع . رەحمی ، کە نووسەرێکی چالاکی ئەو گۆڤارە بووە و لە زوربەی ژمارەکانیدا بەرهەمی بلاّوکراوەتەوە و لە هیچ یەکێك لە نووسینەکانی بەر لە ژمارەی ١٩دا پیتی (ئـ)ی بەکارنەهێناوە ، لەو شیعرەیدا کە بە ناوی «لوما ژ بلبل»ەوە لە لاپەرە (١٦)ی ژمارەی ناوبراودا چاپی کردووە بۆنووسینی چەند وشەیەك پیتی (ئـ)ی بەکارهێناوە . هەروەها کەمێ دواتریش لە کتێبی «هینکر زمان کوردی» (١٩٢١)دا[٥٢] نیگاری (ئـ) زۆر بەرچاو دەکەوێ ، بەوێنە بروانە : (ل ٦ ، د ٣ ـ «ئـەو ، ئـەمـە») ؛ (ل ١٧ ، د ٤ ـ «ئـەوان») ؛ (ل ١٩ ، د ٣ ـ «ئـەموست») . . . لەکتێبی «کـۆمـەلّـە شیعـری حـاجی قـادری کـۆیی»دا (١٩٢٥)[٥٣] ، (ئـ) تا رادەیەك بەکارهاتووە ، بۆنموونە بروانە : (ل ٣ ، د ١١ ـ

(٥١) ئەو داوەر ئەردەلاّنی‌یەی لە ژمارە (١٨)ی گۆڤاری «ژین»دا ، کە رێکەوتی ٨ی مایسی ١٣٣٥ ، دەکات ، لەژمارە (٧)ی گۆڤاری «کوردستان»یشدا ، کە هەر دیسان لە (٨)ی مایسی ١٣٣٥دا دەرچووە ، وتارێکی بەناوی «هێشتا نـووستوین»ەوە بـلاّوکردۆتـەوە و لێرەشدا هەروەها پیتی (ئـ)ی بەکارهێناوە .

(٥٢) نشریات هیوی جوانا طلبە کوردان ، هینکر زمان کوردی ، چاپخانەی نجم استقبال ، باب عالی ، ابو السعود ، ١٩٢١ .

(٥٣) عەبدولرەحمان سەعید ، کۆمەلّە شیعری حاجی قادری کۆیی ، بەغدا ، ١٩٢٥ .

(٥٤) لاوانی کورد ، رەووشت و خوو ، بەغدا ، ١٩٢٧ .

«ئەمش») ؛ (ل ٣ ، د ١٠ ـ «ئەوی») ؛ (ل ٣ ، د ١١ ـ «ئەخواست ، ئەم») . . .
لـە کتێبی «رەوشت و خوو» دا (١٩٢٧)[٥٤] ، (ئـ) پتر رەچاوەکـراوە ، بۆنمـوونە
بڕوانە : (ل ١ ، د ٤ ـ «ئەوی ، ئەگەر») ؛ (ل ١ ، د ٧ ـ «ئەکەیت») ؛ (ل ٤ ، د
٧ ـ «دائەمێنێ») . . .[٥٥] لەگەڵ ئەوەشـدا هەنـدێ کتێبی ئەوتـۆ هەن کـە دوای
ئەوانەی باسمان کردن ، چاپ کراون و کەچی (ئـ) یان تێدا بەدی ناکرێ ، وەك

---

(٥٥) وەك نیشانمان دا نیگاری (ئـ) لە سـاڵی (١٩١٩)ەوە پەیدابووە ، کەچی د . نەبەز وای داناوە کە لە دوای ساڵی (٥٠)ەوە داهاتووە . بەم بۆنەیەوە نووسیوێتی : «لە (١٩٥٠) بـەدواوە توانرا ئەم ئەلفوبێ (عەرەبی ـ فارسی)یە دەستکاری کراوە سەربەستتر بەکاربهێنرێ . . . هەر لەم کاتەدا هێندێ دەستوور بۆ نووسینی ئەو تیپە دەنگدارانە دانران کە لە سەرەتای وشەوە دێن . ئەوەش بەهۆی یارمەتی (هەمزە) و تیپە دەنگدارەکانەوە . وەك (ئاسمان) لەجیاتی (آسمان) یا (اسمان) و (ئەمە) لەجیـاتی (امە) و (ئێمـە) لە جیـاتی (ایمە) . . . دەنووسران» (زمـانی یەکگـرتووی کـوردی ، بامبێـرگ ، ١٩٧٦ ، ل ٨١) . با بـاسی ڕۆژنامەی «ژین»ی ساڵی نۆزدە و ئەو کتێبانەی ساڵی بیست نەکەین کە ئێمە بەڵگەمان لێوە هێناونەتەوە ، خۆ گۆڤاری «گەلاوێژ» کـە گـۆڤـارێکی ئێجگار نـاسراوە و بـەر لە سـاڵی (٥٠)ش دەرچووە ، پیتی (ئـ)ی زۆر تێدا بەکارهێنراوە . ئیتر تێناگەم بۆ د. نەبەز هێندە سەرپێیی بەسەر ئەو باسەدا تێپەڕیوە . . . لەمەش سەرنج ڕاکێشتر ، ئەوەیـە کە لـە کۆتایی باسی (هەمزە)دا دەڵێ : «هەمزە بەکارهێنان ، لەم شوێنانەدا بەزۆری بە هەوڵ و تەقەلای مامۆستا عەلائەدین سەجادییەوە هاتە بەرهەم» (ل ٨١) . . . نیگاری (ئـ) کە لە ساڵی (١٩١٩)ەوە لە نووسینی کوردیدا هەبووبێ ، ئیتر مامۆستا سەجادی دەبێ دەوری لە دانانیا چی بووبێ ؟ . سەرەڕای ئەوە مامۆستا سەجادی خۆی لە وتاری (دانانی نیشانەکانی پیتی کوردی ، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ» ، ژ ١٢ ، سـاڵی ، ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١١ ـ ١٨)دا ، ئەوەی وتووە کە قاڵبی چوار پیتی (ۆ ، ێ ، ڕ ، ڵ)ی بۆ چاپخانە هێناوە و لەم کارەدا مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدیش بەشدار بووە . جا بەمەدا دەردەکەوێ :
١ ـ مامۆستا سەجادی بە هاریکاری مـامۆستـا ئیبراهیم قـاڵبی هێناوە ، دەنـا فکرەی جیاکردنەوەی ئەو نیگارانە زۆر زووتر هەبووە .
٢ ـ لەنێو ئەو پیتانەدا نیگاری (ئـ) نەبووە .
بێ گومان د. نەبەز بەرلەوەی ئەو مێژووە دیـاری بکا ، دەبـوو کەمێـك ئاوڕ لـە نووسینی کوردی و ئەوەی دەربارەی ئەلفوبێی کوردی نووسراوە ، بداتەوە . دیارە ئـەو جۆرە خەملاندنە نەك هەر لە زانستدا جێی نابێتەوە ، بەڵکو ڕاستیش دەشێوێنێ .

«پێشـوای ئایـین» (١٩٢٧)[٥٦] . . . بەڵام ئـەمە هیـچ لە مـەسـەلـەی سەرەتـای پەیدابوونی ئەو نیگارە ناگۆڕێ[٥٧] .

بـەر لە پـەیـدابـوونی وێـنـەی هـەمزە ، وشـەکـانی وەك : (ئـەشکێنێ ، هەڵئەکـوتێتە ، ئـەکا ، ئـەکەن ، ئـەوانیان ، ئـەوەی ، ئەدەین ، ئـەهێنین ، ئەیاندا . . .) ، (ئە) یان تێدا بە (ا) دەنووسرا ، وەك : (اشکێنێ ، هەڵاکوتێتە ، اکـا ، اکـەن ، اوانیـان ، اوەی ، ادەین ، اهێـنـین ، ایـانـدا . . .) . بــەڵام سەرنج ڕاکێش ئەوەیە لە ژمارە ١٦[٥٨] و ١٧[٥٩] ی ڕۆژنامەی «تێگەیشتنی ڕاستی»دا بەناوی «نطق عالیکی اجتماعی کورەی کوردان بو رؤسای عالی قدر کردان» ەوە هەیە ، کە ئەو وشانەی ناومان بردن بەو چەشنەی خوارەوە نووسراون تێیدا : (ژ ١٦ ، ل ١ ، س ١ ، د ٧ ـ «أەشکینی») ؛ (ژ ١٦ ، ل ١ ، س ١ ، د ٨ ـ «هل أەکوتیتە») ؛ (ژ ١٦ ، ل ١ ، س ١ ، د ٩ ـ «أەکا») ؛ (ژ ١٦ ، ل ١ ، س ٢ ، د ١ ـ «أەکن») ؛ (ژ ١٧ ، ل ١ ، س ١ ، د ٤ ـ «أەوانیان») ؛ (ژ ١٧ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٢ ـ أەدەین) ؛ (ژ ١٧ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٠ ـ «أەهینن») ؛ (ژ ١٧ ، ل ١ ، ل ١ ، س ٢ ، د ١ ـ «أەیاندا») . . .

ئەم جۆرە نووسینە بۆ یەکەم جار لە وتاری ناوبراودا دەبینرێ . هەرچەند ئەمە زۆر بڵاونەبووەوە و پەرەی نـەسەنـد[٦٠] ، بەڵام لـەگەڵ ئـەوەشدا دەتـوانرێ بـە

---

(٥٦) حسەین حوزنی موکریانی ، پێشوای ئایین ، ڕەاندز ، ١٩٢٧ .

(٥٧) بەڕاستی جێی سەرنج و داخە کە باسی ئەم دیاردە گرنگەی ڕێنووسی کوردی بـە هیچ چەشنێك لە کتێبی «ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ڕیشەوە»دا نابینرێ .

(٥٨) «تێگەیشتنی ڕاستی» ، ژ ١٦ ، ٢٣ی شوباتی ١٩١٨ ، ل ١ ـ ٢ .

(٥٩) «تێگەیشتنی ڕاستی» ، ژ ١٧ ، ٢٦ی شوباتی ١٩١٨ ، ل ١ ـ ٢ .

(٦٠) نیگاری (أە) بەتایبەتی لەم کتێبانەی خوارەوەدا بەرچاومان کەوتوون :

أ ـ دیاری مەلا محەمەدی کۆیی ، نشریات زار کرمانجی ، ڕەواندز ، ١٩٢٧ . بەوێنە ، بڕوانە : (ل ٢ ، د ٨ ـ «اەکەم») ؛ (ل ٣ ، د ٨ ـ «اەبێ») . . .

ب ـ حسین حوزنی موکریانی ، پێشوای ئایین ، ڕەواندز ، ١٩٢٨ . بەوێنە ، بڕوانە : (ل ٢ ، د ٦ ـ «اەو») ؛ (ل ٣ ، د ٦ ـ «اەم») . . .

ج ـ بەشیر مشیر ، سیپارەی حەقپەرستی ، بەغدا ، ١٩٣١ . بەوێنە ، بڕوانە : (ل ٢ ، د ٣ ـ «اەفەندی») ؛ (ل ٥ ، د ٣ ـ «أەژین») . .

هەنگاوێك دابنرێ بەرەو پەیدابوونی (ئە) ، بەتایبەتی چونکە بەر لەو وتارە لە هیچ چاپەمەنی یەکی دی کوردیدا ئەوە نابینرێ کە بەدوا هەمزەدا کورتە بزوێنی (ە) نووسرابێ .

نیگارێکی نوێی دی دوو واو نووسینە بۆ دەنگی بزوێنی (وو) . ئەم وێنەیە لە کتێبی «کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی»[61] و «قانوونی هەڵبژاردن»دا[62] ، کە هەردووکیان لە ساڵی ١٩٢٥دا بلاوکراونەتەوە ، دەبینرێ . بۆنموونە لە کتێبی یەکەمدا ، بروانە : (ل ٣ ، د ٢ - «دوو») ؛ (ل ٣ ، د ١٢ - «تاوەکوو») ؛ (ل ١ ، د ١٦ - «دوور») . . . لە کتێبی دووەمدا ، بروانە : (ل ١ ، د ٥ - «قانوون») ؛ (ل ٢ ، د ٤ - «محکووم») ؛ (ل ٢ ، دوادێر - «دووهەمینیش») . . . دواتریش لە کتێبی «رەووشت و خوو»دا (١٩٢٧)[63] بەکارهاتووە . بۆنموونە ، بروانە : (ل ٧٠ ، د ٩ - «توورەیی») ؛ (ل ٧٠ ، د ١٤ - «سووك») ؛ (ل ١٢٠ ، د ٩ - «دوو») . . .[64]

وەك وتمان نیگاری (ە ، ی ، و) بۆ سەر و ژێر و بۆر لە ساڵی ١١٩٩ ك - ١٧٨٤/١٧٨٥ زایینەوە سەری هەڵداوە و وردە وردە گەشەی کردووە و لە چاپەمەنییەکانی ساڵانی بیستی ئەم سەدەیەدا پەرەی سەندووە . بەدوا ئەمەدا لە ساڵی ١٩١٩دا بۆ یەکەمجار بۆ هەمزە نیگاری (ئـ) و بۆ لامی قەڵەو (ڵ) بەکارهاتووە . ساڵی ١٩٢٥یش دوو واو بۆ نیشاندانی دەنگی بزوێنی (وو)ی درێژ پەیدابووە .

بەمچەشنە تا پەیدابوونی کتێبی «مختصر صرف و نحوی کوردی» ی مامۆستا سەعید صدقی کابان (١٩٢٨)[65] و «دەستووری زمانی کوردی»ی مامۆستا تۆفیق وەهبی (١٩٢٩)[66] گۆڕانێکی کەموسست بەسەر ئەلفوبێی عەرەبی دەستکاریکراودا هاتووە . ئەو گۆڕانەش بەزۆری وەنەبێ بە نووسین باس کرابێ ،

---

(٦١) سەرچاوەی ناوبراو ، عەبدولرەحمان سەعید ، کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی .

(٦٢) قانوونی هەڵبژاردن ، بەغدا ، ١٩٢٥ .

(٦٣) لاوانی کورد ، رەوشت و خوو ، بەغدا ، ١٩٢٧ .

(٦٤) بەڵێ جێی رەخنەیە ، کە مامۆستا نەریمان بە هیچ کلۆجێك لەبارەی پەیدابوونی ئەو پیتەوە نەدواوە .

(٦٥) سەعید صدقی ، مختصر صرف و نحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ .

(٦٦) تۆفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جزمی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ .

بەڵکوو تەنیا پرۆتسیسێکە لە دەستنووس و گۆڤار و کتێبی کوردیدا بەدەردەکەوێ .
بەڵام کاتێ زانایانی کورد کەوتنە سەر دانانی کتێب لەبارەی ڕێزمانی کوردییەوە ، ئەوە بێگومان لە سەرێکەوە گیروگرفتی ئەلفوبێکە و لە سەرێکی دیشەوە پێوەندی باسی ڕێنووس بە لێکۆڵینەوەکەیانەوە ، بۆتە هۆی ئەوەی لەو کێشەیە بدوێن .

ماموّستا سەعید صدقی کابان لە سەرەتای کتێبەکەیدا دەڵێ : «دەبێ بزانین ئەو حەرفە هیجایانەی کە لە کوردیدا لە عەمەل دێنرێن و کەلیمەیان لێ دروست‌دەبێ چەندن و چین ؟ ئەو حەرفانە (٢٨) حەرفی هیجای عەرەبی و (٨) حەرفی‌ترن کە غەیرە عەرەبین و ئەمانەن : (پ ، چ ، ژ ، ڤ ، گ ، ڵ ، و ، ی)[٦٧] . کەوابوو حەرفانی هیجای کوردی (٣٦) حەرفن»[٦٨] . . . «ئەو هەشت حەرفانە کە عەرەبی نین شکڵێکی جوێ‌یان نییە ، ئەمما بەعضێکیان بە نوقطە زیاد و بەعضێکیان یا بە تێفکرینێکی کەم و یا بە دانانی (٧) لەسەریان جوێ‌دەکرێنەوە . ئەوانەی کە بە نوقطەی زیاد جوێ‌دەکرێنەوە حەرفانی (پ ، چ ، ژ ، ڤ ، ڵ) کە بە سێ نوقطە لە (ب ، ج ، ز ، ف ، ل) و ئەوانەی کە بە تێفکرینێکی کەم و یا بە ئیشارەتی (٧) جوێ‌دەکرێنەوە (و)ی کراوە ، (ی)ی خوارە لە (و)ی گوشراو و (ی)ی ڕاست جوێ‌دەکرێنەوە»[٦٩] [٧٠] .

ئەو هەشت پیتە ناعەرەبییەی ماموّستا سەعید صدقی لێیان‌دواوە ، پێشتر نیشانمان‌داوە ، کە (پ ، چ ، ژ ، ڤ ، گ) زۆر لەمێژە بەکارهێنراون . لامی قەڵەویش ، وەك باسمان‌کرد لە ساڵی ١٩١٩ ەوە نیشانەی بۆ دانراوە[٧١] . بەو پێیە دەمێنێتەوە (ێ) و (ۆ) . هەرچی ئەو دوو پیتەیە ڕەنگە زانایانی ساڵانی بیست لەنێو

---

(٦٧) هەرچەندە لێرەدا نووسەر چوکڵەی لەسەر (ۆ) و (ێ) دانەناوە ، بەڵام دوو دێر خوارتر کە تێکرای پیتەکانی ڕیزکردووە ، نەك چوکڵە بەڵکو ژمارەی (٧)ی لەسەر (ۆ) و (ێ) داناوە . بێگومان ئەمەش بەهۆی نەبوونی ئەو نیشانانەوە بووە لەچاپخانە ، هەر بۆیەش لە سەرپاکی کتێبەکەدا نە سێ خاڵی سەر (ل)و نە چوکڵەی سەر (ی) و (و) نابینرێن .

(٦٨) سەرچاوەی ناوبراو ، سەعید صدقی ، مختصر صرف و نحوی کوردی ، ل ٣ .

(٦٩) هەمان سەرچاوە ، ل ٤ .

(٧٠) بێگومان باس‌نەکردن و ناونەبردنی دەوری ماموّستا سەعید صدقی کابان کەلێنێکی گەورەیە لە کتێبی «ڕێنووسی کوردی لەڕەگە و ڕیشەوە»دا .

(٧١) هەرچەندە ئەو نیشانەیەی سەر لامی قەڵەوی ساڵی ١٩١٩ ، چوکڵەیەو ئەوەی ماموّستا

خۆیاندا قسەیان لێوە کردبێ ، بەڵام ئەمە ڕێگە لەو ڕاستییە ناگرێ ، کە بە نووسین و لەسەر لاپەڕەی کتێب بۆ یەکەم جار لەلایەن مامۆستا سەعید صدقی یەوە باس کراوە و نیشان دراوە[72] .

پاش تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی مامۆستا سەعید صدقی کاباندا کتێبی « دەستووری زمانی کوردی » ی زانای گەورە و مەزنی کورد مامۆستا تۆفیق وەهبی لە چاپ درا[73] . نووسەری ئەم کتێبە گەلێك فراوانترو زانستییانەتر لە نووسەری کتێبی « مختصر صرف و نحوی کوردی » ، لە نیگاری دەنگەکانی کۆڵیوەتەوە . شایانی باسیشە کە توانیوێتی بەرهەمەکەی بەو ڕێنووسەی دایناوە چاپ بکا .

هەرچەندە لەم کارەی مامۆستا وەهبی دا هەندێ وێنەی دەنگ شێوەیان لەبار نییە ، بەڵام پێویستە ئەو ڕاستییە لەیاد نەکەین کەوا ئەمە یەکەم جارە لە مێژووی نووسینی کوردیدا بە ئەلفوبێی عەرەبی دەنگەکانی کوردی وا ڕێکوپێك دەست نیشان بکرێن .

نووسەر لە تێکرای دەنگە بزوێنەکان دواوە و وێنەی بۆ هەموویان داناوە . بۆ نموونە واو کەشیدەیەك لەسەری کردۆتە نیگاری دەنگی (ۆ ـ o) . (ی ـ چوکڵەیەك

---

= صدقی سێ خاڵە ، بەڵام لە ناوەرۆکدا جیاوازییان نییە . ئەگەرچی لەئەنجامدا بۆ لامی قەڵەو چوکڵە جێگیر بوو و سێ خاڵ وازی لێ هێنرا بەڵام ماوەیەك سێ خاڵ بڵاوبووەوە و لە گەلێك چاپەمەنیدا بەکارهێنرا . بۆ نموونە بڕوانە : کتێبی « هۆنراوەی کوردی » ، کە حاجی مەلا ڕەسووڵ زادە مەلا مستەفای سەفوەت پێکیەوە ناوە و لە مانگی گوڵانی (١٩٣٥) دا لە چاپخانەی « ژیان » ی سلێمانی چاپی کردووە (ل ١ ، د ٨ ـ « کۆمەڵە ») ؛ (ل ١ ، د ١٧ ـ « گوڵ ») . . یان ع . و . نووری ، پیرۆزیی منال ، سلێمانی ١٩٤٠ ، چاپخانەی « ژیان » (ل ١ ، د ١ ـ « منال ») ؛ (ل ١ ، د ٢ ـ « هەڵاتنی ») . . و هەندێکی تر .

لە هەندێ چاپەمەنیی ئەو ساڵانەدا بۆ دەربڕینی واوی کراوە ، نیشانەی سێ خاڵ هەروەها لەسەر پیتی (و) دانراوە . بۆنموونە ، بڕوانە : گۆڤاری « زاری کرمانجی» ، ژ ٣٤ ، ساڵی ٧ ، ٢٣ ی تەمووزی ١٩٣٢ (ل ١ ، س ١ ، د ٩ ـ « کۆش») ؛ (ل ٣ ، س ١ ، د ١١ ـ « جۆگە ») . . .

(٧٢) بە مەرجێك ئەوەی لە ئەلفوبێکەی (ژین)ی ئەستەموولدا هەیە حیساب نەکرێ .

(٧٣) سەرچاوەی ناوبراو ، تۆفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی .

لەسەری) بۆ دەنگی (یٚ ـ e) داناوە . بۆ کورتە بزوینی (i) کە تا ئیٚستا لە ئەلفوبیٚی عەرەبی دەستکاری کراودا ویٚنەی نییـە ، ئەم (ی ـ دوو خـاڵ لەژیٚـری) کردۆتـە ویٚنەی . دوو (و) ی بۆدەنگی بزویٚنی دریٚژی (u:) و دوو (ی)ی بۆ دەنگی بزویٚنی (ی)ی تیژ پەسەند کردووە . . . لەگەڵ بزوینەکاندا باسی هەندیٚ دەنگی دیفتۆنگی کردووە و نیگاری بۆ کیٚشاون .

کەم و کورتی ویٚنەی دەنگە بزویٚنەکانی ئەو نووسراوە لەوەدایە :

١ ـ ویٚنەی (وَ) کە بۆ دەنگی (وَ ـ o) ی داناوە لە دوو ڕووەوە ناگـونجیٚ : یەك ـ لەبەرئەوەی کەشیدەی سەر واوەکە لە سەر (فتحە) ی عەرەبی دەچیٚ ، هیٚندیٚ گیـروگـرفت پـەیـدا دەکـات ؛ دوو ـ کـەشیـدە پـتر بـۆ نیشـانـەی دریـٚژی دەستدەدات ، بەڵام ئەو دەنگەی لیٚی دەدویٚین کراوەیە . بەویٚیە دانـانی ویٚنـەی (وَ) بۆ دەنگی (وَ ـ o) لـەڕووی ڕوخساریش و نـاوەرۆکیشەوە لـەبار نییە[74] .

٢ ـ (یـ) بۆ کورتە بزویٚنی (i) لە ڕووی شیٚوەوە ناڕیٚکە و لە ڕووی بەکـارهیٚنانـەوە زەحمەتە .

٣ ـ دانـانی دوو پیتی واو بـۆ دەنگی (u:) ج لـە ڕووی زمـانـەوانی و ج لـە ڕووی بەکارهیٚنانەوە ناڕاستە . واتە دانانی دوو پیت بۆ یەك فۆنیٚم ڕاست نییە و هەروەها دانانی چوکلە ئـاسانـتر و خیٚراتـرە لە نـووسینی پیتیٚکی سەرلـەبەر. . . هـەر بەوچەشنەش بەکارهیٚنانی دوو پیتی (ی) بۆ دەنگی (i:) تیژ باش نییە .

٤ ـ لەو ئەلفوبیٚیەدا بۆ دەنگی بزویٚنی (u) و کۆنسۆنانتی (W) یەك نیگار هەیە ، کە ئەویش (و) ە . هەر بەوجۆرەش بۆدەنگی بزویٚنی (i:) و کۆنسۆنانتی (y) یەك پیت دانراوە ، کە ئەویش (ی)یە . بیٚگومان بەکارهیٚنانی یەك نیگار بۆ دوو دەنگی

---

(٧٤) هەندیٚ بەڵگە وادەگەیەنن ، کە مامۆستا وەهبی لە دانانی چەند نیشانەیەکدا سوودی لە ئـەلفـوبیٚی عـەرەبی ـ تـورکی دەستکـاری‌کـراو وەرگـرتبیٚ . بـۆنمـوونـە نیگـاری (و ـ کەشیدەیەکی لەسەر) کە بۆدەنگی (وَ ـ o)ی داناوە ، بە ماوەیەکی زۆر بەر لە بڵاوبوونەوەی کتیٚبی «دەستووری زمانی کوردی» ، لە چاپەمەنیی تورکیدا بە هەمان شیٚوە و بۆ هەمان مەبەست بەکارهیٚنراوە . بەویٚنە بڕوانـە : (ش . سامی ، قاموس ترکی ، استمبول ، ١٣١٧ هـ) .

جیاواز بە کەم و کورتییەکی گەورەی ئەلفوبێکە دادەنرێ . . . بەداخەوە ئەم کێشەیە تا ئەمڕۆش هەر بەردەوامە و هێشتا هیچ چارەیەکی بۆ نەدۆزراوەتەوە .

ئەوەی لە باسی پیتە کۆنسۆنانتەکاندا شایانی باس بێ ، ئەوەیە کە مامۆستا وەهبی (ر)ی قەڵەوی لە (ر)ی لاواز و (ل)ی قەڵەوی لە (ل)ی لاواز جیاکردۆتەوە . نیشانەی جیاکردنەوەکەش دانانی خاڵێکە کە بۆ (ر)ی قەڵەو لەژێردا و بۆ (ل)ی قەڵەو لەسەرەوە دایناوە[75] .

سەرەرای ئەوە نووسەر دیسان بە خاڵێك (ت)ی کلۆری (کە ئەو «ت»ی سووکی پێ وتووە) لە (ت)ی ئاسایی و (د)ی کلۆری لە (د)ی ئاسایی جیاکردۆتەوە . نیشانەی جیاکردنەوەی ئەمانیش دانانی خاڵێکە لەژێردا بۆ کلۆرەکان .

لە بەراوردکردنی دوو وێنەی (ر) و (ل) لەگەڵ (د) و (ت)دا دەردەکەوێ :

١ - لە کۆمەڵی یەکەم - واتە (ر) و (ل) - دا خاڵ بۆ قەڵەوەکانیان دانراوە ، کەچی لە کۆمەڵی دووەم - واتە (د)و (ت)دا سووکەکانیان خاڵیان وەرگرتووە .

---

(٧٥) نووسەری کتێبی «رێنووسی کوردی لە رەگە و ریشەوە» لە باسی ئەو وێنانەدا کە نووسەری کتێبی «دەستووری زمانی کوردی» بۆ دەنگە بزوێنەکان و کۆنسۆنانتەکانی داناوە ، تووشی چەند هەڵەیەك بووە :

أ - مامۆستا نەریمان وای نیشانداوە ، کە مامۆستا وەهبی بۆ کێشانی وێنەی دەنگی (ۆ-O) ، حەوتێکی لەسەر پیتی واو داناوە . . . تەماشاکردنێکی سەرپێی کتێبی «دەستووری زمانی کوردی» ، ئەوە دەردەخا کە مامۆستا وەهبی نەك هەر بۆ ئەو جۆرە واوە ، بەڵکو بۆ هیچ چەشنە واوێك حەوتی بەکارنەهێناوە . هەرچی نیگاری واوی کراوەشە لای مامۆستا وەهبی بە (واوێکی کەشیدە لەسەر) دەنووسرێ .

ب - مامۆستا وەهبی دوو واوی کردۆتە وێنەی دەنگی بزوێنی (وو- ū)ی درێژ ، کەچی مامۆستا نەریمان دەڵێ (واو کەشیدەیەك لە سەری) کردۆتە نیگاری ئەو دەنگە .

ج - مامۆستا نەریمان نە باسی ئەوەی کردووە ، کە مامۆستا وەهبی دوو (ی)ی بۆ دەنگی (ی)ی تیژ پەسەندکردووە و نە لەوە دواوە کە بۆ نیشانانی دەنگی (ڵ) خاڵێکی لەسەر (ل) داناوە .

د - نووسەری کتێبی «رێنووسی کوردی لە رەگە و ریشەوە» کاتێ دەربارەی جیاکردنەوەی (ر) و (ڕ) دەدوێ لە کتێبی «دەستووری زمانی کوردی»دا ، هەڵەیەکی گەورەی کردووە کە بە (ڕ)ی قەڵەوی وتووە : «(ر)ی گیرەدار (مشدد)» (ل ٢٠) .

٢ - سێ [illegible] (ر) و (د) و (ت) خاڵ خراوەتە ژێریان ، بەڵام بۆ (ل) لەسەرەوە دانراوە .

هەرچەندە بەڵگە بۆ بەشێك لەو جیاوازییانە هەیە ، بەڵام هەندێ حاڵەتیش جێگەی سەرنجە . بەوێنە دیارە کە لەسەر (ت) دوو خاڵ هەیە و ناکرێ خاڵێکی دیشی بخرێتە سەر ، یان ئەگەر خاڵ لەسەر (ر) دابنرێ دەبێتە (ز) . . . بەڵام رەنگە چاکتر وا بووایە کە نیشانەی خاڵ بۆ هەموو پیتە سووکەکان بوایە یان بەپێچەوانەوە بۆ قەڵەوەکان بوایە ، نەك جارێك نیشانەی سووکی بێ و جارێك نیشانەی قەڵەوی .

سەرەڕای ئەوە ، هەرچەندە راستە لە شێوەی سلێمانیدا (د)و (ت) کلۆردەکرێن ، بەڵام راست نییە ئەمە لە زمانی ئەدەبیدا رەنگ‌بداتەوە . بەڵێ ئەو دوو نیگارە لە لێکۆڵینەوەی فۆنەتیکی شێوەی سلێمانیدا پێویستن ، بەڵام نابێ بهێنرێنە رێنووسی گشتی کوردییەوە .

ئەم جۆرە کەم و کورتییانە و هەندێکی دیکە لە نووسراوی ناوبراودا بەدیدەکرێن . بێگومان ئەمانە بایەخی کاری شاسواری زمانناسی کوردی کەم‌ناکەنەوە و پێویستە ددان بەوەدا بنێین کە مامۆستا وەهبی لە گەشەپێدانی رێنووسی کوردیدا بەم بەرهەمەی شۆڕشێکی بەرپاکردووە[٧٦] .

---

(٧٦) وەك هەموو دەزانین و وەك لەسەرەوە لێی دواوین و وەك مامۆستا تۆفیق وەهبی خۆی لە لاپەرە (٨٧)ی وتاری (حول مقال مسؤلية الاديب الكردي الكبرى ، للاستاذ عبدالمجيد لطفي ، گۆڤاری «پەروەردە و زانست» ، ژ ٥ ، ساڵی ٣ ، ل ٨١ - ٩١)دا باسی کردووە ، لە کتێبی (دەستووری زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٩)دا هەوڵی داوە لەرێی هەندێ دەستکارییەوە ئەلفوبێی عەرەبی بۆ نیشاندانی ئەو دەنگە کوردییانەی لە عەرەبیدا نین ، بسازێنێ . . . ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەتە د. نەبەز نەك هەر ناوی ئەو کارە مەزنەی نەبردووە ، بەڵکو واشی لەقەڵەم داوە ، کە مامۆستا وەهبی لە نامیلکەی (خوێندەواریی باو ، بەغدا ، ١٩٣٣)دا ئەم هەوڵەی داوە . بەم بۆنەیەوە د. نەبەز نووسیویتی : « . . . وەهبی لە ساڵی ١٩٣٣دا کتێبێکی ئەلفوبێی بە تیپی عەرەبی دەستکاری کراو بە نێوی (خوێندەواریی باو)ەوە لە بەغدا لەچاپدا . . . »(زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، =

سالێك بەسەر بڵاوبوونەوەی کتێبی «دەستووری زمانی کوردی»ی مامۆستا تۆفیق وەهبی دا تێپەڕیبوو ، مامۆستا مەعروف جیاوك بە ناوی «بەرگی ئیملای کوردی» یەوە نامیلکەیەکی لەچاپدا[77] . نووسەر لەم کارەدا پتر دەربارەی جۆری دەنگەکان و شوێنی دەربڕینیان دواوە . سەربارەت بە ڕێنووسی کوردی و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی هیچ شتێکی نوێی وای پێشنیار نەکردووە کە شایانی باس بێ[78] .

لە ساڵانی (٣٠)ەوە دیاردەی دانانی گیرە (ـــ) لەسەر (ر) بۆ نیشاندانی (ڕ)ی قەڵەو پەیدابوو . ئەم شێوە بەکارهێنانە لە هەندێ بەرهەمی ساڵانی (٣٠) و (٤٠)دا دەبینرێ . بەوێنە ، بڕوانە «دیوانی کوردی» ، کە ساڵی ١٩٣١ کوردی و مەریوانی بڵاویان کردۆتەوە[79] : (ل ب ، د ٢٠ ـ «ئەگەرێ» ـ واتە «ئەگەڕێ») ؛ (ل ٣٤ ، د ١٨ ـ «کڕیار») . . . یان لە کتێبی «پیرۆزیی مناڵ»ی ع . و . نووریدا ، کە ساڵی ١٩٤٠ چاپی کردووە[80] : (ل ٤ ، د ٣ ـ «کڕوزانەوەت») ؛ (ل ١٣ ، د ١ ـ «دادڕن») . . . .

شتێکی نوێی دی کە لە ڕێنووسی کوردیدا سەری هەڵدا ، نووسینی دوو (ر) بوو بۆ (ڕ)ی قەڵەو . لە بەدواکەوتندا بۆمان دەرکەوت ، کۆنترین نووسراو ئەمەی

---

= ١٩٧٦ ، ل ٨١) . ئەوەی ئاشکرایە ، نامیلکەی (خوێندەواریی باو) دەربارەی نووسینی کوردییە بە پیتی لاتینی ، نەك عەرەبی . خۆ نامیلکەکە لە لای چەپەوە دەستپێ کراوە و هەموو مەشق و تێکستەکانی پاشکۆش هەر لاتینین . سەرەرای ئەوەش لە وتاری ناوبراوی (حول مقال مسؤولية الاديب الكردي الكبرى . . .)دا مامۆستا وەهبی خۆی دەربارەی نامیلکەی ناوبراو نووسیویتی : «وفي سنة ١٩٣٣ نشرت رسالة بعنوان (خوێندەواریی باو) اى (القراءة الحديثة) وهي عن استعمال الحروف اللاتينية في كتابة اللغة الكردية . . .» (ل ٨٨) . بەداخەوە کاری سەرپێیی د. نەبەز بۆتە هۆی شێواندنی ئەمە و گەلێك ڕاستی دی مێژووی نووسینی کوردی .

(٧٧) مەعرووف جیاوك ، بەرگی ئیملای کوردی ، بەغدا ، ١٩٣٠ .

(٧٨) لە کتێبی «ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ڕیشەوە»دا ، نامیلکەی ناوبراوی مامۆستا مەعرووف جیاوك یادداشت نەکراوە .

(٧٩) کوردی و مەریوانی ، دیوانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٣١ .

(٨٠) ع . و . نووری ، پیرۆزیی منالْ ، سلێمانی ، ١٩٤٠ ، چاپخانەی «ژیان»ی پیرەمێرد .

تێدابێ ، کتێبی «ئەلفوبێی کوردی»ی مامۆستا حامید فەرەجە (١٩٣٦)[٨١] .
ئەگەرچی ئەمە بۆ ماوەیەك پەرەی سەند و هەندێ نووسەر بەکاریان هێنا[٨٢] ، بەلام وەك دواتر لێی دواوین نووسینی دوو (ر) بۆ دەنگی (ر)ی قەلەو لەبار نییە[٨٣][٨٤] .
سەرەرای ئەوە لە کتێبی ناوبراودا نیشانەی سەر (ۆ) و (ێ)ی کراوەو لامی قەلەو . . . نییە و لە پێشەکیدا هیچ ناویان نەبراوە .
مامۆستا ئەحمەدی عەزیز ئاغاش هەر لە هەمان سالدا ئەلفوبێی کوردی بلاوکردەوە[٨٥] . ئەم کتێبەش دیسان وێنەی (ۆ ، ێ ، ڕ ، ڵ)ی تێدا نییە ، بەلام نووسەرەکەی لە پێشەکیدا ئەوەی روون کردۆتەوە کە لەبەر نەبوونیان بووە لە چاپخانە[٨٦] .

مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابان ، کە مەلایەکی پایەبەرزی خەلکی سلێمانی بووە و ماوەیەك مامۆستای (روشدی یە) ی سلێمانی بووە ، لە سەفەربەلگەکەدا چووەتە ئەستەموول و لەوێ ماوەتەوە . لە سالی ١٩٤٢ دا لە نووسینی « مجمع

---

(٨١) حامید فەرەج ، ئەلفوبێی کوردی ، بەغدا ، ١٩٣٦ .
(٨٢) بەوێنە : ع . و . نووری ، لە ولاتی ئادەمیزادە سەربەستەکان ، بەغدا ، ١٩٣٩ (ل ٢ ، د ٦ ـ «شەرر» ؛ (ل ٢ ، د ١٧ ـ باوەرر» ؛ (ل ٦ ، د ٤ ـ «کورر» . . .
(٨٣) بروانە : ئەو باسەی لەم نووسراوەدا دەربارەی رەت کردنەوەی نووسینی دوو (ر) کراوە .
(٨٤) لە لاپەرە (١)ی ژمارە (١)ی سالی (١)ی رۆژنامەی «زبان» (١٩ ی ئەیلولی ١٩٣٧)دا ، لە سەروتاردا کە بە ناوی «نووسینی کوردی» بەوەیە ، سەرپەرشتیکەری رۆژنامەکە پرسیاری (چۆن بنووسین ؟)ی لە نووسەران کردووە .
لە لاپەرە (٥ ـ ٦)ی ژمارە (٩)ی سالی (١)ی ئەو رۆژنامەیە (١٤ ی تشرینی دووەمی ١٩٣٧)دا یەکێك بە ناوی (دانەری ئەلفوبێی کوردی)یەوە ، بەشی یەکەمی وتاری «چۆن بنووسین ؟»ی بلاوکردووەتەوە . نووسەری ئەم وتارە لە باسەکەیدا بۆ جیاکردنەوەی (ر)ی لاواز و قەلەو ریگەی بەکارهێنانی نیشانە یان نووسینی پیتێکی جیاواز بۆ (ر)ی قەلەو رەت دەکاتەوە و نووسینی دوو (ر) پەسەند دەکا .
هەندێ بەلگە وادەگەیەنن کە نووسەری ئەم وتارە مامۆستا حامید فەرەج بێ و نووسەری سەروتاریش مامۆستا صالح قەفتان بێ .
(٨٥) ئەحمەدی عەزیز ئاغا ، ئەلفبای کوردی ، چاپی سێیەم ، بەغدا ، ١٩٣٦ .
(٨٦) هەمان سەرچاوە ، ل أ ـ ب .

البحرين في اقتران النيرين » بووەتەوە[87] . ئەم مەلا گەورەیە سەرەتایەکی لەبارەی نووسینی کوردییەوە بۆ ئەو کتێبەی نووسیوە و بە بیری خۆی هەندێ چارەی بۆ دەربرینی دەنگە کوردییەکان دۆزیوەتەوە . ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەتە ئەم زانایە ئاگاداری ئەو هەوڵ و تەقەلایانە نەبووە بۆ باش کردنی نووسینی کوردی دراون لە کوردستاندا[88] . بەم بۆنەیەوە لە سەرەتاکەیدا نووسیویتی دەڵێ « ئەمە موقەددیمەیێکی مەخصوصە بە مەجمەعول بەحرەینەوە کە نووسیومە تا بە غەڵەط نەخوێنرێتەوە ، چونکە نازانم ئێستەکانێ کە ئیملای کوردی لە سلێمانیدا چۆنە »[89] .

ئەو نیگارە نوێیانەی لەم ڕێنووسەدا دەبینرێن ئەمانەن :

١ ـ وێنە بۆ دەنگی (د) ی کلۆر کە بریتی یە لە دانانی خاڵێك لەژێر پێتی (د) دا .

٢ ـ بۆ دەنگی (ر) ی لاواز خاڵێکی لەژێر پێتی (ر) دا داناوە .

٣ ـ بۆ (ل) ی قەڵەو خاڵێکی لەسەر (ل) داناوە .

٤ ـ بۆ (ی) ی درێژ کەشیدەیەکی لەژێر (ی) دا داناوە .

ئەمانەو چەند وێنەیەکی دی لە ڕێنووسی ناوبراودا دەبینرێن[90]

---

(٨٧) بروانە : مەلا ڕەشید بەگی بابان ، اقتران النیرین في مجمع البحرین (ئامادەکردن و پێشکەش کردن و لەسەر نووسینی : محەمەد عەلی قەرەداغی) ، بەغدا ١٩٧٣ .

(٨٨) بروانە : محەمەدی مەلا کەریم ، هەنگاوێکی تر بە ڕێگای دانانی دەستوورێك‌دا بۆ نووسینی کوردی ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ، ژ ٨ ، ل ٨ ، بەغدا ، ١٩٧٣ .

(٨٩) بروانە : هەمان سەرچاوە ، ل ٨ ـ ٩ .

(٩٠) هەڵە و ناتەواویی نووسەری کتێبی « ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ڕیشەوە » لە باسی نیگارە نوێکانی ڕێنووسی مەلا ڕەشید بەگی باباندا ، ئەمانەن :

أ ـ مامۆستا نەریمان نووسیویتی ، کە مامۆستا مەلا ڕەشید « لەژێر (ڕێی قەڵەو) نیشانەیەکی داناوە » (ل ١٩) . وێڕای ئەوەی نووسەر دیاری نەکردووە کە ئەو نیشانەیە چی یە ـ چوکڵەیە یان خاڵە . . . هەروەها واقیعەکەشی بە هەڵەوگێراوی خستۆتە پێش چاو . ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە نیشانەکە خاڵەو خاڵەکەش بۆ دەنگی (ر)ی لاوازە ، نەك قەڵەو .

ب ـ مامۆستا نەریمان بە هیچ جۆرێك ناوی ئەوەی نەبردووە کە مامۆستا مەلا ڕەشید بۆ (ی)ی درێژ کەشیدەیەکی لەژێر (ی)دا داناوە .

ئەوەی پێویستە پەنجەی بۆ رابکێشین ، ئەوەتە کە لە هەندێ شوێندا ڕێك‌وپێکی یەکی باش دەبینرێ ، بەوێنە دانانی خاڵ لەژێرەوە هەمیشە نیشانەی سووکی یە . بەڵام کە لە سەرەوە بێت ، نیشانەی قەڵەوییە . مامۆستا مەلا رەشید بەپێچەوانەی هەموو نووسەرانی دییەوە بۆ بارە سووکەکەی (ر) نیشانەی داناوە ، ئەمەش ئەو سوودەی هەیە کە لە کێشەی دانان یان دانەنانی نیشانەی (ر)ی قەڵەوی سەرەتای وشە قوتارمان دەکا .

کەم و کورتی دیاری ئەم رێنووسە بەتایبەتی لەوەدایە ، کە بە پێویستی نەزانیوە پیت بۆ ژێر و بۆر دابنرێ و وای بەلاوە پەسەندە کە هەروەك عەرەبی بنووسرێن . بۆ کورتە بزوێنی (ا)ش هەر لەو رایەدایە کە نیشانەی ناوێ .

تێکرا لەو چەند دێرەی دەستووری نووسیندا کە ئەم زانایە نووسیویە نیشانەی زیرەکی بەئاشکرا دیارە . مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم راستی بۆچووە کە لەبارەی ئەم رێنووسەوە دەڵێ : « ئەوەی مایەی داخە ئەم زانایە بۆچ مادەم ئەم توانای وردبوونەوە و تۆژینەوەیەی بووە ، خۆی بە دۆزینەوەو نووسینی دەستووری زمانی کوردی و نووسینی کوردییەوە خەریك نەکردووە . ئەو بەم کارە کەمەی کە تەنها بە مەبەستی بە بێ‌هەڵە خوێندنەوەی دانراوەکەی خۆی بووە تێی گەیاندووین تا چ رادەیەك خاوەن سەرنج و زیرەك و لێ‌هاتوو بووە . جا ئەگەر ئەم کارەی بکردایە بە کاری هەمیشەی خۆی و نەخوازەڵا لە شوێنێکی وەك ئەستەمووڵا کە سەرەرای کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی زانینەکەشی ، مەیدانی ئەوەی بۆ ئەڵوانـد لەبارەی زانستی دەستووری زمان و ناسینی دەنگ و بابەتە پەیوەندیدارەکانی ترەوە گەلێ شت بزانێ ، بێ‌گومان کارێکی گەورەی بۆ نەتەوەکەی بەئەنجام ئەگەیاند »[٩١] .

گۆڤاری « گەلاوێژ » هەلێکی باشی بۆ لێدوان و دەربرینی بیر و باوەر سەبارەت بە رێنووسی کوردی هەڵخست . بەم بۆنەیەوە لە پێشکەش‌کردنی یەکەم ژمارەیدا نووسراوە : « یەکێك لەو قۆرتە گەورانەی دێتە رێی نووسیاری کوردی چەشنی نووسین (املا) یە و ئەمە بەراستی شایانی سەرشۆری و تەریق‌بوونەوەیە کە هێشتا چەشنێك نووسینی تایبەتی نییە کە زمانی کوردی پێ بنووسرێ . لەم ژمارەیەی

---

(٩١) بروانە : هەمان سەرچاوە ، ل ١٢

گەلاوێژدا ئەوەندە گوێم نەدایە ئەم قۆرتە ، هەر نووسەرە خۆی چۆنی نووسیبێ هەروا لەچاپدرا . ئەمە مانای ئەوە نییە کە گەلاوێژ ئەیەوێ ئەم حاڵە بەم پشێوی‌یە بمێنێتەوە ، بەپێچەوانەوە یەکێ لە نیازەکانی گەلاوێژ ئەوەیە کە ماوەی تێگەیشتووان و پێگەیشتووە زاناکانی کورد بدات لەم بابەتەوە بیری خۆیان بنووسن ، بەشکوو لەم پاشاگەردانی نووسینە رزگارمان بێ»[92] . . . بەداخەوە ئەم وتارە نووسەرانی کوردی نەبزواند و دەربارەی رێنووسی کوردی شتێکی ئەوتۆیان نەنووسی کە شایانی باس بێت . ئەوەی کە نووسراش تەنیا چەند کورتە وتارێکی سەرپێ‌یی بوو وەك : لە ژمارە (٥ ـ ٦) ی سالی (١)دا مامۆستا ع . بە ناوی « ئیملای کوردی » یەوە وتارێکی بلاوکردەوە[93] ، داوا لە زانایانی کورد دەکا تێیدا

هەوڵ بدەن بۆ دانانی دەستوورێکی رێك وپێك و ئەلفوبێ‌یەکی وا کە کوردیی ئاسان پێ بنووسرێت و رەوان پیێ بخوێنرێتەوە . . . لە ژمارە (٩)ی سالی (٤)یشدا بە ناوی «پرسیاری گەلاوێژ»ەوە دەربارەی زمانی کوردی و چۆنیەتی نووسینی ، پرسیار لە خوێنەرانی کورد کراوە ، کە بە شێوەیەکی راست و زانستی رای خۆیان سەبارەت بە نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی یان لاتینی دەربرن[94] . . . لەژمارە (١١)ی هەمان سالدا وەلامی مامۆستایان : قەدری جان ؛ عەبدولعەزیز خانەقا ؛ مەحموود حەسەن بلاوکراوەتەوە[95] و لە ژمارە (١)ی سالی (٥)یشدا وەلامی مامۆستا

---

(٩٢) بلە ، وتەی پێشکەش کردن ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ١ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٤٠ ، ل ١ ـ ٦ .

(٩٣) ع . ، ئیملای کوردی ، گۆڤاری «گەلاوێژ» ، ژ ٥ ـ ٦ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٤٠ ، ل ١ ـ ٦ .

(٩٤) پرسیاری گەلاوێژ (زمانی کوردی و چۆنیەتی نووسینی) ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ٩ ، سالی ٤ ، بەغدا ، ١٩٤٣ ، ل ٥١ .

(٩٥) أ ـ قەدری جان ، وەرام ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ١١ ، سالی ٤ ، بەغدا ، ١٩٤٣ ، ل ٥٤ ـ ٥٥ .

ب ـ عەبدولعەزیز خانەقا ، جوابی پرسیاری گەلاوێژ ، هەمان ژمارە ، ل ٥٦ .

جـ ـ مەحموود حەسەن ، وەلامی پرسیاری گەلاوێژ ، هەمان ژمارە ، ل ٥٧ .

عوسمان صەبری هەیە[96] و لە ژمارە (٢)دا وەڵامی ع . گۆڤان دەبینین[97] . ئەوەی لێرەدا پێویستە سەرنجی بۆ رابکێشین ، ئەوەیە کە زوربەی زۆری وەڵامەکان نووسینی کوردی بەلاتینی پەسەند دەکەن .

ئەو چەند وتارەی لە گۆڤاری «گەلاوێژ»دا بڵاوکراونەتەوە ، وتاری زانستی نین و گیروگرفتی رێنووسیان چارەسەر نەکردووە ، بەڵکو راوێژ وهەست و خواستن بۆ رزگار بوون لەو قۆرتانەی بووبوونە هۆی چەڵەمەی نووسین و زەحمەتی خوێندنەوە .

وەك پێشتر لێی دواین مەسەلەی داهێنانی هەندێ نیشانە لەسەر یان لەژێر پیتی عەرەبی لە کوردیدا شتێکی کۆنەو لەو ماوەیەدا هەندێ لە خوێندەوارانی کورد لە نووسینی تایبەتی خۆیاندا بەکاریان هێناوە[98] و لەبارەیانەوە وتاریان بڵاوکردۆتەوە[99] .

---

(٩٦) عوسمان صەبری ، پرسیارا گەلاوێژی ، گۆڤاری «گەلاوێژ» ، ژمارە ١ ، ساڵی ٥ ، بەغدا ، ١٩٤٤ ل ٥٨ ـ ٦٠ .

(٩٧) ع . گۆڤان ، نووسینی کوردی بە تیپی لاتینی ، گۆڤاری «گەلاوێژ» ، ژ ٢ ، ساڵی ٥ ، بەغدا ، ١٩٤٤ ، ل ١ ـ ٤ .

(٩٨) بۆنموونە لەو کۆمەڵە دەستنووسەی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای زێوەردا ، کە لە کتێبخانەی کۆڕ پارێزراوە ، هەندێ لەو نیشانانە ئاشکرا بەدی دەکرێن . ئەگەر لەنێو ئەو دەستنووسانەدا تەماشای ئەو فەرهەنگە عەرەبی ـ کوردییەی بکەین ، کە لە ٢٥ ی تەمووزی ١٩٤١ دا لە نووسینی بووەتەوە (بۆ پتر زانیاری لەبارەی فەرهەنگی ناوبراوەوە ، بروانە : د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، وشەی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٧٨) ، ئەوە وێنەی دەنگی (ۆ) ی کراوە و (ێ) ی لار وەك ئەمرۆ چۆنن ، بەو جۆرە دەیانبینین . سەرەرای ئەوە بۆ (ڵ) ی قەڵەو (ل ـ سێ خاڵ لەسەری) کردۆتە نیگار ؛ (ر) ی قەڵەویشی بە نیشانەی (ᵥ) جیاکردۆتەوە . . هەروەها لەم بارەیەوە نووسەر لە کۆتایی فەرهەنگەکەیدا نووسیویێتی ، دەڵێ : «لە خوێندەواران رجای تایبەتی ! . . زبانی کوردی چونکە قەواعیدی ئیملای تەواو نییە ، هەر بەونەوعە ئیملایەی کە مەشهوورە ئەم کتێبەم نووسیوە . زۆرم سەعی کردووە لە بۆ خوێندەواران تەکلیف نەبێ بۆ واوی مەبسوطە و یای مائیلە ئیشارەتی (٧) حەوت لەسەریەوە دانراوە و بۆ رای گەورەش هەتا مومکین بووبێ گیراویم بۆ نووسیوە . ئەگەر لە کەلیمەیەکدا ئەم ئیشارەتانە تەرك کرابوو لوطفەن تەصحیحی بفەرموون . . . » (دەفتەری دووەم ، ل ٢٧٠) .

(٩٩) بەوێنە ، مامۆستا وردی ساڵی ١٩٤٦ لە گۆڤاری «گروگاڵی منداڵانی کورد» دا وتارێکی بە

بەر لە ساڵی پەنجا زۆری ئەو پیتە کوردییە نیشانەدارانە هێشتا نەهاتبوونە جیهانی چاپەوە . بۆیە ئەو کتێبی ئەلفوبێ‌یەی مامۆستا ئیبراهیم ئەمین باڵداربۆ منداڵان ئامادەی کردبوو و «لەلایەن وەزارەتی مەعاریفی ئەو دەمەوە ، لە ساڵی ١٩٤٩ دا بڕیار لەسەر چاپ کردن و خوێندنی درا »[100] . . . « وا بە باش زانرا ، کە کتێبەکە بە دەست‌خەت بنووسرێتەوە ، وە وێنەکانی ڕەسم بکرێت ، ئنجا وەك (کلێشە لە چاپ بدرێت »[101] . . . « پاش ئەم هەموو دەردی سەری‌یە ، لە ساڵی ١٩٥٢ دا ، لە چاپخانەی (نەجاح) لە بەغدا ، بە شێوەی کلێشە چاپ کرا »[102] .

لەو کتێبی « ئەلفوبێ » یەدا[103] سێ پیتی (ۆ ، ێ ، ڵ) وەك نووسینی ئەمرۆ وابوون . هەرچی بۆ دەنگی (ڕ) ی قەڵەویشە دوو (ر) کرابوونە نیگار .

---

= ناوی « دەستووری زمانی کوردی » یەوە بڵاوکردۆتەوە و دەربارەی چۆنیەتی نووسینی کوردی تێیدا ، دەڵێ :

١ ـ واوی کورت دەبێ بە یەك واو بنووسرێ .

٢ ـ واوی درێژ دەبێ بە دوو واو بنووسرێ .

٣ ـ واوی کراوە پێویستە حەوتێکی لەسەر بکرێ .

٤ ـ بۆ گیرە (شدە) ، پێویستە ئەو پیتە دووجار بنووسرێتەوە .

٥ ـ دوو جۆر لام هەیە ـ لاواز و قەڵەو ئەگەر لام لاواز بوو هیچی پێ ناوێ ، بێتوو قەڵەو بێ دەبێ هەشتێکی لەسەر بکرێ .

٦ ـ (ی) سێ جۆرە . یای بێ‌هێز ، یای بەهێز ، دوو (ی) .

بێ‌هێز ، وەك (یاری ، شاری . . .)

بەهێز ، وەك (تێر ، بێزار . . .)

دوو (ی) ، وەك : (جەنگی‌ی ، دەنگی‌ی . . .) .

(گۆڤاری «گرۆگاڵی منداڵانی کورد» ، ژ ٣ ، پووشپەڕی ، ١٣٢٥ / حوزەیرانی ١٩٤٦ ، ل ٣) .

(١٠٠) ئیبراهیم ئەمین باڵدار ، زەنگی کاروانی ڕێنووسی کوردی ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٨٤ .

(١٠١) هەمان سەرچاوە ، ل ٨٤ ـ ٨٥ .

(١٠٢) هەمان سەرچاوە ، ل ٨٥ .

(١٠٣) ئیبراهیم ئەمین باڵدار ، ئەلفوبێ ، بەغدا ، ١٩٥١

نووسەری ناوبراو ساڵی ١٩٥٣ لەسەر هەمان ڕێگەی کلێشە کتێبێکی ئەلفوبێی نوێی بڵاوکردەوە[١٠٤] . ئەگەر چی ئەم بەرهەمەی لە گەلێ بارەوە لەسەر شێوەیەکی پێشکەوتووتر ڕێك خستبوو ، بەڵام لە ڕووی پیتە کوردییەکانەوە جیاوازی لەگەڵ ئەوەی پێشوودا تەنیا ئەوەبوو ، کە لەمدا بۆ دەنگی (ر)ی قەڵەو لەبریتی دوو (ر) ، یەك (ر)ی کردوّتە نیگار .

مامۆستا باڵدار ساڵی ١٩٥٥ یش بە ناوی «ئەلفوبێ بۆ گەورە» ەوە کتێبێکی دەرکرد[١٠٥] . لەم کتێبەشدا هەمان دەستووری ڕێنووسی کتێبی «ئەلفوبێی نوێ بۆ منداڵان» ی بەکارهێناوە .

نووسەر لە ساڵی ١٩٥٦ دا کتێبی «ئەلفوبێی نوێ بۆ منداڵان» ی بە پوختەکراوی بە ئۆفسێت چاپ کردووە[١٠٦] . «لەم چاپە پوختەکراوەدا نووسەر پیتی ڕێی قەڵەوی (گەورەی) بۆ یەکەم جار بە یەك ڕێ نووسی و لەژێریشیا نیشانەیەکی حەوتی دانا (ر) »[١٠٧] .

بەڵام تا ساڵی پەنجاوسێ ئەم نیشانانە بۆ چاپ دانەڕێژ رابوون . خاوەنی گۆڤاری «گەلاوێژ» مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و مامۆستا عەلا ئەدین سەجادی سەرنووسەری هەوڵێکی باشیان بۆ دارشتنی ئەو پیتانە داوە لە چاپدا . بەوبۆنەیەوە ، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد دەڵێ : «ئەوەی ڕاست بێ من خۆم لە دەرهێنانی یەکەم ژمارەی (گەلاوێژ) ەوە مەسەلەی یەکخستنی نووسین و بەتایبەتی نووسینی پیتی (ل ، و ، ی) ی کوردیم وەکو قۆرتێکی گەورە بەرەنگار بوو کەوا بە بێ لابردنی ماوەی پێشکەوتنی خوێندەواری لەناو کورددا زۆر تەنگ و تەسك ئەبێ . بەبیرما هات کە بۆچی تەقەلایەك نەدرێ کە ئەو ئیشارەتی (٧) ی خەڵك لەخۆیانەوە بریاری دانانیان داوە لەسەر پیتی (ل ، و ، ی) پیتی تایبەتی بۆ دانەڕێژ ڕێت لە چاپدا . بۆ ئەم نیازە قسەم لەگەڵ (سەید حسەین عانی) مودیری (مدرسة التفيض

---

(١٠٤) ئیبراهیم ئەمین باڵدار ، ئەلفوبێی نوێ بۆ منداڵان ، بەغدا ، ١٩٥٣ .

(١٠٥) ئیبراهیم ئەمین باڵدار ، ئەلفوبێ بۆ گەورە ، بەغدا ١٩٥٥ .

(١٠٦) ئیبراهیم ئەمین باڵدار ، ئەلفوبێی نوێ بۆ منداڵان ، بەغدا ، ١٩٥٦ .

(١٠٧) بروانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ئیبراهیم ئەمین باڵدار ، زەنگی کاروانی ڕێنووسی کوردی ، ل ٨٨ .

لاهلية) كرد كەوا مەكینەیەكی لاینۆتایپیان هێنابوو . ئەگەرچی ناوبراو بڕیاری‌دا كە بنووسیٚ بۆ ئەمەریكا بۆ هێنانی ئەو پیتانەی لە كوردیدا بەكارئەهێنرێن و دارشتنی پیتی (ل ، ی ، و) بە ئیشارەتی حەوتەوە . بەلاّم هەندیٚ هۆی تایبەتی هەردوو لا و گەرم‌بوونی شەڕ پەكی ئەم تەقەلایەیان خست . دوای ئەمە بە چەند ساڵێك لە كاتێكی بەتەواوی جیاوازدا ئەم قسەیەم لەگەلّ مامۆستا سەجادی كرد كەوا پەیوەندیەكی تەواوی لەگەلّ چاپكاری پەیداكردبوو »[108] . « ئەوەی من ئەمویست لە مامۆستا سەجادی ئەوەبوو كە لەسەر حیسابی خۆی داوا بكات نەك هەر پیتی (ڵ ، ڕ ، ۆ ، ێ) ی بۆ دابرێژن بگرە (ی) یەكی داكشاوی‌دار و . . . ئەوەی ڕاست بیٚ مامۆستا عەلائەدین پێی سەلماندم كە ئەم هەموو پیتانە پێویست نین ، وە ئەم هەموو ئیشارەتانە سەر لە خوێنەوار تێك‌ئەدەن . ئنجا فیكری هەردووكمان هاتە سەر ئەوەی كە تەنیا چوار حەرف هەیە موشكیلە پەیدا ئەكەن (ر ، ی ، ل ، و) وە قەرار وابوو هەریەكە لەمانە بۆ ناسینەوەیان (٧) یكی لەسەر دابنریٚ . وە ئەو ناردی ئەم ئیشارەتانەیان دارشت . . »[109] .

مامۆستا سەجادیش لەم بارەیەوە دەلیٚ : « من لەپێش ئەوەدا كە (مێژووی ئەدەبی كوردی) لە چاپ بدەم بۆ قالبی ئەم چوار نیشانەیە ناردمە لەندەن و قاهیرە ، بەو نیازە كە بیانخەمە دەست و بەوجۆرە كتێبەكەی پیٚ لەچاپ‌بدەم ، داخەكەم فریای ئەو كتێبە نەكەوتن[110] ، هەتا لەم چەندانەدا ڕێكەوت و قالبەكان گەیشتن »[111] . . . « یەكەم شتێك كە بەمانە لەچاپ‌درا رسالەی (ناوی كوردی)[112] بوو »[113] . . . «ئەو سەركەوتنەی كە سەركەوت و هاتە ناوەوە لە

---

(١٠٨) بڕوانە : ب . فرمانی ئێستەمان ، گۆڤاری «هیوا» ، ژ ٩ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ١٧ ـ ١٨ .

(١٠٩) بڕوانە : هەمان سەرچاوە ، ل ١٨ .

(١١٠) چاپی یەكەمی ، كتێبی «مێژووی ئەدەبی كوردی» ، ساڵی ١٩٥٢ لە بەغدا چاپ‌كراوە .

(١١١) بڕوانە : عەلائەدین سەجادی ، ناوی كوردی ، بەغدا ، ١٩٥٣ .

(١١٢) كتێبی «ناوی كوردی» ساڵی ١٩٥٣ لە بەغدا چاپ‌كراوە .

(١١٣) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ب . فرمانی ئێستەمان ، ل ١٢ .

١٩٥٣ دا بوو كه له‌پاش ئه‌و مێژووه به‌ته‌واوی له عاله‌می چاپدا بڵاوبووه‌وه »[١١٤] .

له كۆتایی وشه‌ی « سه‌ره‌تا » ی نـامیلكه‌ی « نـاوی كوردی » (ل ٧) دا ، مامۆستا سه‌جـادی مێژووی ١٩٥٣/٦/١٥ ی دانـاوه . دیاره ئـه‌وه‌ش مێژووی نووسینی ئه‌و سه‌ره‌تایه‌یه ، نه‌ك مێژووی بڵاوبوونه‌وه‌ی نامیلكه‌كه . بێ‌گومان ئه‌و نووسراوه چه‌ند خێرایش چاپ كرابێ ، ده‌بێ یه‌ك دوو مانگێكی هه‌ر پێ چووبێ . . .

جا سه‌رنج ڕاكێش ئه‌وه‌یه كه له هه‌مان مێژوودا ـ واته له مێژووی نووسینی ئـه‌و سه‌ره‌تایه‌دا ـ ژماره (١٩٤) ی گۆڤاری « په‌یام » ده‌رچووه و تێیدا پێنج نیگاری (ۆ ، ێ ، ڵ ، ڕ ، ۆ) به‌كارهاتووه و له پێشه‌كیدا له‌وباره‌یه‌وه وتراوه : « له‌م هه‌فته‌یه‌وه به‌ناوی خوای گه‌وره‌وه ده‌ستمان كرد به تێخستنی چه‌نـد گۆڕینێـك له بـه‌رگ و ناوه‌ڕۆكی گۆڤاره كوردی‌یه‌كه‌مان »[١١٥] . . . له به‌شی « پۆسته‌ی خوێنده‌ران » ی ژماره (١٩٥) یشدا كه ڕێكه‌وتی ٢٢ ی حوزه‌یرانی ١٩٥٣ ده‌كات ، هۆ و چۆنیه‌تی ئه‌و نیشانه نوێیانه باس كراوه و وتراوه : « وه‌كو بـه‌رچاوتـان كه‌وت لـه هه‌فتـه‌ی ڕابوردووه‌وه دیمه‌نی گۆڤاره‌كه‌مان گۆڕی ، به‌ڵام ئێمه به‌وه‌نده ڕازی نابین و زیاتر تێئه‌كۆشین كه ئه‌م گۆڤاره و نووسینی كوردی له‌لایه‌ن خوێنده‌واره‌كانه‌وه له هه‌موو ناحیه‌یێكه‌وه دڵگیر بێ . هه‌ر به‌و نیازه مامۆستا (تۆفیق وه‌هبی به‌گ) له ١٩٢٥ ه‌وه تێئه‌كۆشێ بۆ ڕێك‌خستنی ئیملای كوردی به تیپی عه‌ره‌بی . له‌پاشا نووسه‌ره‌كان و ئه‌دیبه‌كانی‌تری كوردی خه‌ریـك بوون بـۆ ئه‌و ئـامانجـه . له‌پـاش لێكۆڵینـه‌وه و لێدوانێكی زۆر بڕیاردراوه كه‌وا پێویسته هه‌ندێ نیشانه‌ی تایبه‌تی له‌سه‌ر حه‌رفه‌كانی عه‌ره‌بی دابنرێ بۆ ئه‌وه‌ی نووسینی كوردی له‌گه‌ڵ قسه‌پێ كردنیا جووت بێ و ئیلتباس په‌یا نه‌بێ له‌كاتی خوێندنه‌وه‌دا . ئه‌م ته‌قه‌لایه وه‌نه‌بێ هه‌ر له زمانی كوردی‌دا كرابێ ، به‌ڵكو كاربه‌ده‌ستانی زمانه‌كانی تـریش وه‌كوو (پـاكستانی) یـه‌كان كـه‌وا له‌مێـژه‌وه حرووفی عه‌ره‌بی بۆ نووسینیان به‌كارئه‌هێنن ، گه‌لێ نیشانه‌ی تایبه‌تی‌یان خستووه‌ته سه‌ر ئه‌و حه‌رفانه . ئه‌و حه‌رفانه كه پێویست به خستنه‌سه‌ری نیشانه‌ی تایبه‌تین له كوردی (و ، ی ، ل ، ر) ن .

---

(١١٤) بروانه : عه‌لائه‌دین سه‌جادی ، دانـانی نیشانـه‌كانی پیتی كـوردی ، گۆڤـاری «ڕۆژی نوێ» ، ژ ١٢ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١٦ .

(١١٥) په‌یامی تازه ، گۆڤاری «په‌یام» ، ژ ١٩٤ ، ١٥ی حوزه‌یرانی ١٩٥٣ ، ل٣ .

بۆ واوی کورت یەك (واو) ئەنووسرێ ، وەکو : کورت . . . بۆ واوی درێژ دوو (واو) ئەنووسرێ ، وەکو : ژوور . . . بۆ واوی قەڵەو لەجیاتی (٢) ی ئینگلیزی (ۆ) ئەنووسرێ ، وەکوو : بۆن ، زۆر . . .

بۆ واوێك نە قەڵەو و نە درێژ (وَ) ئەنووسرێ ، وەکوو : خوَن شوَن ، جوَن ، نوَن .

بۆ یای کراوە (ێـ ، ـێـ ، ێ) ئەنووسرێ ، وەکوو : لێرە ، فێر ، پێ .

بۆ (لام) ی قەڵەو (ڵـ ، ـڵـ ، ڵ ، ڵا) ئەنووسرێ ، وەکو : بەڵام ، ئاڵا ، باڵ .

بۆ (را) ی قەڵەو ، بەڵام وەکو (رای) مەشدوودەی عەرەبی نا ، (ڕ) ئەنووسرێ . وەکو : جوڕنە ، کڕ ، کەڕ ، بڕیار .

گەلێ تەقەلامان دا کە بەم تەرتیبە لە (قاهیرە) ئەو حەرفانە دابرێژرێن ، بەلام بێبەختی نەیان توانی هەمووی بەتەواوی و بە رێکوپێکی دابرێژن . هەرچۆنێك بوو ئەمە یەکەم هەنگاوە هاویشترا بە هیوای ئەوە کە لە پاشەڕۆژێکی نزیکدا بە هیمەتی دڵسۆز و تێگەیشتووەکانمان کەم و کورتییەکانی نەمێنێ . ئەوجا هەموو کەسێك بە بێتەگەرە ئەتوانێ کوردی بە ڕاست و ڕەوانی بە حرووفی عەرەبی بنووسێ و وچانی تێکەڵ و پێکەڵی نامێنی لە نووسینا . ئیتر با چاوەڕوان بین »[116] [117] .

ئەگەرچی نامیلکەی « ناوی کوردی » و گۆڤاری « پەیام » هەردووکیان لە چاپخانەی مەعاریف[118] چاپ کراون ، بەڵام دیارە بەو پیتە نوێیانە چەند ژمارەیەکی گۆڤاری « پەیام » پێش نامیلکەی « ناوی کوردی » کەوتوون . . . واش دەردەکەوێ کە جگە لە مامۆستا سەجادی و خاوەنی گۆڤاری « گەلاوێژ » ، هەروەها کەسانی تریش لە هەوڵ و تەقەلای ئەو پیتانەدا بەشداری‌یان کردووە . . .

---

(١١٦) بڕوانە : گۆڤاری «پەیام» ، ژ ١٩٥ ، بەغدا ، ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٥٣ ، ل ١٧ ـ ١٨ .

(١١٧) گۆڤاری «پەیام» لە هەندێ ژمارەی دواتردا چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو پیتە نوێیانەی بۆ خوێنەران ڕوون کردووەتەوە . بەوێنە ، بڕوانە : ژ ١٩٧ ، ٦ی حوزەیرانی ١٩٥٣ ، ل ١٣ ـ ١٤ ؛ ژ ٢٠١ ، ٣ی ئابی ١٩٥٣ ، ل ٥ . . .

(١١٨) چاپخانەی مەعاریف یەکەم چاپخانەیە ، کە تێکرای ئەو پیتانەی تێدا پەیدابووبێ . . . لە هەمان سەردەمدا هەندێ چاپخانەی وڵات و هەندەرانیش بەشێکی کەمی ئەو

بەم چەشنە سێ پیتی (ۆ ، ێ ، ڵ) لە جیهانی چاپی کوردیدا پەیدابوون و لە ڕێنووسی کوردیدا جێی خۆیان کردەوە . . . هەرچی (ڕ) ی پێشنیاری مامۆستا سەجادی و (ڕ) ی مامۆستا وەهبی و (رر) ی کەسانیترە ، کێشەی لەسەر بوو ، بەلام ئەمیش کاتێ لە سالی ١٩٥٦ دا وێنەی (ڕ) ی بۆ کرایە نیگار لەلایەن زوربەی خەلکەوە وەرگیرا و رەگی داکوتا . . .

لە ژمارە (٣٣٦) ی گۆڤاری ( پەیام ) دا کە رێکەوتی ١٩ ی مارتی ١٩٥٦ دەکات ئەو پیتە نوێیە دەبینرێ[١١٩] . . وەك پێشتر باسمان کرد مامۆستا ئیبراهیم ئەمین

---

= پیتانەیان هەبوو . بەوێنە لە چاپەمە نییەکانی چاپخانەی کوردستاندا نیگاری (ۆ) دەبینرێ ، یان لەو (انجیلا لوقا) یەی سالی ١٩٥٣ لە بەیرووت چاپکراوە دیسان وێنەی (ۆ) هەیە . . . بەلام زۆربەی زۆری ئەو چاپخانانەی کتێبی کوردیان لێ چاپدەکرا ، تا چەند سالێك دواتریش هێشتا هیچ نیگارێك لەو نیگارە نوێیانەیان نەهێنایوو . بۆنموونە ئەگەر تەماشای ئەو کتێبی قوتابخانانە بکەین کە لە سالانی ١٩٥٥ ـ ١٩٥٦ دا لە چاپخانەی (نجاح) ، (دار الاخبار) ، (زهرا) ، (دار القدس) ، (دجله) چاپکراون هیچ پیتێکی نوێیان تێدا بەدیناکەین . بەوێنە بروانە :

* کتێبی « ئەشیا و سەرەتای سروشت » بۆ سنفی پێنجی ئیبتیدائی ، محەمەد عەلی پشدەری کردوویە بە کوردی ، چاپخانەی نەجاح ، بەغدا ، ١٩٥٥ ـ ١٩٥٦ .
* کتێبی « دەرسی ئەشیا وە مەبادی تەبیعەت » بۆ پۆلی چوارەمی ئیبتیدائی ، عەبدولرەحمان نورجان و شێخ حەسەن نیعمەتوڵلا کردوویانە بە کوردی ، چاپی چوارەم ، چاپخانەی دارولئەخبار ، بەغدا ، ١٩٥٥ .
* کتێبی « حساب و پێوان » بۆ پۆلی شەشەم ، چاپی سێیەم ، چاپخانەی زەهرا ، بەغدا ، ١٩٥٦ .
* کتێبی « خوێندنەوەی کوردی بۆ پۆلی سێیەم » ، عەبدولخالق قوطب کردوویە بە کوردی ، چاپی پێنجەم ، چاپخانەی دارولقودس ، بەغدا ، ١٩٥٥ .
* کتێبی « حساب و قیاسات » ، بۆ پۆلی پێنجەمی سەرەتایی ، فوئاد رەشید کردوویە بە کوردی ، چاپی چوارەم ، چاپخانەی دیجلە ، بەغدا ، ١٩٥٦ .

. . . و هەندێکی تر .

(١١٩) بەوێنە ، بروانە : (ل ٣ ، س ١ ، د ٥ ـ « رێك کە وتوون » ؛ (ل ٣ ، س ٢ ، د ١ ـ « پرۆژەی » ) ؛ ( ل ٥ ، س ١ ، د ٢ ـ « رابوردوودا » ) . . .

باڵدار لە چاپی ساڵی ١٩٥٦ ی کتێبی « ئەلف‌وبێ‌ی نوێ بۆ منداڵان » دا حەوتی لەژێر (ر) دا داناوە[١٢٠] .

وەك پەنجەمان بۆ راکێشا ئەو چوار پیتە نیشانەی (٧) لەسەریان دادەنرا ، بەڵام دوای ماوەیەك بۆ پیتی (ر) ی قەڵەو نیشانەکە خرایە ژێری[١٢١] . ئەمەش دواتر بەتەواوی پەرەی سەند و وای لێ‌هات کە (ر) ی چوکڵە لەسەر نەمێنێ . . . کەچی لەم ساڵانەی دواییدا کۆڕی زانیاری کورد دیسان هێنایەوە کایەوە .

هەرچەندە زوربەی گۆڤارە کوردییەکان بایەخیان بە باسی رێنووسی کوردی داوە و هەریەکەیان بەپێی توانست هەوڵی بۆ چارەسەرکردنی داوە ، بەڵام ئەوانەی پتر دەوریان بینی ، گـۆڤـاری « هیـوا » (١٩٥٧ ـ ١٩٦٣) و « رۆژی نـوێ » (١٩٦٠ ـ ١٩٦١) و « پـێـشـکـەوتـن » (١٩٥٨ ـ ١٩٦٣) و « شـەفـەق » (١٩٥٨ ـ ١٩٥٩) بوون .

لە ژمارەکانی ساڵی (١) ی گۆڤاری « هیوا » دا کۆمەڵێك وتار سەبارەت بە رێنووسی کوردی دەبینرێ[١٢٢] . بەوێنە : مامۆستا ب . بە ناوی « چۆن زمانەکەمان

---

(١٢٠) بروانە لاپەرە ( ٥٤ )ی ئەم کتێبە .

(١٢١) مامۆستا نەریمان کاتێ لە پەیدابوونی نیگاری (ر ـ چوکڵەیەك لەسەری) دەدوێ ، دەڵێ « (قادری فەتتاحی قاضی) یەکەم کەس بووە کە حەوتی لەژێر (رێی گیرەدار)ەوە لەخوارەوە بردوەتە سەرەوەی و چەند کتێبێکی خۆی بەمچەشنە چاپ کردووە » (رێنووسی کوردی لە رەگ و ریشەوە ، ل ٣٤) . . . بەر لە هەر شت ئەگەر تەماشای مێژووی پەیدابوونی پیتی (ر) ی قەڵەو بکەین ، دەبینین لەپێشدا چوکڵەی لەسەرەوە بۆ دانراوەو دوایی هێنراوەتە خوارەوە ، نەك مامۆستا نەریمان وتەنی کە بەپێچەوانەوە دەڵێ : « . . . لە خوارەوە بردوێتە سەرێ » . . . هەرچی یەکەم کەسیشە ، کە کتێبی بەوجۆرە چاپ کردووە قادری فەتتاحی قازی نییە مامۆستا عەلائەدین سەجادییە . مامۆستا سەجادی ساڵی ١٩٥٣ لە کتێبی «ناوی کوردی » دا ئەو پیتەی بەکارهێناوە و قادری فەتتاحی قازی سیازدە ساڵ دوای ئەو بەکاری هێناوە .

(١٢٢) تێکرای ژمارەکانی ساڵی (١) ی گۆڤاری « هیوا » بەر لە شۆڕشی ١٤ ی تەمووز دەرچوون و کۆمەڵێك وتاری باشیان لەبارەی رێنووسی کوردییەوە تێدایە . بەڵام بەداخەوە ژمارەکانی دوای ساڵی یەك کە پاش شۆڕشی تەمووز بڵاوکراونەتەوە ، دەربارەی کێشەی ناوبراو هیچ شتێکی ئەوتۆیان تێدا نییە .

بنووسین » ەوە زنجیرەیەك وتاری نووسیوە[١٢٣] و دەربارەی جۆری لێکۆڵینەوەی ڕێنووسی کوردی تیایاندا دواوە و باسی ئەو مەرجانەی کردووە کە دەبێ لە چاکترین ئەلفوبێدا هەبن . دوای لێکۆڵینەوە لە نووسین بە پیتی عەرەبی و لاتینی ، بە بەڵگەی ڕاست و زانستی ئەوەی نیشانداوە کە ئەلفوبێی لاتینی لەگەڵ زمانی کوردیدا پتر دەگونجێ . . مامۆستا ب . لە ژمارە (٩) یشدا ، بە ناوی « فرمانی ئێستەمان » ەوە وتارێکی بڵاوکردۆتەوە[١٢٤] و باسی پەیدابوونی چوکلەو پیت بۆ دارشتنیان کردووە و ئەو قۆرتانەشی نیشانداوە کە لە ڕێنووسی کوردیدا هەن ، لەبارەی ئەو فرمانانەوە دواوە کە لەسەر شانی خوێندەوارانن . . . مامۆستا زەکی هەناری لە ژمارە (٧)دا باسی ئەو (د)ە دەکا کە لە ناوچەی سلێمانی کلۆر دەکری و نیشانی دەدا کە ئەمە نابێ لە زمانی ئەدەبیدا ڕەنگ بداتەوە[١٢٥] . لە ژمارە (٨)دا مامۆستا م . م . دەربارەی وێنەی هەندێ دەنگ و نووسینی هەندێ وشە چەند پێشنیارێکی کردووە[١٢٦] . لە ژمارە (١٠)دا مامۆستا جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی موناقەشەی ڕای نووسین بە عەرەبی و لاتینی دەکاو لەو دەنگانە دەدوێ کە نیگاریان دەوێ[١٢٧] .

لە گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » دا هەندێ وتار بڵاوکراوەتەوە . بۆ نموونە : لە ژمارە (٦ ، ٨ ، ١١) ی ساڵی (١) دا مامۆستا مارف خەزنەدار زنجیرەیەك وتاری

---

(١٢٣) ب . چۆن زمانەکەمان بنووسین ، گۆڤاری « هیوا » بەشی یەکەم ، ژ ٤ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٧ ، ل ١٠ ـ ١٧ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٦ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٧ ، ل ٨ ـ ١٩ .

(١٢٤) ب . فرمانی ئێستەمان ، ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٩ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٧ ـ ١٨ .

(١٢٥) فوئاد زەکی هەناری ، نووسینی تیپی (دال) بە شێوەی سلێمانی ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٧ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ل ١٩ ـ ٢١ .

(١٢٦) م . م . (محمدی مەلا کەریم) ، نووسینی زمانی کوردی ، گۆڤاری «هیوا» ، ژ ٨ ، ساڵی ١ بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٩ ـ ١٤ .

(١٢٧) جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی ، چۆن زمانەکەمان بنووسین ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ١٠ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٨ ـ ١١ ، ٨٩ ـ ٩٤ .

بڵاوکردۆتەوە[128] و سەبارەت بە نووسینی هەندێ پیت و وشە و ئامراز دواوە . ماموستا عەلائەدین سەجادی لە ژمارە (۱۲) ی ساڵی (۱) دا باسی دانانی نیشانەکانی پیتی کوردی کردووە[129] . لە هەمان ژمارەدا ماموستا جەمیل بەندی رۆژبەیانی بە ناوی « ڕاستکردنەوە » وە وتارێکی نووسیوە[130] و بیروڕای خۆی بەرانبەر هەندێ نووسین ، بەتایبەتی وتاری ناوبراوی ماموستا خەزنەدار تێدا دەربڕیوە . لە ژمارە (۳)ی ساڵی (۲)دا ماموستا طاهر صادق ڕای سەبارەت بە نووسینی وشەی داڕێژراو و لێکدراو و وشەی کۆتایی هاتوو بە (ی) لە دۆخی ئیزافەدا و واوی پێوەندی . . . نیشان داوە[131] . لە ژمارە (٦)ی هەمان ساڵیشدا ماموستا شێخ حەسەن بە ناوی «(ی)ی ئیزافە و (واو)ی عەتف»ەوە وتارێکی بڵاوکردۆتەوە[132] .

لە بەشێکی زۆری ژمارەکانی گۆڤاری « پێشکەوتن » دا لەبارەی مێژوو و کێشەی ڕێنووسی کوردییەوە وتار نووسراوە . بەوێنە ماموستا تۆفیق وەهبی لە ژمارە (٥) دا باسی ئەو هەوڵ و تەقەلایەی خۆی کردووە کە بۆ دانانی هەندێ پیت و نیشانە داوێتی[133] . لە ژمارە (٦) یشدا وێنەی ئەو پیت و نیشانانەی خستۆتە پێش چاو و وا ڕادەگەیەنێ کە ئەوە لاپەڕەیەکە لەو دەستنووسە کە لە ساڵی ۱۹۲٥ دا ماموستا ئەنوەر

---

(۱۲۸) مارف خەزنەدار ، زمانەوانی ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، بەشی یەکەم ، ژ ٦ ، ساڵی ۱ ، سلێمانی ، ۱۹٦۰ ، ل ۲۳ ـ ۲٦ ؛ بەشی دووەم ، ژ ۸ ، ساڵی ۱ ، سلێمانی ، ۱۹٦۰ ، ل ۱۳ ـ ۱۸ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ۱۱ ، ساڵی ۱ ، سلێمانی ، ۱۹٦۰ ، ل ۳۸ ـ ٤٥ .

(۱۲۹) عەلائەدین سەجادی ، دانانی نیشانەکانی پیتی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ۱۲ ، ساڵی ۱ ، سلێمانی ، ۱۹٦۰ ، ل ۱۱ ـ ۱۸ .

(۱۳۰) جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی ، ڕاستکردنەوە ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ۱۲ ، ساڵی ۱ ، سلێمانی ۱۹٦۰ ، ل ٥۹ ـ ٦٤ .

(۱۳۱) طاهیر صادق ، هەڵەی نووسین ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ۳ ، ساڵی ۲ ، سلێمانی ، ۱۹٦۱ ، ل ٦٥ ـ ٦۷ .

(۱۳۲) شێخ حەسەن ، (ی) ی ئیزافە و (واو) ی عەتف ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ٦ ، ساڵی ۲ ، سلێمانی ، ۱۹٦۱ ، ل ۱٥ ـ ۱۷ .

(۱۳۳) تۆفیق وەهبی ، سوپاس ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٥ ، بەغدا ، ۱۹٥۸ ، ل ۳ ـ ٥ .

سائیب بۆی پاکنووس کردووه[١٣٤] . مامۆستا توفیق وەهبی هەر لە ژمارە (٦) دا بە ناوی ( دەستوور ) ەوە وتارێکی بڵاوکردۆتەوە و لە چۆنیەتی نووسینی هەندێ ئامراز و وشە دواوە تێیدا[١٣٥] . لە ژمارە (٨) یشدا کەمێك باسی سەرچاوەی پەیدابوونی هەندێ نیشانەی سەر پیتەکانی کردووه[١٣٦] . . . مامۆستا ن . لە ژمارە (٩) دا ، کاتێ لە کتێبی «ئەلفوبێی نوێ»ی مامۆستا ئیبراهیم باڵدار دەکۆڵێتەوە ، پەنجە بۆ پێویستی جیاکردنەوەی (ر)ی لاوازو (ڕ)ی قەڵەو ڕاکێشاوە[١٣٧] . لە ژمارە (١٠)دا مامۆستا شێخ حەسەن ورد و زانایانە لە پێویستی دانانی چوکڵە بـۆ (ڕ)ی سەرەتـای وشەو ڕەت‌کردنەوەی نووسینی دوو (ر) بۆ (ڕ)ی قەڵەوی کـۆڵیوەتـەوە[١٣٨] . لە هـەمان ژمارەدا ، مامۆستا عادیل عیرفان باسی پاشـاگەردانیی نـووسینی وشەی عـەرەبی کردووه[١٣٩] . لە ژمارە (١٦)دا مامۆستا س. بـە چەنـد وشەیـەك باسی دەوری مامۆستا تۆفیق وەهبی لە دانانی نیشانەی سەر پیتەکاندا دەکات[١٤٠] . . .

نووسینی هەرە دیاری گۆڤاری « شەفەق » ، وتارێکی مامۆستا بلەیە کە لە ژمارە (٥ ـ ٦) ی ساڵی یـەکەمـدا بڵاوی‌کـردووەتەوە و بـەوردی و ڕاستی باسی مێژووی پەیدابوونی هەندێ پیت و نیشانەی تێدا کردووە و بێ‌لایەنانە هەقی بەوانە

---

(١٣٤) تۆفیق وەهبی ، فۆتۆگراف ، گۆڤاری « پێشکـەوتن » ، ژ ٦ ، بەغـدا ، ١٩٥٨ ، ل ٨ ـ ٩ .

(١٣٥) توفیق وەهبی،دەستوور ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ژ ٦ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٥ ـ ٧ .

(١٣٦) تۆفیق وەهبی ، بۆ جەنابی مامۆستا سەعید صدقی ی بەڕێز ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٨ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٥ ـ ٦ .

(١٣٧) ن . ، دیـسـانەوە ( ئەلفوبێی نـوێ دانەری ئیبـراهیم بـاڵـدار) و بـەراوردی ڕەخـنـە زانستـیـەکەی مامۆستا مستەفا صالح کەریم و وەڵامەکەی مامۆستا ئیبراهیم ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٩ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٤ ـ ٦ .

(١٣٨) شێخ حەسەن ، ڕەخنەیێکی زانستی لە مامۆستای بەڕێز جەمیل ڕۆژبەیانی ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ١٠ ، بەغدا ١٩٥٨ ، ل ٤ ـ ٨ .

(١٣٩) عـادیل عیـرفان ، هـەڵەقـۆکردن بـە نووسینی کـوردی و وشەی عـەرەبی ، گۆڤـاری « پێشکەوتن » ، ژ ١٠ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ١٨ ـ ٢٠ .

(١٤٠) س . ، گێرەشێوێنی ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ١٦ ، بەغدا ، ١٩٥٨، ل ١٠ .

داوە ، کە لەو مەیدانەدا کاریان کردووە[141] .

بەم چەشنە بینیمان کـە لە کـۆتایی سـاڵانی پەنجـا و سەرەتـای شەستـدا نووسەرانی کـورد کەوتنـە گرنگی دان بـە چارەسـەرکردنی گیـروگرفتی ڕێنـووسی کوردی و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمەش لە بڵاوکردنەوەی ئەو بیروڕایانـەدا دەوری شایانی خۆیان بینی[142] .

وتارەکانی گۆڤاری « گەلاوێژ » بە زۆری زانستی نەبـوون و پەنجـەیان بـۆ گیروگرفتەکان ڕانەکێشابوو ، بەڵکو تەنیا ئاوات خواستن بوون بـۆ ئازادبـوون لە چەرمەسەری . . . ئەوانەی گۆڤـاری « هیوا » بـەزۆری بەراوردی پیتی لاتینی و عـەرەبی بوون و بـاسی کێشەی وێنـەی دەنگەکـان و دۆزینـەوەی چـارە بـۆیـان دەکـەن . . . هەرچی نـووسینەکـانی گۆڤـاری « ڕۆژی نوێ » ن پـتر توانیـویانـە گیروگرفتەکان دەست‌نیشان بکەن و چارەیان بۆ بدۆزنەوە . . . باسەکانی گۆڤاری « پێشکەوتن » و «شەفەق» ئەگەرچی تا ڕادەیـەك مەسـەلەی چـۆنیەتی نـووسینی هەندێ پیت و وشەیان گرتۆتەخۆ ، بەڵام پتر لە مێژووی پـەیدابـوونی نیشانـە و نیگاری دەنگە کوردییەکان دواون . . .

گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی بە پیتی عەرەبی هێندە زۆرە کە نەك هەر بـەو وتارانە ، بەڵکو بەو هەمووەش کە لەم دواییەدا نووسراوە ، دەردی دەرمان ناکرێ . جا بۆیە نووسەرانی کورد بەردەوام بوون و باشتر کەوتنە خۆیان . یەکێك لەو کارە گەورانەی شایانی باسن ، کتێبی « ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی » ی مامۆستا نووری

---

(١٤١) بلە ، خۆپاراستن لە لایەنگیریی ناڕاستی ، گۆڤاری « شەفەق » ، ژ ٥ ـ ٦ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٦ ـ ١١ .

(١٤٢) مامۆستا نەریمان لە کتێبی « ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ڕیشەوە » دا ناوی هیچ یەکێك لەو وتارانەی نەبـردووە کە لـە گۆڤـاری « هیوا » و « ڕۆژی نـوێ » و « پێشکەوتن » و « شەفەق » دا بڵاوکراونەتەوە .

عەلی ئەمینە (١٩٦٦)[١٤٣] .

نووسەری ناوبراو لەم بەرهەمەدا هەوڵی داوە لە هەموو لایەنەکانی کێشەی ڕێنووسی کوردی بدوێ ـ واتە چۆن گیروگرفتی نووسینی دەنگەکانی زمانی کوردی بە پیتی عەرەبی خستوتە ڕوو ، هەر بەو چەشنەش لە گیروگرفتی نووسینی وشەی سادە و ناسادە و تێک بەستنی پیتەکان . . . دواوە .

من با هەندێ ڕای مامۆستا نووریشم لە لا پەسەند نەبێ ، هەر دەبێ بڵێم تێکرا نووسراوەکەیم بەلاوە کارێکی گەورە و سەرکەوتووە و وا تێدەگەم باش بۆ چارەسەرکردنی هەندێ کێشە چووە . بەوێنە کاتێ نووسەر پێشنیاردەکا ، کە ئەو وشانەی بە دەنگی (و ـ w) ی کۆنسۆنانت دەست پێ دەکەن و بەدوایاندا کورتە بزوێنی (و ـ u) دێت ، بە دوو واو بنووسرێن ، ئەوە لە ڕێگەی لێکدانەوەوە بۆ ئەوە چووە ، بەتایبەتی کە پێکهاتنی برگەکانی ئەو جۆرە وشانە و بوونی کورتە بزوێنی (و ـ u)ی کردوتە بەڵگەی دوو واو نووسین[١٤٤] . بە لای منەوە ئەمە ڕایەکی زانستییە و شایانی باسە . جا ئەمەش مشتێکە لە خەروارێك[١٤٥] . . . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەك پێشتر وتمان لەگەڵ هەندێ ڕای مامۆستا نوریدا نین . وەك ئەوە کە پێشنیار دەکا ، بەشێك لە وشەی ناسادە بەیەکەوە نەلکێنرێن و بەڵگەشی بۆ ئەمە ئەوەیە کە هەر وشەیەك پارێزگاریی قەوارەی خۆی دەکا و شێوەی ڕۆنانیان ئاشکرا دەکا[١٤٦] . . . وەك ئاشکرایە ، ڕێنووسی گشتی ئەرکی ئەوەی لەسەر نییە شێوەی ڕۆنان نیشان بدا . ئەو شێوە نووسینانە بۆ کاری لێکۆڵینەوەی زمان باشە . سەرەڕای گرانی و دەستهەڵگرتن لە نووسیندا ، هەروەها ناوەناوە بە ڕێکەوت پارچەکانی یەك وشە دوور لە یەکەوە دەنووسرێن و ئەمەش شیرازەی وشە تێك دەدا[١٤٧] . . .

---

(١٤٣) نووری عەلی ئەمین ، ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی ، بەغدا ، ١٩٦٦ .

(١٤٤) بڕوانە : هەمان سەرچاوە ، ل ٣٢ ـ ٣٣ .

(١٤٥) پەسەند کردنی هەندێ ڕای زانستیی مامۆستا نووری عەلی ئەمینمان لە بەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا ـ « گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی » ـ باس کردووە .

(١٤٦) بڕوانە : نووری عەلی ئەمین سەرچاوەی ناوبراو ، ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی ، ل ٤٩ ـ ٥٦ .

(١٤٧) دەربارەی ڕەتکردنەوەی پارپە پارچە کردنی وشەی ناسادە و پەسەندکردنی بەیەکەوە لکاندنیان ، بڕوانە لاپەرە ( ١٣٥ ــ ١٣٧ ) ی ئەم کتێبە .

بێگومان لێرەدا پێویست بەوە ناکات لە تێکرای کەم و کورتییەکانی کتێبی «رابەرێ بۆ ئیملای کوردی» بدوێین . لەگەڵ بوونی کەم وکورتیشدا ، راست وایە ، پەنجە بۆ ئەوە رابکێشین کە ئەم نووسراوەی مامۆستا نووری عەلی ئەمین تاکوو ئەمرۆ نرخ و بایەخی بەردەوامە و لە قوتابخانە کوردییە کاندا دەورێکی پێشرەو ئەبینێ .

شایانی باسە لەبارەی ئەو کارەوە ، مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم لە چەند ژمارەیەکی ساڵی ۱۹٦۷ ی « برایی » دا زنجیرە وتارێکی بڵاوکردۆتەوە و لە گەڵی سەرەوە لێی کۆڵیوەتەوە و رای واقیعی و زانستی نیشانداوە[148] .

ساڵی ۱۹٦۸ یش مامۆستا أ . ب . هەوری نامیلکەیەکی بە ناوی « دەستووری نووسینی زمانی کوردی بە پیتی عەرەبی » یەوە ، بڵاوکردەوە[149] . ئەم نووسراوە تێکرا زۆر ساکارە و پرە لە هەڵەی زانستی[150] .

دوای تێپەربوونی ساڵێك کتێبی « رێنووس - چۆنیەتی نووسینی کوردی » ی مامۆستا طاهیر صادق دەرچوو[151] . هەرچەندە ئەم بەرهەمە کەرەستەی باشی تێدایە و ژمارەیەك گیروگرفتی رێنووسی کوردی باش چارەسەرکردووە . بەڵام نووسەرەکەی بۆ پێ سەلماندنی پێشنیارەکانی بەڵگەی نەهێناوەتەوە .

سەرەرای ئەوە ، هەندێ کەم و کورتی و هەڵەی گەورەی تێدا دێتە پێش چاو . بەوێنە نووسەر ئەو (ك) و (گ) انەی دەکەونە پێش دەنگی (ێ ، ی ، وێ ، وی) یەوە بە فۆنیمی سەربەخۆ داناوە ، بۆیە وا بە پێویست دەزانێ کە نیگاری تایبەتییان بۆ دابرێژرێ[152] . بێگومان نووسەر لەمەدا بەهەڵە چووە ، چونکە وەنەبێ ئەو (ك) و (گ)انەی بەوچەشنە شێواوە بەدەمدا دێن فۆنێمێکی تر بن ،

---

(148) محەمەدی مەلا کەریم ، لەگەڵ رابەرەکەی کاك نووری عەلی ئەمیندا ، رۆژنامەی « برایی » ، ژ ۷ ، بەغدا ، ۱۹٦۷ ، ل ٤ - ٥ ؛ ژ ۸ ، بەغدا ، ۱۹٦۷ ، ل ۲ ؛ ژ ۹ ، بەغدا ، ۱۹٦۷ ، ل ۲ ؛ ژ ۱۰ ، بەغدا ۱۹٦۷ ، ل ۲ ، ۷ .

(149) أ . ب . هەوری ، دەستووری نووسینی زمانی کوردی بە پیتی عەرەبی ، سلێمانی ، ۱۹٦۸ .

(150) نووسەری کتێبی « رێنووسی کوردی لە رەگ و ریشەوە » ناوی نامیلکەی ناوبراوی نەبردووە .

(151) طاهیر صادق ، رێنووس - چۆنیەتی نووسینی کوردی ، کەرکووك ، ۱۹٦۹ .

(152) هەمان سەرچاوە ، ل ۱۰ ، ٥٦ ، ٥۸ .

بەڵکو هەمان فۆنیمن کە لەباری ئاساییدا دەبینرێن . لێرەدا تەنیا کارتێکردنی (یێ ، ی ، وێ ، وی) شێوەی تەلەفوزی وا گۆڕیون و ئەمە نابێتە هۆی واتاگۆڕی .

نموونەیەکی دیی ناتەواویی نووسراوی ناوبراو ئەوەیە کە تەنیا شەش دەنگی بزوێنی دەستنیشان کردووە[153] و سەرەڕای ئەوەش دوو بزوێنی (و ـ u) ، (وو ـ ū) ی لەگەڵ کۆنسۆنانتی (و ـ W) دا تێکەڵ کردووە[154] . هەر بەو چەشنەش بزوێنی (ی ـ î) و کۆنسۆنانتی (ی ـ y) یشی لە یەك جیانەکردۆتەوە[155] .

ئەو جۆرە هەڵە زانستییانە لە نووسراوی ناوبراودا زۆر بەدیدەکرێن و ئەوانەی ئێمە پەنجەمان بۆ ڕاکێشاون تەنیا چەند نموونەیەکی زۆر کەمن . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بەرهەمەی مامۆستا طاهر کارێکی سوودبەخشە لە مەسەلەی دەستنیشان کردن و چارەسەرکردنی هەندێ کێشەی ڕێنووسی کوردیدا[156] .

شایانی باسە ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری کورد لە یەکەم ڕۆژەکانی دامەزرانییەوە بایەخێکی زۆری بە دانانی ڕێنووسێکی دیاریکراو بۆ زمانی کوردی داوە . چونکە وەك ئاشکرایە نەبوونی ڕێنووسێکی وەها یەکێکە لە گیروگرفتە هەرە گەورەکانی ڕووناکبیری ئەمڕۆی گەلی کورد . پاش هەوڵ و تەقەلایەکی دڵسۆزانە لەم ڕووەوە بەرهەمێك هێنرایە ئەنجام و لە بەرگی یەکەمی گۆڤاری کۆڕدا بڵاوکرایەوە[157] و دواتریش کرایە نامیلکەیەك[158] . لە پێشەکی ئەم کارەدا کۆڕ تکای لە هەموو زانا و شارەزایانی کورد و کوردناسانی بێگانە کردووە بە وردی لەو بەرهەمەی بکۆڵنەوە و لە

---

(١٥٣) هەمان سەرچاوە ، ل ١٩ .

(١٥٤) هەمان سەرچاوە ، ل ٦٦ .

(١٥٥) هەمان سەرچاوە ، ل ٧٣ ـ ٧٥ .

(١٥٦) وەك لە پەراوێزی ژمارە (١٣ ، ٢٦ ، ٤١ ، ٥٥ . . .) دا باسمان کردووە ، د . نەبەز لە دیاریکردنی کاتی پەیدابوونی هەندێ پیتدا بەهەڵەچووە . . سەرەڕای ئەمەش نەك هەر دەربارەی دەمی پەیدابوونی چەند پیتێك ـ بەوێنە ، نیگاری دوو واو بۆ نیشاندانی بزوێنی (ū)ی درێژ . . . ـ هیچی نەوتووە ، بەڵکو ناوی زوربەی زۆری ئەو وتار ونامیلکە و کتێبانەشی نەبردووە ، کە پێوەندیان بە ڕێنووسی کوردییەوە هەیە .

(١٥٧) ڕێنووسی کوردی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣٦٤ ـ ٣٧٩ .

(١٥٨) ڕێنووسی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦

ماوەی شەش مانگدا بیری خۆیان و هەر پێشنیارێکیان لەبارەیەوە هەیە بۆی بنێرن تا ئەویش لەبەر ڕووناکیی ئەو بیر و پێشنیارانەدا دوا بڕیاری خۆی بدات[159] .

چەند ساڵ بەسەرچوو ، بەڵام شتێکی ئەوتۆ دەربارەی ئەو ڕێنووسەی کۆڕ نەنووسرا . . . خۆزگە هەڵە و ناتەواوییەکانی ئەو ڕێنووسە بە دەیان لێکۆڵینەوە و وتار دەخرانە پێش چاو و ڕاست دەکرانەوە ، هەتا لە ئەنجامدا ڕێنووسێکی پوخت و لەبار ساز ببوایە . . . بەداخەوە ئەم کارە سوودبەخشە بەجێ نەهێنرا و سەرەڕای ئەوەش چەند کەسانێك هەر لەبەر ئەوەی ئەو کارە بەرهەمی کۆڕە ، بێ هیچ بەڵگە و ڕوونکردنەوەیەك نەك هەر بەرەنگاری وەستان ، بەڵکو کردیشیانە بنێشتە خۆشەی ژێر زمانیان و لە هەموو شوێنێك بە پلار و توانج تێگرتنەوە ڕەتیان دەکردەوە . . . بەڵێ ناوەناوە دەمانبینی کە هێرشی نارەوایان لە سنووری ئاخاوتن لایداوە و هاتۆتە سەر کاغەز . . . خۆ ئەگەر لەبریتی ئەو وشە سووك و نارەوایانە پێشنیارێك یاخود ڕاستکردنەوەی هەڵەیەك یاخود نیشاندانی کەم و کورتییەك بوایە ، ئەوە لەلایەکەوە ئەرکی پیرۆزی خۆیان بەجێ دەهێنا و لە لایەکی تریشەوە پلەی نووسینەکانیان پێ بەرز دەبووەوە[160] .

---

(١٥٩) هەمان سەرچاوە ، ل ٤ .

(١٦٠) بۆ مێژوو وا بە پێویست دەزانم ، چەند نموونەیەك لەو وشانە بخەمە ڕوو کە بەرابەر بە ڕێنووسی کۆڕ وتراون :

د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ لە وتارێکی پڕ لە هێرشدا بۆ سەر کۆڕ و ئەندامان و کارگێرانی کۆڕ و کارەکانی کۆڕ (د . عز الدين رسول ، حول المجمع العلمي الكردي ، مجلة « الثقافة » ؛ بغداد ، ١٩٧٦ ، العدد ٤ ، ص ١٤٦ ـ ١٧٠) ، لەبارەی ڕێنووسی کۆڕەوە نووسیوێتی : « گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی لەو تەگەرانە بوو کە وا چاوەڕوان دەکرا کۆڕ چاریان بکا ، بەڵام کۆڕ گرفت و چەڵەمەکەی بەرەو ڕووی کەسانی نەشارەزا کردووە و بە دەستی کەسانێکی بەوە دا کە ناتوانن لاپەڕەیەك بە بێهەڵەی ڕێنووس بنووسن ، ئەمانە تەنگو چەڵەمەکانی تریان چارە نەکرد ، بەڵکو هەستان لە بنەڕەتەوە بە ڕێنووسەکەی جارانـدا چوونـەوە و سەر و گـوێلاکی ڕێنـووسی کوردییـان بەجـارێ تێك شکاند و ئەرکی سێ چارەکە سەدەی بگرە پتری زانا و تێکۆشەرانیان بەفیڕۆ دا ، ڕێنـووسێکی نوێیـان دروستکرد و پیتی تـایبەتییـان تەنیـا بۆ چـاپخانـەکەی خـۆیان دارشت . . . » (ل ١٦٧) .

لەم وشانەوە ئاشکرا دەردەکەوێ کە مەبەستی د . عیزەدین ئەوەیە بـە حەق و

ناحەق دژی کۆر بدوێ . ئەگەر وانەبوایە ، هەڵبەت کەمێك بەوەشەوە خۆی ماندوو بەکرد کە خراپیی ڕێنووسی کۆر بخاتە پێش چاو . نەخێر ئەوەی نەکردووە و جا بۆ گەیاندنە ئەنجامی مەبەستی شەخسیی خۆی هەوڵی داوە لەڕێی پەرۆش و دڵسۆزییەوە خوێنەری کورد چاوبەست بکات . . .

نامەوێ خۆم بەو هەموو چەند و چوونەی د . عیزەدینەوە خەریك بکەم ، بەڵام سەرنجی خوێنەر بۆ بەندێکی ئێجگار سەیری ئەم نووسینە رادەکێشم ، کە دەڵێ : « پیتی تایبەتییان تەنیا بۆ چاپخانەکەی خۆیان دارشت » . ئەمە وا دەگەیەنێ کە کۆر بەڕێوەبەری هەموو دەزگا کوردییەکان بێ و کەچی لەوکارەدا هەر خۆی خوێندبێتەوە . بێگومان نووسەر دەبوو بیرێك لەو قسانە بکاتەوە .

د. مارف خەزنەداریش لە (پاشەکی) ی کتێبی « دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی » دا (بەغدا ۱۹۷۷) کاتێ کە باسی جیاوازیی ئەم کارەی خۆی لەگەڵ « دیوانی نالی » مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس و فاتیح عەبدولکەریم (بەغدا ، ۱۹۷٦) دەکات ، یەکێك لە خاڵەکانی پێوەندیان بە ڕێنووسی کۆڕەوە هەیە و تێیدا دەڵێ « من بە ئیملایێك تێکستی شیعرەکانم تۆمارکردووە دەتوانم بڵێم ترانسکریپتی شیعرەکانی نالی یە بە ئەلفبایێکی زانستی لەسەر بنچینەی تیپی عەرەبی ، ئەگەر لە دوارۆژدا ئیملای ستانداردی ئێستای زمانی کوردیش بگۆڕێ ، ئەم ئیملایەی ئێمە وەکو ئیملایێکی زانستی لەکەڵك ناکەوێ ، بەڵام ئەوان جۆرە ئیملایێکیان بەکارهێناوە ئەو دەسگایەی دایناوە نەبێ کەسی تر دانی پێدا نەهێناوە » ( دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی ، ل ٤٠٨) .

ئەگەر ئەو ڕێنووسەی د . مارف بەوچەشنەش بێ کە خۆی باسی دەکا ، کە بێگومان واش نییە . . . بەڵام خۆ ڕێنووسی کۆر کە مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس و فاتیح عەبدولکەریم و محەممەدی مەلاکەریم تارادەیەك پەیرەوییان کردووە وەنەبێ هێندە شتێکی نامۆ بێ کە خوێندەوارانی کورد سەری لێ دەرنەکەن . ئەوەی بەزۆری خەڵکەکە پێی ڕانەهاتبن و لایان شتێکی نوێ بێ کەشیدەی سەر (و) و (ی) ەکەیە . جا ئەو کەشیدەیەی کۆر وەنەبێ لەوەی د . خەزنەدار لەم نووسینەی و نووسینەکانی تریدا بۆ دەربڕینی دیفتۆنگی (وێ) لەسەر پیتی (و) دایناوە ناحەزتر بێ (لە بەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا ـ گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ـ لەبارەی بەکارهێنانی نیگاری (وَ) بۆ دیفتۆنگی (وێ)وە دواوین) .

د. مارف هیچ کەم و کورتی و هەڵەیەکی ڕێنووسی کۆری نیشان نەداوە ، بەڵام بۆ هێنانەدیی مەبەستە ئاشکراکەی دەیەوێ بەری خۆر بە بێژنگ بگرێ . ئەگەر یەکێك خۆی نەخڵافێنێ ، یاخود نیازی راستی شێواندنی نەبێ ، وادادەنێ کە هۆی بەکارنەهێنانی

ڕێنووسی کۆر لەلایەن دەزگا کوردییەکانی ترەوە ، ئەوەیە کە ڕێنووسەکە باش نییە ! . . .
نەخێر نە کەس لە دنیا بێ خەبەرە و نە ڕێنووسی کۆریش هێندە خراپە . لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە پاکانە بۆ ڕێنووسی کۆر بکەم و بڵێم لەوانە نییە کە ڕەخنەی لێ بگیرێ . من بەش بەحاڵی خۆم بەرانبەر هەندێ بەندی تێبینی و سەرنجم هەیە و دواتر لێیان دەدوێم .
مەبەستی من ئەوەیە وەڵامی ئەو کەسە بدەمەوە کە پەردەی ڕەش بەسەر ڕاستیدا دەدا .
بێگومان هەموو دەزانین ، ئەگەر کۆر خاوەن دەستەڵات بوایە ، ئەوە ڕێنووسەکەی سەرلەبەری هەڵەش بوایە دەیتوانی بیسەپێنێ و کەسیش زاتی نەدەکرد قسەی سووکی پێ بڵێ . خۆ بێتو لەبەر ڕووناکیی ئەو وشانەی د. خەزنەداردا سەرنج لە بەکارنەهێنانی ئەلفوبێی لاتینی بدەین ، ئەوە بۆمان دەردەکەوێ کە خۆ دیسان دەبێ خراپی ئەلفوبێکە بێ ، بەڵام لەڕاستیدا وا نییە و ئەلفوبێی لاتینی بۆ نووسینی کوردی نەك هەر خراپ نییە ، بەڵکو زۆر لەبار و گونجاویشە ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هیچ دەزگایەکی کوردی بەکاری ناهێنێ . . . دیسان بەپێی وتەکانی د. مارف بێ ، ئەوە کوردەکانی یەکێتی سۆڤێت کە ئەلفوبێ لاتینی یەکەیان گۆڕدرا بە ئەلفوبێی سلاڤی ، دەبێ هۆکەی ئەوە بووبێ کە ئەمەی ئێستایان لە لاتینی یەکە باشتر بێ . نەخێر ئەمیش وا نییە و تێکرای کوردەکانی سۆڤێت و شارەزایانیان لە وتووێژدا دان بەو ڕاستییەدا دەنێن ، بەڵام چار نییە و بەکاریشی دێنن . . . بەداخەوە ئەگەر لەبەر ڕووناکیی ئەو وشانەی د. خەزنەداردا بۆ مەسەلەی ئیملای کوردی بچین ، ئەوە دەبێ بەرەو تاریکستان هەنگاو بنێین .
گومانم نییە ، د. مارف هێندە ساویلکە نییەو واقیعی بڵاونەبوونەوەی ڕێنووسی کۆر زۆر باش دەزانێ ، بەڵام جێی داخە لەپێناوی مەبەستی شەخسیدا ڕاستی بەوجۆرە بشێوێنێ .
سەرەڕای هەموو ئەوە ، خۆ د. خەزنەدار ئەو (و ـ کەشیدەیەك لەسەری)یە کە لە جێگەی دیفتۆنگ بەکاری دێنی و (گوێ ، کوێستان ، خوێ ، کوێ . . .)ی پێ دەکاتە (گوَ ، کوَستان ، خوَ ، کوَ . . .) ، زۆر لەپێش بڵاوبوونەوەی ڕێنووسی کۆرەوە پەیرەوی دەکا و کەچی نەك هیچ دەزگایەکی کوردی دانی پێدا نانێ ، بەڵکو تەنانەت هاوڕێکانیشی پەسەندی ناکەن . . . ئەی دەبێ بۆ ئەمە وەڵامی چی بێ ؟ . . .
د. جەمال نەبەزیش کە لە گۆڤاری «ئاسۆی زانکۆیی» (سلێمانی ، ١٩٧٨ ، ل ٨٩ ـ ٩١)دا لە کتێبی «بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی»ی مامۆستا نەریمان دواوە ، فرسەتی هێناوە لە قاپیی ڕێنووسەوە توانج بگرێتە کۆر و بڵێ : «کاك نەریمان کە کتێبەکەی لە لایەن (کۆری زانیاری) یەوە چاپکراوە ، وا دیارە ناچار بووە خۆی ببەستێ بە ڕێنووسی کۆرەوە کە ڕێنووسێکی یەکجار ناقۆڵا و نالەبار و ئێسك قورسە» (ل ٩٠) . ئەم توانجە نازانستییەی د. نەبەز لە ڕێنووسی کۆری گرتووە نەك هەر باری کەم و کورتی ڕێنووسی کۆری پێ ڕاست

نەکردۆتەوە ، بەڵکو باری زانایی و ئیدیعای دڵسۆزیی خۆشی پێ لەنگ کردووە ، چونکە هەموومان هێندە بە ئاگاین بزانین ئەو تەرزە شێوازە ناحەزانەیە ، لە سەرچاوەی سۆز و پەرۆشەوە هەڵنەقوڵاوە . . . د. نەبەز لە پەراوێزی ئەو توانجەدا دەڵێ : «راستییەکەی رێنووسی کۆڕ زۆر نەزانانە و ناشییانە دانراوە ، بەڵام ئێرە جێی ئەوە نییە کە باسی ئەم رێنووسە بکەم . لە وتارێکدا کە بەتایبەتی لەسەر (کۆڕی زانیاری) نووسیومە باسی ئەوەم کردووە . هەروەها لە کتێبی (زمانی یەکگرتووی کوردی)دا چاپی بامبێرگ ل ٨١ ـ ٨٢ لێی دواوم» (ل ٩١) . لێرەدا نامەوێ لەوە بدوێم کە چۆن د. نەبەز توانج و پلاری خۆی خەست کردۆتەوە . ئەمە بۆ خوێنەری بەڕێز بەجێ دەهێڵم و دێمە سەر شی کردنەوەی ئەوەی لە وتاری «سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد» و کتێبی «زمانی یەکگرتووی کوردی»دا لەبارەی رێنووسی کۆڕەوە نووسیویێتی :

لەو دوو نووسراوەدا ئەوەی پێوەندی بە رێنووسی کۆڕەوە هەیە جێگەی سەرسوڕمانە . بەرلەوەی بێمە سەر لێکدانەوەی ئەو باسە هەندێ ڕاستی دەخەمە پێش چاو :

١ ـ د. نەبەز لە کتێبەکەیدا پلاری خراپ ناگرێتە کۆڕ ، بەڵام لە وتارەکەیدا درێغی نەکردووە ، ئەویش هۆی ئەوەیە کە کتێبەکەی بەر لە وتارەکەی نووسیوە و ئەو دەمە هێشتا کۆڕی بەلاوە هێندە ناحەز نەبوو .

٢ ـ جگە لە باسی چوکڵەی (ڕ)ی قەڵەو کە لە وتارەکەیدا باسی کردووە ، ئەو شتانەی تری کە لە وتارەکەیدا ڕەخنەی لێ گرتوون ، هەر ئەوانەن لە کتێبەکەیدا لێیان دواوە .

جا ئەمانەش هەر جێ دێڵم و دێمە سەر لێکدانەوەی ئەوەی د. نەبەز لە وتاری ناوبراودا دەربارەی ڕێنووسی کۆڕ نووسیویێتی .

کاتێ لە پەراوێزی وتاری «کتێبی بیبلیۆگرافیای کوردی»دا خەبەری لەسەر ڕێنووسی کۆڕ نووسینم خوێندەوە ، وتم ئۆخەی ئەوە ئاواتی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە دێتەدی . . . زۆر چاوەڕوان بووم ڕۆژێك زووتر ئەو وتارە بلاوبێتەوە . . . بەڵێ وتار بلاوبووەوە ، بەڵام بەداخەوە هەموو ئاوات و چاوەڕوانیم بەخۆڕایی چوو . . . بەر لە هەموو شتێك د. نەبەز ئێجگار توند و تیژ بەرەنگاری ڕێنووسی کۆڕ بووە و وای داناوە کە دەستکاری کردنی ڕێنووسی کوردی لەلایەن کۆڕەوە کارێکی ناشییانەیە و لە تێکدانی ئەلفوبێکە بەولاوە هیچی دی نەبووە (سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد ، «گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات» ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ژ ٢٢ ، ل ٩٤) . . . خۆزگە د. نەبەز بە دڵێکی فراوانەوە و بە نیازی خزمەت لە کەم و کورتییەکانی ڕێنووسی کۆڕ دەدوا . هەرچەندە هەندێ لەو ڕەخنانەی لەو بارەیەوە نووسیونی ڕاستن ، بەڵام هەڵەی گەورەتر هەن ئەو دەرکی پێ نەکردوون و سەرەڕای ئەوە خۆشی تووشی هەڵە بووە .

ئیستاش با کەمێك لە ڕێنووسی کۆڕ وردبینەوە :

کۆڕ (و ـ کەشیدەیەکی لەسەر) لەجیاتی (وو) دەنووسێ چونکە هەستی بەوە کردووە کە دانانی دوو پیت بۆ نیشاندانی یەك فۆنێم باش نییە ، سەرەڕای ئەوە دانانی چوکلە ئاسانتر و خێراترە لە نووسینی پیتێکی سەرلەبەر . جا کۆڕ هەستی بەوە کردووە و بۆیە پیتێکی هێشتۆتەوە و وەك وێنەی درێژی یش کەشیدەیەکی لەسەر داناوە . لە ڕووی زانستی زمانەوە ئەمەی کۆڕ پەسەندە ، بەڵام لە ڕووی ڕوخسارەوە ، لەبەرئەوەی ئەو کەشیدەیە لە سەر (فتحە)ی عەرەبی دەچێ ، هێندێ گیروگرفتی پەیداکردووە . ئەگەر لەبریتی ئەو کەشیدەیە نیشانەیەکی تر لەسەر یان لەژێر پیتی واوەوە دابنرایە ، ئەوە چاکتر بوو . . . بەڵێ ئەو کەشیدەیە شێوەی جوان نییە ، بەڵام لەڕووی زمانەوانییەوە ڕاستە[161] ، کەچی هەندێ کەس ئەو ڕاستییەیان کردووە بە ژێر لێوەوە و هەر لەبەرئەوەی کاری کۆڕە بەلایانەوە خراپە[162] .

یەکێك لە ناتەواوییە دیارەکانی ڕێنووسی ناوبراو ئەوەیە ، کە کۆڕ چارەسەری جیاکردنەوەی بزوێنی (و ـ u) و کۆنسۆنانتی (و ـ W)ی نەکردووە . هەروەها دەبوو تێکەڵ‌کردنی بزوێنی (ی ـ î) و کۆنسۆنانتی (ی ـ y) یش نەهێڵێ[163] . . . ئەوەی پتریش جێگەی ڕەخنە بێ ، ئەوەیە کۆڕ نەك هەر (ی ـ î)ی بزوێن و (ی ـ y)ی کۆنسۆنانتی لێك جیانەکردۆتەوە ، بەڵکو بە پێوانەی عەرەبی وایدانـاوە کە لە کوردیشدا دوو بزوێنی (ی) هەیە ، کە یەکێکیان کورتە و ئەوی دییان درێژ ـ واتە یەکێکیان وەك ژێر (کسرة) و ئەوی‌تریان وەك (ی) . بۆ جیاکردنەوەشیان کەشیدەیەکی لەسەر دووەمیان داناوە[164] . بە ڕای من ئەمە بە زۆر سەپاندنی فۆنێمی عەرەبییە بەسەر کوردیدا[165] .

---

(١٦١) لە بەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا پتر لەو کێشەیە دواوین .

(١٦٢) د. نەبەز ئەوە بە کارێکی ناشیانە دادەنێ (ل ٩٤) ، کەچی (و ـ کەشیدەیەکی لەسەر) لەجیاتی (وێ) نوسین کە دەستەی نوسەرانی «گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات» پەیرەوی دەکەن ، کە بە ناوەڕۆك هەڵە و بە ڕوخساریش ناحەز لەسەری بەدەنگە نایەت .

(١٦٣) د. نەبەز لەم بارەیەوە ڕەخنەی بەجێی لە کۆڕ گرتووە (ل ٩٤) .

(١٦٤) بەداخەوە د. نەبەز هەستی بەو هەڵەیەی کۆڕ نەکردووە .

(١٦٥) سەرنجمان سەبارەت ، بە پێویستی جیاکردنەوەی بزوێنی (و ـ u) و کۆنسۆنانتی (و ـ

گیروگرفتێکی گرنگی ڕێنووسی کۆر ، ئەوەیە بۆ کورتە بزوێنی (i) ، کە بە عەرەبی (الکسرة المختلسة) ی پێ دەڵێن ، نەك هەر نیگاری دانەناوە ، بەڵکو باسیشی نەکردووە و ناویشی نەهێناوە[166] [167] . . .

کۆر لە گۆڕینی شوێنی چوکڵەی (ڕ) ی قەڵەودا ـ واتە کە لەژێرەوە هێنایە سەرەوە ـ لە هیچی نەبوو گیروگرفتێکی نوێی بۆ ڕێنووسی کوردی دروست کرد[168] [169] . . .

ئەمانە و هەندێ ناتەواوی و هەڵەی تر لە ڕێنووسی کۆردا دەبینرێن[170] . بەڵام خۆ دەبێ لەتەك باسی ئەو کەم و کورتییانەیدا باسی ڕووە چاکەکانیشی بکەین :

کۆر کە پێشنیاری کردووە ، لەو شوێنانەدا کە وشەی (ئەم) دەچێتە سەر وشەی وەك (جا ، ساڵ ، ڕۆ ، شەو . . .) پێوەیان بلکێنرێت (ئەمجا ، ئەمساڵ ، ئەمڕۆ ، ئەمشەو . . .)[171] دەبێ خراپەی چی بێ ؟ . . کۆر کاتێ ئەوەی پەسەندکردووە ، کە ئەمرازی (نەفی و نەهی و ئەمر و موزارەعە) چووە سەر کرداری سادە ، ئەمرازەکە بە کردارەکەوە بلکێنرێت ، وەك (ناکوژێ ، مەکوژە ، بکوژە ، دەکوژێ)[172] ، نازانستیی لە چیدایە ؟ . . یاخود کە دەڵێ « لە زمانی کوردیدا

---

(۳) ؛ بزوێنی (ی ـ ۳) و کۆنسۆنانتی (ی ـ ۷) . هەروەها ڕەت کردنەوەی دیاری کردنی دوو بزوێنی (ی) لە ڕێنووسی کوردیدا بە دوور و درێژی و بەڵگەی زانستی یەوە لە بەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا باس کردووە .

(166) شی کردنەوەی ئەم کێشەیەش دیسان کەوتۆتە بەشی سێیەمی ئەم کتێبەوە .

(167) د . نەبەز ئەمەی لەسەر کۆر نەکردۆتە ڕەخنە .

(168) لێکدانەوەی ئەو کێشەیە لە بەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا هاتووە .

(169) بەتەواوی ڕام لەگەڵ د . نەبەزدا دەگونجێ لەوەدا کە دانانی چوکڵە لەسەر (ڕ) بۆ کردنی بە ڕێی قەڵەو لەباری هونەرییەوە بە ڕاست نازانێ (ل ۹٤) . بەڵام کە پێشنیار دەکا چوکڵە نەخرێتە سەر (ڕ) ی سەرەتای وشە (ل ۹٤) ، ئەوە زۆر بەهەڵەدا چووە (لە بەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا ، دەربارەی (ڕ) ی سەرەتای وشە کۆڵیوینەتەوە ) .

(170) د . نەبەز لە باسی کەم و کورتیی ڕێنووسی کۆردا نیشانی نەپێکاوە . بەڵام ئەمەش هێشتا شوکرانەی دەوێ کە ئەو وەك خەڵکی دی تەنیا پلار و توانجی تێ نەگرتووە ، بەڵکو یەك دوو هەڵەی ئەو ڕێنووسەشی خستۆتە پێش چاو .

(171) سەرچاوەی ناوبراو ، ڕێنووسی کوردی ، ل ۱۱ .

(172) هەمان سەرچاوە ، ل ۱۱ ـ ۱۲ .

جاری‌وا هه‌یه دوو وشه‌ی یه‌ك واتابه‌خش به‌دوای یه‌كدا دێن و نه‌نها پیتی (و) یان ده‌كه‌وێته نێوانه‌وه و ته‌نانه‌ت واش رووده‌دات كه یه‌كێك له‌و دوو وشه‌یه له زمانێكی تره‌وه وه‌رگیرابێت ، وه‌ك (پێوقه‌ده‌م) . له هه‌موو ئه‌و جۆره شوێنانه‌ی رسته‌دا پێویسته ، ئه‌و دوو وشه یه‌ك واتابه‌خشه به‌یه‌كه‌وه بنووسرێن ، وه‌ك : (گورجوگۆڵ ، گفتوگۆ ، كه‌لوپه‌ل ، مشتومر ، كتومت ، ده‌ستوبرد ، رووتوقووت ، شێتووێت ، لووسوپووس ، پێوقه‌ده‌م . . .)[173] ، ناله‌باریی ئه‌و پێشنیاره چییه ؟ . .

جا نه‌ك هه‌ر قسه‌ی بێ‌جێ و توانج و پلار له زانستدا جێی نابێته‌وه ، به‌ڵكو ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر ره‌خنه‌گریش شتێكی له ره‌خنه‌لێگیراو باشتر پێشكه‌ش نه‌كات بایه‌خ به كاره‌كه‌ی نادرێ .

له‌نێو ئه‌و باسانه‌ی له‌دوای دانانی رێنووسی كۆڕه‌وه ـ واته له ساڵی ۱۹۷۳ وه ـ ده‌رباره‌ی رێنووسی كوردی نووسراون ، به‌تایبه‌تی چه‌ند وتارێكی مامۆستا مه‌سعوود محه‌مه‌د دیارن . مامۆستای ناوبراو ، سه‌ره‌رای وتاری « گیروگرفتی رێنووسی كوردی »[174] و «رێنووسی كۆڕ»[175] ، هه‌روه‌ها له هه‌ندێ نووسینی دی زمانه‌وانیشدا ناوه‌ناوه به لای كێشه‌ی رێنووسدا چووه[176] .

مامۆستا مه‌سعوود محه‌مه‌د به شێوه‌یه‌كی زانستی و به به‌ڵگه‌ی زۆر و راست و له‌بار بیر و رای سه‌باره‌ت به هه‌ندێ گیروگرفتی رێنووسی كوردی ده‌ربریوه . به‌وێنه چوار به‌ڵگه‌ی واقیعی ئه‌وتۆی بۆ ره‌تكردنه‌وه‌ی دانانی نیگاری سه‌ربه‌خۆ بۆ

---

(۱۷۳) هه‌مان سه‌رچاوه ، ل ۱٤ .

(۱۷٤) مه‌سعوود محه‌مه‌د ، گیروگرفتی رێنووسی كوردی ، گۆڤاری « په‌روه‌رده و زانست » ، ژ ٦ ، به‌غدا ، ۱۹۷۳ ، ل ۷ ـ ۲۸ .

(۱۷٥) مه‌سعوود محه‌مه‌د ، رێنووسی كۆڕ ، « گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد » ، ب ٤ ، به‌غدا ، ۱۹۷٦ ، ل ۲۳۲ ـ ۲۸۸ .

(۱۷٦) به‌وێنه :

أ ـ مه‌سعوود محه‌مه‌د ، فونه‌تیك چیمان بۆ بكا ؟ ، « گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد » ، ب ۳ ، ب ۱ ، به‌غدا ، ۱۹۷٤ ، ل ٥٦۸ ـ ٦۲۲ .

ب ـ مه‌سعوود محه‌مه‌د ، به‌كارهێنانی (ی) له رێزمانی كوردیدا ، « گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد » ، به‌رگی یه‌كه‌م ، به‌شی یه‌كه‌م ، به‌غدا ، ۱۹۷۳ ، ل ۳۹ ـ ۱۱٤ .

دیفتۆنگی (وێ) هێناوەتەوە[177] ، کە بەر لەو کەس وا بۆ ئەو ڕاستییە نەچووە . . . ئەو هەموو بەڵگە لەبارانەی بۆ بە هەڵە دانانی نووسینی بزوێنی (و) ی درێژ بە دوو واو خستوویەتی یە پێش چاو[178] ، کەرەستەیەکی تازەن . . . نموونەی جوانی سەبارەت بە سەربەخۆ نووسینی پریپۆزیشن[179] ، ناکرێ لێی لاری بین . . . هتد . ئەمانە و چەندین ڕای زانستی دی لە وتارەکانی نووسەردا دەبینین[180] .

لەگەڵ پەسەندکردنی ئەو بۆچوونانەشدا ، لە هەندێ شوێندا ڕامان لەگەڵ ڕای مامۆستا مەسعوود یەك ناگرێتەوە . بەوێنە ، ئەوەی پێی دەگوترێ (کسرة مختلسة) ئەو بە قورس کردنی دادەنێ[181] ، بەڵام بە لای ئێمەوە کورتە بزوێنە[182] . . . ئەو وا بە باش دەزانێ کە بۆ (ر) ی قەڵەو چوکڵە لەسەرەوە دابنرێ[183] ، ئێمەش وای بۆ دەچین کە دانانی چوکڵە لەژێرەوە لەبارتر بێت[184] . . . ئەو لەو ڕایەدایە کە لە نموونەی وەك : « هەڵ ، هەڵدەگرێ ، هەڵ

---

(177) سەرچاوەی ناوبراو ، مەسعوود محەمەد ، گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی ، ل ۹ ـ ۱۱ .
(178) سەرچاوەی ناوبراو ، مەسعوود محەمەد ، ڕێنووسی کوڕ ، ل ۲۵۷ ـ ۲۵۸ .
(179) هەمان سەرچاوە ، ل ۲۷۵ ـ ۲۷۷ .
(180) لە بەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا ئەو بۆچوونانە و هەندێکی دی هەڵسەنگێنراون .

(181) بڕوانە :
أ ـ مەسعوود محەمەد ، سەرچاوەی ناوبراو ، فۆنەتیك چیمان بۆ بکا ؟ ، ل ۵۹۱ .
ب ـ مەسعوود محەمەد ، سەرچاوەی ناوبراو ، ڕێنووسی کوڕ ، ل ۲۵۳ ـ ۲۵٤ .
(182) بڕوانە :
أ ـ د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، سەرچاوەی ناوبراو ، پێداچوونەوەیەکی هەندێ بیروڕای زمانەوانیی مامۆستا مەسعوود محەمەد ، بەشی یەکەم ، ل ۱۲ ـ ۱۳ ، بەشی دووەم ، ل ۱۳ ـ ۱۷ .
ب ـ د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، سەرچاوەی ناوبراو ، چەند وشەیەك دەربارەی وتاری (لەگەڵ دەنگسازی کوردیدا) ، ل ٦۳ ـ ٦٤ .
(183) مەسعوود محەمەد ، سەرچاوەی ناوبراو ، ڕێنووسی کوڕ ، ل ۲۵٦ ـ ۲۵۷ .
(184) بڕوانە : د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، ل ۳۳ ـ ۳۸ .

بگره . . . » دا پێشگره‌كه به جیا بنووسرێ[١٨٥] ، رای ئێمه‌ش ئه‌وه‌یه به‌ته‌نیا نووسینی پێشگره‌كه راست نییه . . هتد[١٨٦] .

ئه‌گه‌رچی رای ئێمه و مامۆستا مه‌سعوود له چاره‌سه‌ركردنی هه‌ندێ كێشه‌ی رێنووسدا وێك ناچن ، به‌لام ئه‌مه ئه‌و راستییه‌م لێ ناشێوێنێ كه ئه‌و وتارانه‌ی ئه‌و ده‌رباره‌ی رێنووسی كوردی نووسیونی به باشترین و زانستی‌ترین به‌رهه‌می ئه‌و مه‌یدانه دابنێم .

**له گۆڤار و رۆژنامه كوردییه‌كانی نێوان سالانی ٧٠ ـ ٨٠ شدا له‌باره‌ی رێنووسی كوردییه‌وه ژماره‌یه‌ك وتار بلاوكراوه‌ته‌وه ، به‌وێنه : « ده‌ستووری نووسینی كوردی »[١٨٧] ؛ « چه‌ند سه‌رنجێكی زمانه‌وانی »[١٨٨] ؛ « جارێكی تریش پیته‌كانی كوردی »[١٨٩] ؛ « رێنووس په‌یره‌وی زمانناسی بكا باشه »[١٩٠] ؛ « دواوانێك**

---

(١٨٥) مه‌سعوود محه‌مه‌د ، سه‌رچاوه‌ی ناوبراو ، رێنووسی كۆڕ ، ل ٢٦٢ ـ ٢٦٣ .

(١٨٦) د. ئه‌وره‌حمانی حاجی مارف ، گیروگرفتی رێنووسی كوردی به ئه‌لفوبێی عه‌ره‌بی ، ل ٥٤ ـ ٥٨ .

(١٨٧) ع . ع . شه‌ونم ، ده‌ستووری نووسینی كوردی ، گۆڤاری « برایه‌تی » ژ ٢ ، سالی ١ ، به‌غدا ، ١٩٧٠ ، ل ٣٢ ـ ٣٥ .

(١٨٨) د. كه‌مال فوئاد ، چه‌ند سه‌رنجێكی زمانه‌وانی ، گۆڤاری « رۆژی كوردستان » ، ژ ٢ ، به‌غدا ، ١٩٧١ ، ل ٥٨ ، ٥٩ .

(١٨٩) محه‌مه‌د صالح سه‌عید ، جارێكی تریش پیته‌كانی كوردی ، گۆڤاری « نووسه‌ری كورد » ، ژ ٤ ، به‌غدا ، ١٩٧١ ، ل ٦٤ ـ ٧٠ .

(١٩٠) محه‌مه‌د ئه‌مین هه‌ورامانی ، رێنووس په‌یره‌وی زمانناسی بكا باشه ، گۆڤاری « ئاسۆی زانكۆیی » ، سلیمانی ، ١٩٧٨ ، ژ ١٠ ، ل ٨٨ ـ ٩١ .

(١٩١) ره‌ئووفی ئه‌حمه‌د ئالانی ، دواوانێك بۆ رێنووسی كوردی ، رۆژنامه‌ی « هاوكاری » ، به‌غدا ، ١٩٧٩ ، به‌شی یه‌كه‌م ، ژ ٤٦٩ ، ل ٦ ـ ٧ ؛ به‌شی دووه‌م ، ژ ٤٧١ ، ل ٣ ؛ به‌شی سێیه‌م ، ژ ٤٧٢ ، ل ٣ ، ٧ .

(١٩٢) ره‌ئووفی ئه‌حمه‌د ئالانی ، رێنووسی كوردی و چه‌ند هه‌لوێستێك ، رۆژنامه‌ی « هاوكاری » ، به‌غدا ، ١٩٧٩ ، به‌شی یه‌كه‌م ، ژ ٤٧٨ ، ل ٣ ؛ به‌شی دووه‌م ، ژ ٤٧٩ ، ل ٣ ؛ به‌شی سێیه‌م ، ژ ٤٨٥ ، ل ٣ ؛ به‌شی چواره‌م ، ژ ٤٩٠ ، ل ٣ .

بۆ رێنووسی کوردی»[191] ؛ «رێنووسی کوردی و چەند هەڵوێستێك»[192] و هەندێکی تر[193] .

ساڵی ١٩٨٠ دەستەی کوردیی کۆڕی زانیاری عێراق بڕیاریدا ، کۆڕێك بۆ لێکۆڵینەوەی گیروگرفتەکانی رێنووسی کوردی ببەستێ . بەم بۆنەیەوە بانگەوازێکی بڵاوکردەوە[194] و داوای لە رووناکبیرانی کورد کرد ، لەوبارەیەوە باس ئامادە بکەن و بەشداری ئەو ئەرکە بکەن . . . ئەوەندەی پێ نەچوو چەندین باس و لێکۆڵینەوە

گەیشتە بارەگای کۆڕی زانیاری و لە ماوەیەکی کەمدا بە رۆنیۆ بۆ کۆڕی گیروگرفتی رێنووسی کوردی ئامادەکران . . . بەڵام لەبەر چەند هۆیەك کۆڕی ناوبراو نەبەسترا و تێکڕای وتارەکان : «خاڵبەندی بۆ رێنووسی کوردی»[195] ؛ «گیروگرفتەکانی رێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی»[196] ؛ «زەنگی کاروانی رێنووسی کوردی»[197] ؛ «گیروگرفتەکانی رێنووسی کوردی و شێوەی

---

(١٩٣) بێگومان لە کورتە باسێکی وادا مەودای ئەوە نییە لە سەرپاکی ئەو کارانە بدوێین کە پێوەندیان بە کێشەی رێنووسی کوردییەوە هەیە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ، توانیومانە لە تێکڕای گرنگەکانیان بکۆڵینەوە و بە گشتیش ئەوەی هەیە ، زوربەی زۆری باس بکەین .

(١٩٤) بانگەوازێك لە دەستەی کوردیی کۆڕی زانیاری عێراقەوە (کۆڕێك بۆ گیروگرفتی رێنووسی کوردی) ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد» ، ب ٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٢٩٦ ـ ٢٩٨ .

(١٩٥) د . کامیل بەسیر ، خاڵبەندی بۆ رێنووسی کوردی ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد» ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٥ ـ ١٥ .

(١٩٦) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، گیر وگرفتەکانی رێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد» ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٦ ـ ٧٧ .

(١٩٧) ئیبراهیم ئەمین باڵدار ، زەنگی کاروانی رێنووسی کوردی ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد» ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٧٨ ـ ١١١ .

جـارکردنیـان »[198] ؛ « رێنفیسینا کـوردی ب تیپێت عەرەبی »[199] ؛ « رێنـووسی کـوردی»[200] ؛ «رێنـووسی کـوردی»[201] ؛ «چـۆنیـەتی نـووسینی چـاوگـەی نەسادە»[202] ؛ «فرێدان و هەڵبواردن لە بەکـارهێنان و نـووسینی کوردیـدا»[203] ؛ «نووسینی کوردی لە روانگەی فۆنەتیکەوە»[204] ؛ «چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی رێنووس و ئەلفوبێی کوردی»[205] ؛ «گیـروگرفتـەکانی نـووسینی کوردی لـە تای ترازووی پیتە بزوێن و نەبزوێندا»[206] ؛ «پێشەکی چۆن بنووسین ؟ لە دەنگەوە بۆ

---

(١٩٨) شاکیر فەتتاح ئەحمەد ، گیـروگرفتـەکانی رێنـووسی کوردی و شێـوەی چارکـردنیان ، «گۆڤاری کـۆڕی زانیاری عێـراق ـ دەستەی کـورد» ، ب ٩ ، بەغـدا ، ١٩٨٢ ، ل ١١٢ ـ ١٣٤ .

(١٩٩) صادق بەهائەدین ئامێدی ، رێنڤیسینا کوردی ب تیپێت عەرەبی «گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد» ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٣٥ ـ ١٤٨ .

(٢٠٠) طاهیر صادق ئەحمەد ، رێنووسی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٤٩ ـ ١٧٣ .

(٢٠١) عومەر عەبدولرەحیم ، رێنووسی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٧٤ ـ ١٨٥ .

(٢٠٢) د. کوردستان موکریانی ، چۆنیەتی نووسینی چاوگەی نەسادە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٨٦ ـ ٢١١ .

(٢٠٣) محەمەد صالح سەعید ، فریدان و هەڵبواردن لـە بەکـارهێنان و نـووسینی کوردیـدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کـورد » ، ب ٩ ، بەغـدا ، ١٩٨٢ ، ل ٢١٢ ـ ٢٢٨ .

(٢٠٤) محەمەد مەعرووف فەتتاح ، نووسینی کوردی لە روانگەی فۆنەتیکەوە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٢٢٩ ـ ٢٦٧ .

(٢٠٥) مەسعوود محەمەد ، چارەسەرکردنی گیروگـرفتەکـانی رێنووس و ئـەلفوبێی کـوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کـورد » ، ب ٩ ، بەغـدا ، ١٩٨٢ ، ل ٢٦٨ ـ ٣٥٩ .

(٢٠٦) نووری عەلی ئـەمین ، گیـروگرفتی نـووسینی کوردی لـە تای تـرازووی پیتە بـزوێن و نەبزوێندا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستـەی کورد » ، ب ٩ ، بـەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٣٦٠ ـ ٤١٩ .

وشه ، تا رسته»[207] ؛ «ئیملای کوردی و چەند تێبینی یەك»[208] ؛ «گیروگرفتی نووسینی فرمان لەگەڵ راناو لە رووی پێکەوە نووسان و پێکەوە نەنووسانەوە»[209] ؛ «الكلمات العربية المستعملة في اللغة الكردية»[210] لە ژمارە (٩)ی گۆڤاری کۆڕدا بڵاوکرانەوە .

بەشێك لەو وتارانەی بۆ کۆڕی گیروگرفتی رێنووسی کوردی نووسراون خاسیەتی زمانی کوردییان باش تێدا خوێندراوەتەوە و بەشێکیشیان بە ئاشکرا کاری زمانی بێگانەیان پێوە دیارە . بەشێکیان لەسەر بناغەی زانستی نووسراون و کێشەی ئاڵۆزی جۆربەجۆریان رەواندۆتەوە و ئەنجامی سەرکەوتوویان وەدی هێناوە ، بەڵام بەشێکی تریان لاواز و سادە و ساکارن . . . لەگەڵ جیاوازی رادەی وتارەکاندا پێویستە ئەو راستی یە لەیادنەکەین کە هەر نووسەرە (جگە لە د . کامیل بەسیر) بەپێی توانست و زانینی ، هەوڵی داوە و خۆی ماندوو کردووە . . . بەڵام د. کامیل بەسیر ، کە ئەندامێکی دیار و بەرز و چالاکی دەستەی کوردیی کۆڕی زانیاری عێراقە ، بە خشکەیی زانیاری لە کتێبێکی حەفتا ساڵ لەمەوبەر چاپکراوی عەرەبی یەوە ـ « الترقيم و علاماته في اللغة العربية »[211] ، بێ ئەوەی ناوی بەرێ وەرگرتووە و کردوویەتی یە کوردی و بەناوی «خاڵبەندی بۆ رێنووسی کوردی» یەوە بڵاوی کردۆتەوە[212] .

---

(٢٠٧) د. نەسرین فەخری ، پێشەکی چۆن بنووسین ؟ لە دەنگەوە بۆ وشە ، تا رستە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٤٢٠ ـ ٤٣٣ .

(٢٠٨) د. وریا عومەر ئەمین ، ئیملای کوردی و چەند تێبینی یەك ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد» ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٤٣٤ ـ ٤٤٩ .

(٢٠٩) د. ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ، گیروگرفتی نووسینی فرمان لەگەڵ راناو لەرووی پێکەوە نووسان و پێکەوە نەنووسانەوە ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد» ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٤٥٠ ـ ٤٨٨ .

(٢١٠) ابو زيد مصطفى السندى ، الكلمات العربية في اللغة الكردية ، «مجلة المجمع العلمي العراقي ـ الهيئة الكردية» ، المجلد ٩ ، بغداد ، ١٩٨٢ ، ص ٤٨٩ ـ ٥١٠ .

(٢١١) احمد زكي باشا ، الترقيم وعلاماته في اللغة العربية ، مصر ، ١٩١٢ .

(٢١٢) سەبارەت بە کاری نارەوای دژ بە زانستی د. کامیل بڕوانە :
أ ـ د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، مووررووی مالاوسێ مەگەر بە شەو بکرێتە مل ،

لە نێو کۆمەڵە باسی ژمارە (٩)ی گۆڤاری کۆڕدا هەرە دیار وتاری «چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی ڕێنووس و ئەلفوبێی کوردی»ی مامۆستا مەسعوود محەمەدە ، کە وردی و قووڵی و شارەزایی لە زۆر شوێنیدا دەدرەوشێتەوە .



لە ئەنجامی نیشاندانی ئەو مێژووەی نووسینی کوردیدا ، ئەوەمان لێ ئاشکرا بوو ، کە دەمێ ساڵە نووسەرانی کورد کێشەی چۆنیەتی نووسینی زمانەکەیان لە بەرچاو گرتووە و هەوڵی نەهێشتنی گیروگرفتەکانیان داوە تا لە پاشاگەردانی ڕزگاریان بێ و ئەلفوبێی عەرەبی وا لێ بکەن بتوانرێ دەنگە کوردییەکانی بە جۆرێکی وا پێ دەرببڕرێ ، خوێندەواری کورد بتوانێ ئەوەی دەیڵێ بیخاتە سەر کاغەز .
هەرچەندە هەوڵ و کۆششی زانایانی کورد و کوردناسان لەو مەیدانەدا جێی خۆی گرتووە و ئەمڕۆ ڕێنووسێکی تارادەیەك باش بۆ نووسینی کوردی سازبووە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ئەلفوبێیەی ساڵەهای ساڵە خزمەتی دەکرێ ، هێشتا هێندەی گیروگرفت تێدایە کە لە ژماردن نایە و چارەسەرکردنیان دژوارە[٢١٣] .
بەداخەوە تائێستاش ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردی نییە و ، بۆیە دەبینین هەر کۆمەڵە نووسەرێك بە جۆرێك دەنووسن و زۆر جاریش تاکە نووسەرێك بە چەند جۆرێك دەنووسێ . ڕاستە هۆی سەرەکی ، باش نەگونجانی ئەلفوبێکەیە ، بەڵام ئاشکراشە زوربەی ئەو کۆششانەی لەم مەیدانەدا کراون ، لەلایەن لیژنە یان

═ گۆڤاری «نووسەری کورد» ، ژ ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٥١ ـ ٧٤ .
ب ـ د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، لە ڕێگای ڕاستگۆیی و دەستپاکی و زانستدا ، ڕۆژنامەی «عێراق» ، بەشی یەکەم ، ژ ٢١٦٠ ، بەغدا ، ٩ی مارتی ١٩٨٣ ، ل ٧ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٢١٧٩ بەغدا ، ٣٠ی مارتی ١٩٨٣ ، ل ٧ .

(٢١٣) ئەوەی لە ڕووی سادە و ساکاریی کتێبی «ڕێنووسی کوردی لە ڕەگەوە و ڕیشەوە» تەواو جێی ڕەخنە بێ ، ئەوەیە کاتێ لە کۆتاییدا (ل ٥٥ ـ ٥٦) باسی گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی دەکات ، هەشت خاڵی ئێجگار سەرپێیی دیاری کردووە . . . ئەوەی کەمێ ئاگاداری ڕێنووسی کوردی بێت ، دەزانێ کۆسپ و گیروگرفت هێندە زۆرن بیر و قەڵەم و دەست ماندوو دەکەن .

کۆمەڵێکی شارەزای نووسینەوە نەبووە ، بەڵکو کاری تاکە کەسانێک بووە . زوربەی ئەو تاکە کەسانەش هەرچەندە کارەکەیان بێسوود نەبووە و ڕووی چاکی بەرهەمیان تارادەیەك جێی خۆی کردۆتەوە ، بەڵام ڕادەی زانستی یان یاریدەی باش بەجێ هێنانی ئەو ئەرکەی نەداون و هەروەها خاوەنی دەستەڵاتیش نەبوون ، کە بیروڕاکانیان بە زۆر بسەپێنن . . . سازبوونی ڕێنووسێکی لەبار و ڕێك وپێکی یەکگرتووی کوردی ، پێویستی بە بەستنی کۆڕێکی زانستانەیە ، کە شارەزایانی ئەو مەیدانە لێکۆڵینەوەی خۆیانی تێدا پێشکەش بکەن . دەبێ لیژنەیەکی کارامە و شارەزاش پێك بهێنرێ و مافی بدرێتێ تا لەسەر بناغەی ئەو وتارانە و دوای شەن و کەو کردن و بەراورد و بژارکردن و وردبوونەوە لە مەسەلەکە بتوانێ بیرێکی پوخت لەبارەیەوە هەڵهێنجێ و پرۆژەی نووسینی کوردی ئامادە بکات . بەڵام هەموو ئەمانەش جێگەی تەواوی خۆیان ناگرن ، ئەگەر لە لایەن کاربەدەستانەوە شێوەی ڕەسمی پێ نەدرێ .



# گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی
# بە ئەلفوبێی عەرەبی

بەر لەوەی دەست بدرێتە دانانی ڕێنووسێکی ڕێك وپێك و لەبار ، پێویست بە لێکۆڵینەوەیەکی قووڵی فۆنەتیکە ، بەتایبەتی لە دیاریکردنی تێکرای فۆنێمەکانداو ئنجا دانانی نیگار بۆ هەر یەکێك لەو فۆنێمانە . دوایش پێویستە ئەو پیتانە لەگەڵ یەکتردا بەراورد بکرێن ، تاکو بزانرێ بوون و نەبوونیان چ دەورێك دەبینێ .

وەك ئاشکرایە (دەنگ) لە ڕێگای ئەندامەکانی ئاخاوتنەوە دەردەبڕرێت و بەهۆی بیستنەوە هەستی پێ دەکرێ . (پیت) وێنەی دەنگە ، بە نیشانە لە نووسیندا دیارکراوە و بەهۆی بینینەوە وەردەگیرێ . ڕاستە مرۆڤ نەك تەنها دەتوانێ وشە بڵێ ، بەڵکو هەروەها دەتوانێ بیشینووسێ ، یاخود چاپی بکات ، بەڵام کاتێ دەنووسین یاخود شت چاپ دەکەین ، ئەوسا وێنەی دەنگەکانی ئاخاوتن بە پیت نیشاندەدەین . بەڵێ زمان دوو دیوی هەیە : ئاخاوتن و نووسین . بەڵام ئاخاوتن ڕەسەنترە و پێش نووسین کەوتووە . منداڵ لە سەرەتادا فێری قسەکردن دەبێ و دوایی نووسین . زۆر کەسانیش هەن سەد ساڵ دەژین و ڕەوان و پاراو بە زمانەکەیان دەدوێن ، بێئەوەی فێری خوێندنەوە یان نووسینی پیتێك بووبن . لەم سەدەی بیستەمەشدا هێشتا میللەتی وا هەیە کە لەو دەستکەوتە مەزنەی شارستانییەت بێبەشە .

تا ئێرە کەمێ لە جیاوازیی نێوان (دەنگ) و (پیت) دواین ، ئنجا دێینە سەر بەراوردکردنی (دەنگ) و (فۆنێم) . وەك ئاشکرایە ، فۆنێم بەو دەنگانە دەوترێ کە لە زماندا وشە پێك دەهێنن و بە گۆڕان و لاچوونیان واتا دەگۆڕن . بۆ نموونە ، ئەگەر فۆنێمی (ا) لە وشەی « باز » دا بگۆڕێت بە (ە ، ۆ ، ێ . . .) ، ئەوە ئەم وشانە « بەز، بۆز ، بێز . . . » پەیدادەبن ، کە جیاوازییەکی تەواو لە مانایاندا هەیە ـ واتە لێرەدا فۆنێمی (ە ، ۆ ، ێ . . .) دەوری گۆڕینی مانای وشەی « باز » دەبینن . ئەگەر فۆنێمی (ز) یش لە وشەی «ناز» دا بگۆڕێت بە (ن ، ڵ ، ڤ ، خ . . .) ئەوە

ئەم وشانە : « نان ، ناڵ ، ناڤ ، ناخ . . . » دروست دەبن ، کە هەر یەکەیان مانای تایبەتی خۆی هەیە ـ *واتە بەمجۆرە دەبینین کەوا* فۆنێمی (ن ، ڵ ، ڤ ، خ . . .) مانای وشەی « ناز » دەگۆڕن . . . لێرەدا پێویستە ئەوەش لەیادنەکەین ، کە هەرچەندە فۆنێم کاری جیاکردنەوەی گۆڕینی مانا بەجێ دەهێنێ ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەتەنیا خاوەنی مانا و واتا نییە .

(فۆنێم) لە (دەنگ) گرنگترە ، چونکە جیاوازی دەخاتە نێوان وشەوە . هەموو فۆنێمێك ، دەنگە ، بەڵام هەموو دەنگێك ، فۆنێم نییە . بەوێنە : (قیژە ، هاوار ، قۆرەی سك ، قرقێنە ، نزگەرە ، پرخەپرخ ، کۆکە . . .) هەموو دەنگن ، بەڵام هیچیان فۆنێم نین . یاخود کاتێ (گ ،ك) لەپێش (ی ، ێ ، وێ ، وی) دا دەگوترێن ، شێوەی تەلەفوزیان وەك (چ) یان (ج) ی لێ دێت ـ واتە (گ) و (ك) لە حاڵەتی ئاساییدا لە بنی ئەوکەوە تەلەفوز دەکرێن ، بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا زمان نزیك مەڵاشوو دەخاتەوە . بەوپێیە دەبنە دەنگی جیاوار ، بەڵام نابنە فۆنێمی جیاواز . . . هەروەها لە زمانی کوردیدا هەمزە (ئـ) کە بەتایبەتی لە سەرەتای وشەوە بۆ یاریدەی دەربڕینی دەنگە بزوێنەکان دێت ، دەنگە بەڵام فۆنێم نییە[1] . . .

---

(١) مامۆستا مەسعوود محەمەد لە خاڵی دووەمی وتاری «ڕەواندنەوەی دوو ڕەخنە» (گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ژ ٨٠ ، ل ٢ ـ ٨)دا ڕای خۆی سەبارەت بە هەمزە دەربڕیوە . . . لە سەرەتای ئەم باسەدا نووسیوێتی دەڵێ : «با لە پێشەوە ئەوە بڵێم نووسینی لاتینیش وا دەبێ سەر لە نووسەر و لێکۆڵەرەوەی کورد دەشێوێنێت وەك کە دێت و لەبری (ئا ، ئۆ ، ئی . . .) تەنها یەك پیت دەنووسێت کەچی هەریەکەیان بریتییە لە دوو دەنگی سەربەخۆی تەواو و چ فەرقێك نییە لەنێوان (دا ، دۆ ، دی) و (ئا ، ئۆ ، ئی) لە ڕووی ژمارەی دەنگەکانیانەوە ، نووسینی لاتینی کە بایەخی بە دەنگی (همزە) نەداوە و لەوەشدا سەهوێکی زلی کردوە ، کێشەی بۆ ئێمەش ناوەتەوە کە بەشێکی بەرچاوی لێکۆڵەرەوەی کورد بەشوێن هەنگاوی ئەو سەهوەدا دەڕۆن و دەمەتەقە لەسەر بایەخی دەنگی (همزە) هەڵدەستێنن و دانەنانی نیشانە بۆ هەمزە لە نووسینی کوردیدا بە ڕاست دەزانن ، کەچی دەنگێکی زێدە ڕەسەن و کۆنی زمانەکەمانە ، هەر ئەوەندە هەیە لە ئاخاوتنی ئێستاکەماندا هەمزە لەناو توێژی وشەدا نەماوەو بە زۆری لە بەرایی وشەوە دێت ، تەنها لە ڕێژەی موزاریع و ئەمر نەبێ ، وەك : دەئاخێوێ ، دەئەنجنێ ، بئاخێوە ، بئەنگێوە ، دەئەزموم . . . لە کوردیدا دەنگی لامی قەڵەویش لە بەرایی وشەوە نایەت کەسیش ناڵێ

ئێمە کە لە ڕێگایەکی زانستییەوە سێ مەفهوومی (فۆنێم) و (دەنگ) و (پیت)مان جیاکردەوە ، بەوە کارمان لە سازکردنی ئەلفوبێدا ئاسان دەبێت ، چونکە کە دەنگەکانی زمانی کوردیمان دیاری‌کرد ، ئەوسا دەزانین دەبێ نیگار بۆ چی بکێشین . بەوێنە کە بۆمان دەرکەوت (م ، ن ، د ، ڤ ، ش ، پ . . .)

---

= با نیشانەی بۆ دانەنرێت (ل ٣) . بەر لەوەی بڕیار بدرێ کە هۆی بایەخ پێ نەدانی لاتینی بە دەنگی هەمزە «سەهویەکی زل بێت» ، پێویست بە لێکۆڵینەوەی فۆنەتیکە ، بەتایبەتی لە دیاری‌کردنی تیکرای فۆنێمەکاندا و ئنجا دانانی نیگار بۆ هەر یەکێك لەو فۆنێمانە . دوایش پێویستە ئەو پیتانە لەگەڵ یەکتردا بەراورد بکرێن ، تاکو بزانرێ بوون و نەبوونیان چ دەورێك دەبینێ . . .
بێتوو ساغ بکرێتەوە کە هەمزە (ئـ) فۆنێم نییە ، ئەوە هیچ پێویست بەوە ناکات پیتی بۆ دابنرێت ، خۆ ئەگەر چەسپێنرا کە فۆنێمە ، دەبێ لە ئەلفوبێدا وێنەی بۆ بکێشرێ . . . بە ڕای ئێمە لە زمانی کوردیدا (ئـ) فۆنێم نییە ، بەڵکو دەنگێکی یاریدەدەرە و لە سەرەتای ئەو وشانەوە یاخود ئەو برگانەوە پەیدا دەبێ کە بە بزوێن دەست‌پێ‌دەکەن . سەرەڕای ئەوەی تێچوونی هەمزە لە وشەی لێکدراوی کوردی ، وەك «گوڵ + ئاو = گوڵاو ؛ ماست + ئاو = ماستاو ؛ زەرد + ئاو = زەرداو ؛ سەر + ئێش +ە = سەریەشە . . .»و بوونی هەمزە بە بزوێن لەو وشانەدا کە لە زمانی عەرەبی‌یەوە وەرگیراون ، وەك : «دائم ـ دایم ، دائرە ـ دایەرە ؛ مسألة ـ مەسەلە ؛ بئر ـ بیر . . .» و بەکارنەهێنانی لە ناوەڕاست و کۆتایی (لە زمانی کوردیدا هەمزە لە کۆتایی وشەدا تەنیا لە وشەی «نەء»دا دەبینرێت ، کە ئەویش بە زۆری دەکرێ بە «نا») وشەدا . . . ئەوە دەسەلمێنین کە هەمزە فۆنێم نەبێ و دەنگێکی یاریدەدەر بێ .
جا بە لای منەوە نووسینی لاتینی کە بایەخی بە دەنگی هەمزە نەداوە مەسەلەکە سەهوکردن نییە ، بەڵکو ئەوەیە کە هەمزە (دەنگ)ەو (فۆنێم) نییە . وەك لە سەرەوەش ڕوونمان کردەوە ، هەموو دەنگێك فۆنێم نییە و ڕاستیش وایە نیشانە بۆ ئەو دەنگانە دابنرێن ، کە فۆنێم بن . . . ئەو وشانەش : (دەئاخێوێ ، دەئەنجنێ ، بئاخێوە ، بئەنگێوە ، دەئەزموم . . .) کە دەنگی هەمزەیان تێدایەو مامۆستا مەسعوود بۆ پتەوکردنی بۆچوونەکەی هێناونیەوە ، بەئاشکرا تیاندا دەردەکەوێ کە پێویستی فۆنەتیکی ئەو هەمزەیەی هێناوەتە کایەوە ، کە ئەوەش پێکهاتنی وشەکان سازیان کردووە ، چونکە ئەو نیشانانەی لەپێش وشەکانەوە هاتوون بە بزوێن دەست‌پێ‌دەکەن . سەرەڕای ئەوە ، جگە لە دوا وشە (دەئەزموم) ، هەموو ئەوانی دی (دەئاخێوێ ، دەئەنجنێ ، بئاخێوە ، بئەنگێوە) برگەی یەکەمی ئەو ڕێژانە بە بزوێن کۆتاییان هاتووە بۆیە بۆ ئاسانکردنی دەربڕینیان =

فۆنێمن ، ئەوە تێدەگەین کە پێویستیان بە پیتە . یاخود بەپێچەوانەوە ، کە زانیمان دەنگی (گ) لــە وشـــەی «گــەر» و «گــێر»دا لــەگــەڵ جیــاوازیی شـێــوەی تەلەفوزکردنیشیاندا ، هەر یەك فۆنێمن ، ئەوە ئـەو هەڵـەیە نـاکەین کـە وێنەی جیاوازیان بۆ دابنێین . . . لەبەر ئەوەی گومان لەوەدا نییە ، کە لە زمانی کوردیدا بزوێنی (و ـ u)ی کورت و (وو ـ ū)ی درێژ دوو فۆنێمن ، بۆیە دەبێ هەریەکەیان

---

(ئـ) هاتۆتە پێشەوە . بەوێنە لە وشەکانی «دەئاخێوێ ، دەئەنجنێ»دا برگەی یەکەم ـ واتە (دە) کە نیشانەی کرداری ئێستایە ـ بە بزوێن کۆتایی دێت و سەرەتای رەگی وشەکانیش بە بزوێن . . . لە وشەکانی « بئاخێوە ، بئەنگێوە» دیسان برگەی یەکەم ـ واتە (بـ ـ bi) کـە نیشانەی فەرمانە ـ بە بزوێن کۆتایی دێت و سەرەتای رەگی وشەکانیش بە بزوێن . . . دوا نموونەش «دەتەزمووم» وەك دوو وشە خۆی دەنوێنێ ، چونکە جێناوی (ت) کە چووەتە سەر نیشانەی (دە) بووەتە وشەیەك و ئەوی دەمێنێتەوە (ئەنگێوم)» . . .

بەو پێیە دەرکەوت کە هۆی بوونی هەمزە لەو نموونانەدا ئەوە نییە کە مامۆستا مەسعوود بۆی چووە ـ واتە دنگێکی واتاداری رەسەن ـ نییە ، بەڵکو دەنگێکی یاریدەدەرە لە سەرەتای ئەو وشانەوە یاخود ئەو برگانەوە پەیدا دەبێ کە بە بزوێن دەست پێ دەکەن .

بەڵگەیەکی دی مامۆستا مـەسعوود محـەمەد بـۆ پێویـستی بـوونی پیتی هەمـزە لە ئـەلفوبێی لاتینیدا ، ئەوەیە کە دەڵێ : «لە کوردیدا دەنگی لامی قەڵەویش لە بەرایی وشەوە نایەت ، کەسیش ناڵێ با نیشانەی بۆ دانەنرێت» (ل ٣) . . . بە رای من ئەم بەڵگەیەش لەبار نییە و جیاوازی لەنێوان ئەو دوو دەنگەدا ـ واتە (ئـ) و (ڵ) ـ زۆرە ، ئەویش چونکە وەك وتمان (ئـ) لە کوردیدا فۆنێم نییە ، بەڵام (ڵ) فۆنێمە . بۆنموونە ئەگەر فۆنێمی (ل) لە وشەی «پەلە ، کەل . . .»دا بگۆڕێت بە (ڵ) ، ئەوە دەبن بە «پەڵە ، کەڵ . . .» کە جیاوازییەکی تەواو لە مانایاندا هەیە ـ واتە لێرەدا گومان لەوەدا نییە کە (ڵ) و (ل) دوو فۆنێمن ـ هەروەها ئـەو بەڵگانەی پێشتر بۆ گومان کردن لەوەی هەمزە دەنگێکی واتادار بێ هێناومانەتەوە ، وەك : هاتنی تەنیا لە

پێش بزوێنەوە و تێچوونی لە وشەی لێکدراودا و بوونی بە بزوێن لەو وشانەدا کە لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراون . . . بە نیسبەت دەنگی (ڵ)ەوە بەپێچەوانەوەیە ـ واتە بە شێوەی جۆربەجۆر لە ناوەراست و کۆتایی وشەدا زۆر بەکاردێت و لە وشەی لێکدراودا تێناچێ و تەنانەت دەنگی (ل)ی هەندێ وشەی عەرەبی وەرگیراویش لە کوردیدا بووە بە (ڵ) .

جـا کە ئـەو هەمـوو جیاوازییـە لەنێـوان ئەو دوو دەنگـە ـ واتە (ئ) و (ڵ) ـ دا هـەبێ ، بەراوردکردنیان لەبار نییە . یاخود کە گومان لەوە نەبێ ، لە زمانی کوردیدا (ڵ) فۆنێم بێ ، ئیتر بۆ کەس داوای ئەوە بکات نیشانەی بۆ دانەنرێت .

وێنەی خۆی هەبێ . . . ئەگەر لێکۆڵینەوە ئەوە ئیسپات بکا کە (ی)ی کورت و تێژ یش وەك فۆنیمی سەربەخۆ خۆیان دەنوێنن ، ئەوە پێویستە نیگاری جیاوازیان بۆ بکێشرێ . بەڵام ئەگەر روون کرایەوە ، کورت و درێژ ی تەلەفوزکردنی ئەو دەنگانە هۆی بوون و نەبوونی هێز بێ و دەوری واتاگۆری نەبینێ ، ئەودەم جیاکردنەوەی وێنەیان شتێکی راست نییە . . . بێتوو ساغ بکرێتەوە کە ئەو وەستانەی لەنێوان وشەکانی ، وەك «دز ، دڵ ، من ، کردن ، شتن ، بردن . . . »دا دێت قورس کردن بێ ، ئەوە هیچ پێویست بەوە ناکات پیتی بۆ دابنرێ ، خۆ ئەگەر چەسپێنرا کە کورتە بزوێنە ، دەبێ لە ئەلفوبێدا وێنەی بۆ دابنرێ . . . هتد .

---

= ماموّستا مەسعورد محەمەد لە وتاری « لەگەڵ دەنگسازی کوردیدا » (گۆڤاری «رۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩٥ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٧ ـ ٣٣)دا وەڵامی ئەو قسانەی من دەداتەوە و لە سەرەتای باسی کێشەی (هەمزە)دا دەڵێ : « گوتارەکەی د. ئاورەحمان کە بیروڕای فۆنۆلۆجیستەکان لەبارەی هەمزەوە پەسەند دەکات و لەوانەوە بەڵگە دەهێنێتەوە بۆ فۆنیم نەبوونی ئەو دەنگە ، بەرەو لێکدانەوەیەکەوە دەڕوات کە لەپێشەوە بڕیاری خۆی داوە بۆ ئیعدام کردنی هەمزە » (ل ٢٨) .
وەك ئاشکرایە ، هەر زمانە خاوەنی تایبەتێتی خۆیەتی ، لەبەرئەوە پێویستە لێکۆڵینەوە لە هەر زمانێك لەسەر کەرەستەی چەسپاوی ئەو زمانە دابرێژرێت ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەك ماددەیەکی زانست دەستوور و یاسای گشتی هەیە ، ئەویش کە مەبەستی شێوازی گشتییە لە لێکۆڵینەوەی پێکهاتنی دەستوور و یاسادا . هەرچەندە هەر زمانە خاوەنی کەرەستەی تایبەتی و شێوەی جیاواز و بەکارهێنانی سەربەخۆیە و ئەو تایبەتیانە لە زمانانی جیاوازدا دەبینرێن ، کەچی سەرەڕای ئەوەش هەندێ بنەما هەن ، کە پێویستە بخرێنە نێو لێکۆڵینەوەی هەر زمانێکەوە . بەوپێیە بۆ تێگەیشتنی دەستوورە سەرەکییەکانی فۆنەتیکی کوردی پێویست بە ئاوڕدانەوە و لێکدانەوە و شی کردنەوەی هەندێ کێشەی فۆنۆلۆجی هەیە .
گومان لەوە ناکرێ کە هیچ زمانەوانێك ناتوانێ ئەنجامی باش وەدەست بێنێ ، ئەگەر شارەزایی لە زانستی زماندا نەبێت . ئاگاداربوون لە مەسەلەی زمانەوانی و کەڵك وەرگرتن لە دەستوورە رێك‌وپێکەکانی مانای « ئیعدام کردن »ی زمانی زگماك نییە ، بەڵکو نیشانەی گرتنەبەری ڕاستە شەقامی لێکۆڵینەوەی زانستییە . . . ماموّستا مەسعورد کە لەم وتارەیدا باسی دەنگی (ئاوازەدار) و (کپ) دەکات ، خۆی مەفهوومی دابەش کردنی دەنگ بەسەر ئاوازەدار و کپدای دۆزیوەتەوە یان لە فۆنۆلۆجیستەکانەوە وەری گرتووە ؟ ئەرێ کە لە جیاوازیی نێوان تێگەیشتنی (فۆنۆلۆجی) و (فۆنەتیك) دەدوێ بیروڕای خۆیەتی یان هی ئەو

=

چۆن ڕێنووس پێوەندی بە فۆنەتیکەوە هەیە ، هەر بەوچەشنە پێوەندی بە ڕێزمانیشەوە هەیە . جا بۆیە پێویستە دەستوورەکانی ڕێنووس لەبەر تیشکی ڕێزماندا تەماشا بکرێن و گونجان و نەگونجانیان بەیەکەوە ڕەچاو بکرێ .

---

= فۆنۆلۆجیستانەیە کە من لەڕێی قسەکانیانەوە (هەمزە)م پێ « ئیعدام » کردووە ؟ ئەی لە کتێبی « چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی » (بەغدا ، ١٩٧٦)دا کە ژمارەیەك ناوگری کوردی تۆمار کردووە ، لەسەر پێناسەی چەسپاوی پرۆفیسۆرە ڕۆژئاواییەکان کارەکەی مەیسەر نەکردووە ؟ کاتێ لە هەمان کتێبدا باسی (اسم فاعل) و (اسم آلة) و (اسم مصدر) و (فعل) و (صفة) و (ضمیر) ی کوردی دەکات ، لەو مەیدانەدا لە ڕێزمانی عەرەبی‌یەوە کەڵکی وەرنەگرتووە ؟ . . . بەڵێ هەردووکمان کەڵك لە تەجروبەی پرۆفیسۆرەکان وەردەگرین . لەم ڕووەوە جیاوازی لەنێوانماندا ئەوەیە من ددانی پێدا دەنێم و ناویان دەبەم و پەنجە بۆ کارەکانیان ڕادەکێشم . . .

من بە شانازییەوە باسی ئەوە دەکەم ، کە لە هەر نووسینێکمدا کەڵك لەوەی پرۆفیسۆرە خۆ ماندوو کردووەکان هێناویانەتە بەرهەم ، وەردەگرم . ئەوەی ئەوان بە سەدان ساڵ خەریکی بوون و دوای شەن و کەو کردنی بە پاك و خاوێنی خستوویانەتە بەردەستمان ، چرای شەوقدارە بۆ تاریکستانی زمانەکەمان .

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ڕاستی‌یەك هەیە بیخەمە ڕوو ، ئەویش ئەوەیە کە بەداخەوە بە زمانی ڕووسی هیچ نووسینێکم بەرچاو نەکەوتووە ، کە باسی هەمزەی تێدا بێ . جا ئەمە هۆی کەم‌خوێندنەوە و کەمتەرخەمی خۆم بێ یان باس‌نەکردنی بێ لەلایەن ڕووسەکانەوە هیچ لەو ڕاستی‌یە ناگۆڕێ ، کە بۆ دانەنانی هەمزە بە فۆنێم لە کوردیدا ئەوەی نووسیومە ڕا و بۆچوونی خۆمە و مامۆستا مەسعوود بەخۆڕایی وای‌داناوە ، کە بەپێی پەسەندکردنی « بیروڕای فۆنۆلۆجیستەکان لەبارەی هەمزەوە » لەپێشەوە بڕیاری « ئیعدام کردنی هەمزە »م داوە . . . بەڵێ بەپێچەوانەوە بۆم هەیە لە مەسەلەی هەمزەدا من ڕەخنە لە مامۆستا مەسعوود بگرم ، چونکە لە نووسینەکەیدا ئاشکرا دیارە ، کە ئەو هەوڵی‌داوە زمانی کوردی بخاتە قاڵبی عەرەبی‌یەوە و فۆنێمی عەرەبی بەسەر کوردیدا ساغ بکاتەوە و بەمە گیان بەبەری هەمزەدا بکات .

مامۆستا مەسعوود بۆ پێ سەلماندنی بە فۆنێم دانانی دەنگی هەمزە لە کوردیدا بەراوردێکی هەمزەی لەگەڵ چەند دەنگێکی تردا کردووە و دەڵێ : « دەنگەکانی (هـ ، ح ، ع) هەمیشە لە سەرەتای وشەدا بزوێنی ئاشکرا لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن » (ل ٢٩) . ئەگەر بۆ ئەم مەبەستە تەماشای فەرهەنگی خاڵ بکەین ، چاومان بە ژمارەیەك وشە دەکەوێ کە (هـ ، ع ، ح) لە سەرەتای وشەوە هاتوون و بزوێنی ئاشکراشیان لەگەڵ خۆیاندا =

بەوێنە لە ڕستەی «لە بازار هێلکە و ڕۆنم کری . . .»دا ، «هێلکە» و «ڕۆن» دوو وشەی سەربەخۆن و هەریەکە خاوەنی واتای خۆیەتی . بەڵام کاتێ دەوترێ : «بەیانی هێلکەوڕۆنم خوارد» ، ئەوە دەدرێتە دەم یەك و وشەیەکی نوێ ـ «هێلکەوڕۆن» کە ناوی خواردنێکە پەیدا دەبێ . ئەگەرچی ئەم وشەیە لە ڕۆنانیدا چەند مۆرفیمێك هاریکاری کردووە ، بەڵام لەبەر ئەوەی بووەتە یەك وشە ، دەبێ

---

= نەهێناوە . . . خۆ ئەگەر ئەم دیاردەیە لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا کەم بێ ، ئەوە لە دیالێکتی ژووروودا ئەوەندە زۆرە ، کە بێتە بەڵگەی ئەوەی بە هیچ چەشنێك ئەو ڕایەی نووسەر نەسەلمێنین . بەوێنە : (هژمار ، هلفرین ، هلگرتن ، هلهاتن ، هنار ، هنەك ، هـرج ، هشیار . . . حلەت ، حش ، حـز ، حزکـەر . . . عجران ، عنگـر ، عرین . . .).

نووسەر پاشان (ئ) و (هـ) بە یەك دەگرێ و دەڵێ « دەنگی (هـ)ش بە زۆری وەك هەمزە لەنێو توێژی وشـەدا تێدەچێت . بەنموونە کـاری (هات) لـە ئاینـدەدا دەبێتە (دێت) و بەدەگمەن نەبێ ناگوترێ (دەهێت) » (ل ٢٩) . بەڵێ دەنگی (هـ) ئەو جۆرە گۆڕانـەی بەسەردا دێت ، بەڵام هەموو گۆڕانێك وەك یەك نییە . خۆ کرداری (ووتن)یش لە ئایندەدا دەبێتە (دەڵێت) و (کوشتن) دەبێتـە (دەکوژێت) و لـە هەنـدێ شوێن (ب) ی کـرداری داخوازی و ئیلزامی قووتدەدرێ و لەبریتی (ڕابکە ، هەڵبگرە ، وەربگرە . . .) دەوترێ (ڕاکە ، هەڵگرە ، وەرگرە . . .) و لە ئاخاوتنی ئەمرۆی سلێمانیدا (ت) ، کە لـەدوای (س)ەوە دێت، زۆر جار قووتدەدرێ و لەبریتی (دەست ، مەبەست) دەوترێ (دەس ، مەبەس) . . . ئەمانە و گەلێکی تر ، کە بەر دیاردەی گۆڕینی تێداچوونی دەنگێك یـان قووتدان یان سـوان یان قـرتانـدن دەکەون لـەگەڵ پـەیدابـوون و تێچوونی هـەمزەدا جیاوازییان زۆرە .

نووسەر لە بەردەوامیی ئەو لێدوانـەیدا دەڵێ : « کـاری هێنام دەبێتـە دێنم ، هەرچـەند دەشگوترێ (دەهێنم) ، بەڵام لە فـەرمانـدا بە زۆری (بێنـە) لەبـاوە » (ل ٢٩) ، ئەوە بەراوردەکەی دیسان کورت دێنێ ، چونکە لـەگەڵ تێچوونی دەنگی (هـ)دا هەروەهـا حاڵەتی مانەوەی(هـ)ش هەیە ـ واتـە چۆن (دێنم ، بێنـە) دەوترێ ، هـەر بەو چـەشنە (دەهێنم ، بهێنە)ش دەبیسترێ ، بەڵام هەرچی دەنگی (ئ)ە بەشی هەر تێچوونە .

مـامۆستـا مەسعـوود بۆ پتـەوکردنی هـەمان مـەبەستی بـەیەکگـرتنی (ئ) و (هـ) چـەنـد نموونەیەکی دی هێناوەتەوە . بەشێکیان ، بەوێنە (هەڵاتن ، هەڵێنان) ، شێوەی مانەوەی (هـ) ـ واتە (هەڵهاتن ، هەڵهێنان . . .) یشیان هەیە ، بەشەکەی تریشیان پێداویستی فۆنەتیکی بووە بەهۆی تێچوونی (هـ)ەکەیان . بەوێنە ڕاستە (هارین) لە وشەی لێکدراودا =

بەسەریەکەوە بنووسرێ . . . وەك دەزانین لە زمانی کوردیدا دوو مۆرفێمی (تـر) هـەیە ـ یـەکێکیـان ئـاوەڵنـاوی (تـر) ، وەك کـە دەوتـرێ : «نـانی تـر ، کورێکی تر . . .» . ئەوی دی‌یان نیشانەی بەراوردی (تر)ە ، وەك : «گەرمتر ،

---

= دەبێتە (دەستار) ، نـەك (دەستهار) ، بـەڵام هۆ ئـەوەیە بـەیەکـەوە هاتنی سێ دەنگی کۆنسـۆنانتی کپ : (س) و (ت) و (هـ) گرانە و بۆیە یەکێکیان تێداچووە .
مامۆستا مەسعوود لە باسی دەنگی (هـ)دا دەڵێ : « دەنگی (هـ) لە بەری سۆران و تێکرای کـوردستانی خـوارووا بەدەگمـەن نەبێ لـەناو تـۆیژی وشـەدا نەهـاتـووە وەك (نهۆم ، سەربهوردی) » (ل ٤٠) . نەك خۆ ماندووکـردنێکی زۆر و نەك گـەران بە فـەرهەنگی کوردیدا ، بەڵکو بە بیرکردنەوەیەکی کەم دەتوانین دەیان وشە بێنینەوە کە دەنگی (هـ)یان لەناو تۆیژدا بێت . بۆ بەڵگەی ئەو قسانەم و ڕەت‌کردنەوەی ڕای مامۆستا مەسعوود هەر لەو وشانەدا کە بە دەنگی (ب) یان (ن) دەست‌پێ دەکەن ، ئەو چەند نموونەیە دەخەمە پێش چاو : بەهێ ، بەهرە ، بەهار ، بەرهەم ، باهوو ، بەهانە ، بە ها، بەهەشت ، بەهرەمە ، بەهرەدار ، بەهـرەمەنـد ، بەهـرەوەر ، بێ‌هوودە ، بێ‌هـۆش ، بێ‌هاوتـا ، بەرهەڵست ، بەکارهێنان ، بەکارهاتن ، بەجێ‌هێنان ، بەجێ‌هاتن ، بـەسەرهـات ، بەسەرهاتن ، بەرهەم‌هێنان ، بـانگهێشتن ، بەجێ‌هێشتن . . . نهێنی ، نهۆم ، نهێم ، نهێنگر ، نهێنبر ، نەهەنگ ، نەهات ، نەهـار ، نەهێشتن ، نـاگەهـان ، ناهـەموار ، نهورم . . .
جا کە لە ئەنجامی ئەم لێدوانەماندا گەیشتینە ئەو ئەنجامەی لە زمانی کوردیدا دەنگی (هـ) لە سەرەتای وشەوە بێ‌ئەوەی بزوێنی ئاشکرا لەگەڵ خۆیدا بهێنێ هەیە و سەرەڕای ئەوە لەناو تۆیژی وشەشدا دەبینرێ ، ئیتر چۆن دەتوانین بەوە قایل بین کە وەك (ئ) بێت . هەرچی هەمزەیە لە زمانی کوردیدا وەك دەنگێکی یاربدەدەرە و لە سەرەتای ئەو وشانەوە یاخود ئەو برگانەوە پەیدا دەبێ کە بە بزوێن دەست‌پێ دەکەن . سەرەڕای ئەوەی تێ‌چوونی هەمزە لە وشەی لێکدراوی وەك « گوڵ + ئاو = گوڵاو . . . »و بوونی هەمزە بە بزوێن لەو وشانەدا کە لە زمانی عەرەبی‌یەوە وەرگیراون و بەکارنەهێنانی لە ناوەڕاست و کۆتایی وشەدا .
جا ئەگەر هۆی پەیدابوونی پیت بۆ دەنگی هەمزە لە ئەلفوبێی عەرەبی دەستکاری‌کراودا ئەوەبێ کە هەندێ لە وێنەی دەنگە بزوێنەکان بەتایبەتی لە سەرەتای وشـەوە نووسینیـان نالەبار بێ ؛ یاخود لەبەر ئەوە بێ کە دانەرانی بە فۆنێمی تێ‌گەیشتبن ، ئەمە نابێ زمانەوانان بەو هەڵەیەدا بەرێ ، کە وەك دەنگە کۆنسـۆنانتەکانی‌تری تەماشا بکەن .
هەر هەمـان هۆ ـ واتـە تێ‌گەیشتنی هـەمزە بـە فۆنێمیکی کـۆنسـۆنـانتی ڕەسەن تێکـرای زمانەوانانی کوردی خستۆتە ئەو هەڵەیەوە ، کە دەربارەی نیشانەی (دە)ی موزارەعەت لە
=

بەرزتر . . . » . جا یەکەمیان کە بەشە ئاخاوتنی سەربەخۆیە ، دەبێ بەجیا بنووسرێ ، چونکە هەر بەشە ئاخاوتنێك بوونی سەربەخۆی هەیە . بەلام دووەمیان کە نیشانەیە لەبەرئەوەی بوونی سەربەخۆی نییە ، پێویستە بە وشەی پێش

---

= شێوەی سلێمانیدا دەدوێن ، وا نیشان بدەن کە بووە بە (ئە) - واتە (د) بووە بە (ئ) . لەراستیدا (د) نەبووە بە (ئ) ، بەڵکو (د) تێچووە - واتە هەر ئەو کارەی بەسەردا هاتووە ، وەك بەسەر وشەکانی (منداڵ / مناڵ ؛ مەحموود / مەحمو ؛ کراندی / کرانی ؛ خاوەند / خاوەن . . . پەلاماربدات / پەلاماربات . . . یازدە / یانزە ؛ شازدە / شانزە . . .)یشدا هاتووە . جا کاتێ دەنگی (د)ی موزارەعەت دەفرتێنرێ (ە) بەئاسانی ناتوانرێ تەلەفوز بکرێ . بۆ نەهێشتنی قورتی دەربڕین ، هەمزە بۆ یاریدەدان پەیدا دەبێ . هەرچی لە وشەکانی وەك (مناڵ ، مەحمو . . .) دایە ، لەبەئەوەی بەرهەڵستی بەدەمدا هاتن نییە ، هەمزە نایەتە ناوانەوە .

بەوپێیە پێویستە بزانین کە (دە)ی موزارەعەت نەبووە بە (ئە) ، بەڵکە (د) تێچووە . لە حاڵەتی (لەو ، لەوان)یشدا (ە) نەماوە ، نەك (ئە) . نیشانەی (ان)ی کۆ و (ەکە)ی ناسیاوی و . . . کە بەتەنیا بەدەمدا دێن ، لەبەر ڕەوینەوەی قورتی دەربڕین هەمیشە لە پێشیانەوە (ئ) دێت و دەوترێ (ئان ، ئەکە . . .) . تەنانەت بەشێك لە زمانەوانانی کوردیش کە باسی ئەو نیشانانە دەکەن ، لەسەر بناغەی تەلەفوزکردنیان دەنووسن : (ئان ، ئەکە . . .) لەبەرئەوەی گومان ناکرێ ، کە ئەو نیشانانە (ان ، ەکە . . .) ن ، بۆیە کە دەچنە سەر وشە هەرگیز دەنگی هەمزەیان لەگەڵدا نایەت . بەوێنە (کور - کوران / کورەکە) ؛ (کچ - کچان / کچەکە) ؛ (پیاو - پیاوان / پیاوەکە) ؛ (برا - برایان / براکە) ؛ (پێ - پێیان / پێیەکە . . .)

مامۆستا مەسعوود لە تێکرای نووسینەکانیدا ئەو نیشانانەی ناومان بردن ، ڕاست و ڕەوان بە بێ پیتی هەمزە - واتە بە (ان ، ەکە . . .) نووسیونی . جا ئەو نیشانانە کە سەرەتایان بزوێنە و کاتێك بەتەنیا بەدەمدا دێن ، لەبەر ڕەوینەوەی قورتی دەربڕین ، لەپێشیانەوە (ئ) دێت و دەوترێت (ئان ، ئەکە . . .) ئیتر چۆن ئەو ڕایەی مامۆستا مەسعوود وەربگرین ، کە دەڵێ : « هەمزە بەدوا خۆیدا دەهێنێت نەك بزوێن لە هیچەوە هەمزە خەڵق دەکات و دەچێتە پێش خۆیەوە » (ل ٢٩) .

ئەگەر لە ڕستەی « تۆرەوانێك لەسەر بەحرێ بوو ، ئەحمەد چوو کنەوی بە نۆکەری » (تحفه مظفریه ، ب ١ ، ل ٢٠٠)دا تەماشای « کنەوی » بکەین ، دەزانین ئەسڵەکەی « کن ئەوی » یە . . . بەڵێ لە « ئەوی »دا بە بێ هەمزە دەربڕین مەحاڵە ، بەلام کاتێ لەگەڵ « کن »دا یەکیان گرتووە ، هەمزە تۆوی نەماوە .

=

خۆیەوە بلکێنرێ . . . یاخود ئاشکرایە هەندێ لە پریپۆزیشنەکان وەك پێشگریش خۆیان دەنوێنن ، بەنموونە (بە) لە وشەی «بەهێز ، بەجەرگ . . .»دا پێشگرە ، بەلام کە دەوترێ «من بە تۆم وت . . .» ئەوە پریپۆزیشنە . جا هەرچەندە پریپۆزیشن لە ریزی وشەی ناتەواوە ، بەلکو وەك هەر بەشێکی دی وشەی تەواو روالەتی سەربەخۆی هەیە و لە زمانی کوردیدا یەکێکە لە بەشە ئاخاوتنە چالاکەکان ، بۆیە دەبێ بە جیا بنووسرێ ، بەلام کاتێ وەك پێشگر بەکاردێنرێ ، ئەوە لەبەرئەوەی پێشگر سەر بە هیچ بەشە ئاخاوتنێك نییەو سەربەخۆ بەکارنایەت ، پێویستە بە پێشی وشەوە بلکێنرێ .

ئەمانە و چەندین نموونەیدی ئەوە نیشان‌دەدەن کە لە سازکردنی رێنووسدا پێویستە داخوازییەکانی فۆنەتیك و رێزمان چاودێری بکرێت . . . منیش هەوڵ‌دەدەم لەبەر رووناکیی ئەو دوو زانستە ـ فۆنەتیك و رێزمان ـ رای خۆم لەبارەی ئەو کۆسپ و گیروگرفتانەی لە رێنووسی کوردیدا بەدیدەکەم ، دەربڕم .

ئەو تێبینییانەی دەربارەی گیروگرفتی رێنووسی کوردیمان هەن دەبن بە دوو بەشەوە :

١ ـ گیروگرفتی نیگاری دەنگەکان .

٢ ـ گیروگرفتی نووسینی وشەکان و تێك بەستنیان .

---

ماموستا مەسعوود کە دەڵێ : « چەندێکی فکرم دێنم و دەبەم بۆ ئەوەی هۆیەك بدۆزمەوە فۆنۆلۆجیستی رۆژئاوای ئیقناع کردبێت بەوەی هەمزە فۆنێم نییە هەر ئەوەندەم بەبیردا دێت کە لە کۆنەوە نیگاری بۆ دانەندراوە ئیتر چاوی بە نەبوونی راهاتووە ، دواتریش دەرکی کرد کە بەزۆری وەیا هەمیشە بزوێنی بەدوادا دێت لەوەرا یەکەندەردوو دڵی تەسکین بوو بەوەی کەوا هەمزە هەروەك نیگاری نییە فۆنێمی رەسەنیش نییە . . . جا ئەگەر ئەمەش سەبەب نەبێ هیچ سەبەبێك نامێنێتەوە لە رووبەرەی زمانناسی و دەنگسازیدا بە بۆرە تەئویلیش پشتگیری لەو رایە بکات . . . » (ل ٢٨) ، بە خۆڕایی فۆنۆلۆجیستە رۆژئاواییەکان هێندە بە ساکار و سادە دادەنێ . با بڵێین لە کۆندا لەبەرئەوەی دەرکیان بە بوونی هەمزە نەکردووە ، نیگاریان بۆ دانەناوە ، بەلام ئەی دواتر کە هەستیان پێی کرد چۆن لە سەدان زانای دەیان ولاتی رۆژئاوادا یەکێك هەڵنەکەوت و رانەپەری ئەو هەڵەیە راست بکاتەوە . بەر لە هەر شتێك پێویستە ئەو راستییە لەیاد نەکەین ، کاتێ فۆنۆلۆجیستە رۆژئاواییەکان لەبارەی فۆنەتیکی زمانەکانیانەوە دەدوێن ، ئەلفوبێ ناکەنە بنکە ، تەنانەت ئەو نیگارانەی

## - ١ -

# گیروگرفتی نیگاری دەنگەکان

لە لێکۆڵینەوەماندا ، بۆمان دەرکەوتووە کە وێنەی دەنگی بزوێنی (و) و (ی)ی درێژ و کورتە بزوێنی (ا) و کۆنسۆنانتی (و) و (ی) و دیفتۆنگی (وێ) و کۆنسۆنانتی (ر)ی قەڵەو کێشەیان لەسەرەو پێویستیان بە چارەسەر کردنە . جا بەپێی توانست هەوڵدەدەین لە هەر یەکێك لەو نیگارانەی بۆ ئەو دەنگانەی ناومان بردن ، بدوێین :

---

= بۆ هەندێ فۆنێم دایانناوە لەو پیتانە ناچن کە لە ئەلفوبێدا هەن . بەڵام بەشێك لە زمانەوانانی کورد بە ئەلفوبێوە لکاون و هەندێکیش تەنانەت جیاوازی لەنێوان دەنگە و پیتدا ناکەن .
مامۆستا مەسعوود ناوەناوە ئاوڕ لە زمانی ئینگلیزی دەداتەوە و لە شێوەی نووسینی یەوە نموونە دەهێنێتەوە . بەوێنە لە سەرەتای ستوونی یەکەمی لاپەڕە (٢٠)دا دەڵێ : « وشە هەیە شکڵی (هـ)ی تێدایە ، بەڵام ناخوێندرێتەوە وەیا دەنگەکەی (هـ) پێش دەخرێ ، وەك When 'Where وشەی (Who) بە (هوو) دەخوێندرێتەوە » . بەڵێ ئەو وشانە بەوشێوەیە دەنووسرێن . جا ئەمە هۆی ئەوە نییە کە وشەی (When) لە چوار فۆنێمی (W + h + e + n) پێکهاتبێ ؛ یان وشەی (Where) لە پێنج فۆنێمی (W + h + e + r + e) دروستبووبێ ؛ یاخود وشەی (Who) لە سێ فۆنێمی (W + h + o) سازبووبێ ، بەڵکو هۆ ئەوەیە کە ڕێنووسی ئینگلیزی پەیرەوی ڕێبازی چاولێکەری دەکات ، دەنا فۆنۆلۆجیستی ئینگلیز ئەوە باش دەزانێ کە باشترین ئەلفوبێ ئەوەیە کە ژمارەی پیتەکانی هێندەی ژمارەی فۆنێمەکانی ئەو زمانە بێت . . . لە نووسینی ڕووسیدا لەگەڵ بەکارهێنانی پیت وەك نیشانە ، برگەش لەناواندایە . جا ئەمە وا ناگەیەنێ کە فۆنۆلۆجیستی ڕووس دەرکی بەوە نەکردووە ، کە ئەو جۆرە وێنانەی کراونەتە نیشانەی برگە وێنەی دوو فۆنێمن .
هەرچەندە نووسینی سەرەکی و باوی ئەمڕۆی ئینگلیزی و ڕووسی نووسینی فۆنەتیکی یە ، کە لەسەر بناغەی وێنەی دەنگەکان سازبوون ، بەڵام لەبەرئەوەی بە دەورێکی مێژوویی
=

نووسینی (وو) یان (وَ) بەرانبەر (û)ی لاتینی :

وەك ئاشكرایە بۆ هەر دەنگێك لە دەنگەكانی زمانی كوردی پیتێك كراوەتە وێنە ، بەڵام بۆ نیشاندانی دەنگی (و)ی درێژ دوو پیت دانراوە . بێگومان هیچ لێكدانەوەیەك رێگە بەوە نادات كە دوو پیت بكرێنە نیگاری یەك دەنگ . ئەوەی لایەنگیرانی دوو واو نووسینی بەهەڵە بردووە ، ئەوەیە كە لە كوردیدا بەرانبەر دەنگی (و)ی درێژ ، دەنگی (و)ی كورت هەیە . جا ئەگەر بەپێی ئەو بۆچوونە هەڵەیە نیگار بۆ دەنگەكانی زمانی كوردی دابنێین ئەوە دەبێ لەبریتی (ا)یش دوو (ە) بەكاربهێنین و لەجیاتی ئەوەی بنووسین (ران) ، بنووسین (رەەن) . یاخود كە لە كوردیدا دەنگی (ڕ) و (ڵ) . . . هەیە ، ئەوە بەوپێیە بۆ جیاكردنەوەیان لە (ر) و (ل) . . . دەبێ دوو (ر) و دوو (ل) . . . بنووسین ، واتە لەبریتی (ڕان ، داڵ . . . ) بنووسین (ررەەن ، دەەلل) . . .

نووسینی دوو واو لە سەرێكی تریشەوە تووشی ئەندێشەیەكمان دەكات ئەویش ئەوەیە ، ئێمە لە كوردیدا بۆ نووسینی دەنگێ كە هێز (النبرة ـ Stress)ی لەسەر بێ دووجار پیتەكە دەنووسین ، وەك (میللەت ، كەللە . . . .) . جا ئێمە كە دەستوورمان بۆ دەربرینی هێز ئەوەبوو پیتەكە دووبارە بكەینەوە ، لە نووسینی دوو (و)دا دەستوورەكەمان لێ هەڵدەوەشێتەوە ، چونكە مەبەستمان هێز نییە[2] .

ئەوانەی ئەوە بە كارێكی ناشیانە دادەنێن ، كە كۆڕ (و ـ كەشیدەیەكی لەسەر) لەجیاتی (وو) دەنووسێ ، ئەوە لەوسەرەتا ئاشكرایەی زمانەوانی بێئاگان ،

---

= درێژدا تێپەریون هەندێ شێوازی دییان تێكەڵ بووە و پاشماوەی كۆنیان تێدا ماوە . . . بەڵێ ئەگەر ئەلفوبێ لەسەر بناغەی یەكسانی لەنێوان ژمارەی پیت و فۆنێمدا دابمەزرایە ، ئەوسا كێشەی رێنووس نیوەی نەدەما . لەبەرئەوەی ئەلفوبێی كامڵ نییە و تێپەڕینی بە دەوری مێژوویی درێژدا كێشەی بۆ سازكردووە . هەرچەندە رێنووسی هەر زمانێك بگری بنەمای جۆربەجۆری تێدایە و چەند بنەمایەكیشی بوونەتە سەرەكی ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە سازبوونی رێنووسدا بنەمای گشتی هەن و پێویستە پەیرەوی بكرێن .

(۲) شایانی باسە مامۆستا مەسعوود محەمەد بە شێوەیەكی زانستی و بەڵگەی زۆر و ڕاست و لەبار نووسینی (و)ی درێژی بە دوو واو ڕەتكردۆتەوە (بڕوانە : مەسعوود محەمەد ، ڕێنووسی كۆڕ ، «گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد» ، ب ٤ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٣٥٧ ـ ٣٥٨) .

که دانانی دوو پیت بۆ نیشاندانی یەك فۆنێم باش نییە ، سەرەڕای ئەوە دانانی چوکڵە ئاسنتر و خێراترە لە نووسینی پیتێکی سەرلەبەر . جا کۆڕ هەستی بەوە کردووە بۆیە پیتێکی هێشتۆتەوە و وەك وێنەی درێژیش کەشیدەیەکی لەسەر داناوە . لەڕووی زانستی زمانەوە ئەمەی کۆڕ پەسەندە ، بەڵام نووسینی دوو واو لەبار نییە ، کەچی بەداخەوە لە ڕووی ڕوخسارەوە ، لەبەرئەوەی ئەو کەشیدەیە لە سەر (فتحە)ی عەرەبی دەچێ ، هێندێ گیروگرفتی پەیدا کردووە . ئەگەر لەبریتی ی ئەو کەشیدەیە نیشانەیەکی تر لەسەر یان لە خوار پیتی (و)ەوە دابنرایە ، ئەوە چاکتر بوو . . . . بەڵێ ئەو کەشیدەیە شێوەی جوان نییە ، بەڵام لە ڕووی زمانەوانییەوە ڕاستە ، کەچی هەندێ کەس ئەو ڕاستی یەیان کردووە بە ژێر لێوەوە و هەر لەبەرئەوەی کاری کۆڕە بەلایانەوە خراپە[3] .

## نووسینی دوو (ی) یان (یَ) بەرانبەر (î)ی لاتینی :

بەداخەوە زمانەوانانی کورد بەپێوانەی عەرەبی وایانداناوە کە لە کوردیشدا دوو بزوێنی (ی) هەیە ، کە یەکێکیان کورتە و ئەوی دیان درێژ ـ واتە یەکێکیان وەك ژێر (کسرة) و ئەوی تریان وەك (ی) . بۆ جیاکردنەوەشیان دووەمیان بە دوو (ی) نووسیوە ، لە ڕێنووسی کۆڕیشدا لەبریتی دوو (ی) ، (ی ـ کەشیدەیەك لەسەری) بەکارهێنراوە . بەڕای من ئەمە بە زۆر سەپاندنی فۆنێمی عەرەبی یە بەسەر کوردیدا . هەردوو بەرە وای بۆ چوون کە لەبەرئەوەی لە زمانی کوردیدا (و)ی بزوێنی کورت و (وو)ی بزوێنی درێژ هەیەو لە عەرەبیشدا (ضمة) و (و) هەیە ، ئەوە دەبێ (ی)ش هەر بەو چەشنە ـ واتە کورت و درێژ ، وەك عەرەبی (کسرة) و (ی) ـ بێ . لەڕاستیدا لە زمانی کوردیدا بەوجۆرە نییە و بەداخەوە کۆڕ و گەلێ لە زانایان و ڕووناکبیرانی کورد هەستیان بەو تایبەتێتی یەی زمانی کوردی نەکردووە .

گومان لەوە ناکرێ کە لە زمانی کوردیدا (و ـ u)و (وو ـ û) دوو ـ فۆنێمن ، چونکە گۆڕینی (و ـ u)بە (وو ـ û) جیاوازی دەخاتە نێوان وشەوەو وشەی نوێ پەیدادەکا . بەوێنە ئەگەر لە وشەی (کوڕ)دا فۆنێمی (و ـu) بکرێتە (وو ـ û) ، ئەوە

(٣) بەوێنە بڕوانە : د. جەمال نەبەز ، سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد ، «گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات» ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ژ ٢٢ ، ب ٩٤ .

وشه‌كه ده‌بێته (كوور) ، واته جیاوازی كه‌وته ناوانه‌وه و له‌به‌ر ئه‌وه دوو فۆنێمن . بێگومان كه دوو فۆنێمی جیاواز بوون ، ئه‌وه بۆ تێكه‌ڵ نه‌كردنیان له‌ ڕێنووسدا پێویستیان به دوو نیگاری جیاوازه .

هه‌رچی بزوێنی (ی ـ î)یه له زمانی كوردیدا یه‌ك فۆنێمه ، نه‌ك دوو . هه‌رچه‌نده هه‌ندێ جار كورت و هه‌ندێ جار درێژ ته‌له‌فوز ده‌كرێت ، به‌ڵام ئه‌مه ده‌وری واتاگۆری نابینێ . جا كه ده‌وری واتاگۆری نه‌بینێ ، ئه‌وه فۆنێمی تر ناهێنێته كایه‌وه . كه فۆنێمی تریش نه‌بوو ئیتر پێویست به نیگاری‌تر ناكات . له ده‌یان وشه‌ی وه‌ك : (پیر ، تیر ، شیر ، پیر ، میر ، سیر ، هه‌نجیر ، په‌نیر . . .)دا كه بزوێنی (ی) درێژ به‌ده‌مدا دێت ، ئه‌گه‌ر كورتیش بكرێته‌وه وشه‌ی نوێ په‌یدا نابێ . . . جا وه‌ك گشت لایه‌كمان ده‌زانین هه‌موو (ی ـ î)یه‌كی ناوه‌ڕاستی وشه‌ی كوردی درێژه‌و هیچ كاتێك كورت نییه ، ته‌نیا مه‌گه‌ر وشه‌یه‌ك دوو (ی ـ î)ی تێدا بێ‌و هێز (النبرة ـ Stress) بكه‌وێته سه‌ر یه‌كێكیان ئه‌ودەم ئه‌وی دی‌یان كه‌مێك كورتتر ته‌له‌فوز ده‌كرێت ، ئه‌مه‌ش دیارده‌یه‌كی فۆنه‌تیكی‌یه و ئاشكرایه هه‌ر بزوێنێ هێزی له‌سه‌ر بێ پتر ده‌رده‌كه‌وێ . . . (ی ـ î) كۆتایی وشه‌ش كه هه‌ندێ جار كورت ده‌رده‌بڕرێ ، هۆی ئه‌وه‌یه كه هێزی له‌سه‌ر نییه یاخود بووه‌ته (ی ـ y)ی كۆنسونانت . جا به‌و پێیه نووسینی بزوێنی (ی ـ î) چ به دوو (ی) و چ به (ی ـ كه‌شیده‌یه‌كی له‌سه‌ر هه‌ڵه‌یه .

## كێشه‌ی كورته بزوێنی (i)

یه‌كێك له گیروگرفته‌كانی ڕێنووسی كوردی به ئه‌لفوبێ عه‌ره‌بی ئه‌وه‌یه كه بۆ كورته بزوێنی (i) هیچ پیتێك دانه‌نراوه[4] و ئه‌مه بووه‌ته هۆی به هه‌ڵه‌بردنی گه‌لێ له

(٤) د. جه‌مال نه‌به‌ز كاتێ باسی گیروگرفته‌كانی نووسینی كوردی به ئه‌لفوبێ عه‌ره‌بی ده‌كات ، زۆر ڕاست بۆ ئه‌وه چووه كه ئه‌و ئه‌لفوبێیه «هه‌رچی چۆنێك ده‌سكاری بكرێ ، هێشتا گه‌لێك ناته‌واوی تێدا ده‌مێنێ »(زمانی یه‌كگرتووی كوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ ، ل ٨٣) . یه‌كێكیش له نموونه‌ی ناته‌واوییه‌كانی كه په‌نجه‌ی بۆ ڕاكێشاوه ، ئه‌وه‌یه كه ده‌ڵێ : «تیپی ده‌نگداری وون بوو (واتا ژێری كورت) یا بزرۆكه ـ تۆفیق وه‌هبی وته‌نی ـ به‌م ئه‌لفوبێیه نانووسرێ» (هه‌مان سه‌رچاوه ، ل ٨٤) . . . كه‌چی مامۆستا نه‌ریمان وا نیشان ده‌دات كه گوایا د. نه‌به‌ز «داوا ئه‌كات ، ئه‌ڵێت : له نووسینی كوردیدا نابێت (ژێری گوشراو ـ كسرة

ڕووناکبیرانی کورد و هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی . زۆر بەرچاوم کەوتووە وا دراوەتە قەڵەم کە وشەی (پر ، دز ، من . . .) لە دوو دەنگ پێکهاتوون . هەرچەندە ڕێنووسەکە لە ڕەچاوکردنی بزوێنی (i)دا ناتەواوە ، بەڵام ئەوانەی لە باسی زمان دەدوێن نابێ هێندە سادەو ساکار بن ، تەنیا تەماشای ڕواڵەت و ڕوخساری نووسین بکەن . . . جا بەداخەوە ئەو بزوێنە ئێجگار کورتە کە (الکسرة المختلسة)ی پێ دەڵێن لە ڕێنووسی کوردیشدا نەك هەر نیگاری بۆ دانەنراوە ، بەڵکو باسیشی نەکراوە و ناویشی نەبراوە .

شایانی باسە مامۆستا تۆفیق وەهبی لە سەرەتای ژیانی زانستی‌یەوە هەستی بە بوونی ئەو کورتە بزوێنە کردووە و ساڵی ۱۹۲۹ لە کتێبی «دەستووری زمانی کوردی»دا پیتی (ى)ی بۆ کردبووە نیگار . . .[٥] بەڵام وێکچوونی شێوەی ئەم پیتە لەگەڵ پیتی (ی - î)و هەروەها هەست نەکردنی زمانەوانانی کورد بە بوونی (i) بوونە هۆی بەجێ نەهاتنی چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتە .

لەم ساڵانەی دواییدا مامۆستا مەسعوود محەمەد لە چەند نووسینێکیدا دەربارەی (i) دواوە . ئەوەی جێگەی موناقەشە بێ ، ئەوەیە کە نووسەر ئەو کورتە بزوێنەی بە هێز (ئەو «قورس کردن»ی پێ وتووە) داناوە . مامۆستا لە وتاری «فۆنەتیك چیمان بۆ بکا ؟»دا کاتێ لە تایبەتێتی و سروشتی دەنگەکانی زمانی کوردی و گونجان و نەگونجانیان لەگەڵ یەکتر دەدوێ ، نووسیویتی : «ئەم دەنگەی (ر) کە بە سکون دەکەوێتە پێش دەنگی (د)یشەوە هەر بەتەواوی دەوەستێندرێ و هیچ قورس کردن و ددان لێ گیرکردنێك قبوڵ ناکا . وشەکانی (مەر ، مێرد ، گورد ، سارد ، بەرد ، کورد ، ورد ، گەرد ، وەرد . . . هتاد) ئەوانیش هەموویان هەر لەبەر ئەم هۆیەیە یەك برگەن ، وشەی (هەڵگۆرد) کە بۆتە دوو برگە واتە (هەڵ -

---

= مختلسة) بنووسرێت چونکە بریتی‌یە لە دەنگێکی زۆر کورت» (ڕێنووسی کوردی لە ڕەگەو ڕیشەوە ، ل ٥) . ئەگەر مامۆستا نەریمان باش نووسینەکەی د. نەبەزی بخوێندایەتەوە ، تووشی ئەو هەڵەیە نەدەبوو و ڕای ڕاست و دروستی نووسەری کتێبی «زمانی یەکگرتووی کوردی» نەدەشێواند . . . یەکێك کە نەبوون و چارەسەرنەکردنی وێنەی کورتە بزوێنی (i) لە ئەلفوبێ عەرەبیدا بە گیروگرفت دابنێ ، ئیتر چۆن نووسینی بە پێویست نازانێ ؟ .

(٥) تەوفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جزمی یەکەم ، بەغدا ، ۱۹۲۹ ، ل ٥ .

گۆرد) ئەگەر لەبەر ئەم تایبەتییەی دەنگی (ر) نەبا دەبوو بە سێ برگە واتە (هەڵ ـ گۆ ـ رد) . بۆ روون کردنەوە وشەی (هەڵگۆرد) هەردوو جۆری بە پیتی لاتینی دەنووسم ، لە جێگەی قورس کردنیش نیشانەی (i) دادەنێم (هەڵگۆرد)ی دوو برگەیی بە لاتینی وەها دەنووسرێ (Hel — gord) هی سێ برگەییش وەهای لێ دێ : (Hel — go - rid) . . . ،[6] .

بەمەدا ئەوەمان بۆ روون بووەوە کە وشەی (هەڵگۆرد) لە دوو برگە پێکهاتووە ، بەڵام ئەگەر (i) بخرێتە نێوان (ر) و (د)ەوە ئەوە وشەکە دەبێ بە سێ برگە . . . واتە لێرەدا ئەم (i)ە قورس کردن بێ (وەك رای مامۆستا مەسعوود محەمەد) یاخود پەیدابوونی بزوێنێکی دیکە بێ (وەك رای نووسەری ئەم کتێبە) ، ئەوە برگەیەکی تر زیاد دەکا . جا ئەگەر بەتەواوی بچەسپێنرێ کە ئەوە قورس کردن بێ ، ئەوسا دەردەکەوێ کە قورس کردنیش دەتوانێ دەوری جیاکردنەوەی برگە ببینێ . بەڵام ئەوەی لە زانستی زماندا ئاشکرا بێ ، ئەوەیە کە لە برگەدا دەبێ دەنگی بزوێن هەبێ . جا هەر لەبەر ئەوەشە کە ژمارەی برگەکانی هەر وشەیەك ، هێندەی ژمارەی بزوێنەکانی ئەو وشەیە دەبێت . بۆ نموونە لە وشەی «گۆران»دا دوو بزوێن هەیەو ئەمەش بووە بە هۆی بوونی دوو برگە ، وەك (گۆ ـ ران) ، کەچی وشەی «گۆرانی» بریتییە لە سێ برگە (گۆ ـ را ـ نی) ، چونکە سێ بزوێنی تێدایە[7] . . .

مامۆستا مەسعوود محەمەد دەربارەی هەمان باس لە وتاری «رێنووسی کۆڕ»یشدا دەڵێ : «بۆ ئەوەی کە لە عەرەبیدا پێی دەگوترێ (کسرة مختلسة ـ من لە نووسینەکانی خۆمدا پێی دەڵێم ـ قورس کردن) ، بەشێکی زۆری وشەکانی کوردی ئەم قورس کردنەیان تێدایە کە غالبی رێكخەرانی ئەلفوبێی کوردی بە لاتینی پیتیان بۆ داناوە بێ ئەوەی لەوە بکۆڵنەوە ئاخۆ ئەو دەنگە بەشێکی پێك هێنەری وشەکەیە یاخود زەروورەتێکی فۆنەتیکییە کە دەربرینی دەنگە لە حاڵەتی تایبەتیدا داخوازی دەکات . بەنموونە تۆ کە دەڵێی (گەنم) بەناچاری قورسایی (کسرة مختلسة) دەخەیتە

---

(٦) مەسعوود محەمەد ، فۆنەتیك چیمان بۆ بکا ؟ «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، ب ٣ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٥٩١ .

(٧) بۆ زانستی زیاتر لەم بارەوە ، بڕوانە : د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، زمانی کوردی لەبەر رۆشنایی فۆنەتیکدا ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٦٧ ـ ٦٩ .

سەر دەنگی (ن) بۆ ئەوەی بتوانی تلفظی پێ بکەیت و بەدوا ئەودا دەنگی (م)ەکەش دەربڕیت کە هەردووکیان لە وشەکەدا بزوێنی ئاشکرایان نییە ، بەڵام کە هاتی میمەکەت بزواند گوتت (گەنمەکە) قورسایی سەر نوونەکە نامێنێت و بەتەواوی دەوەستێت . زەروورەتەکەش لەوەوە دێت کە دەنگی نوون بە وەستاوی تەواوەوە لەپێش دەنگی میمی وەستاوەوە نایەت»[8] . لەم وتارەشدا مامۆستا مەسعوود محەمەد هەر لەسەر رای پێشوویەتی و ئەوەی (کسرة مختلسة)ی پێ دەڵێن ئەو بە هێزی داناوە . بۆ پتەوکردنی ئەو رایەشی وشەی «گەنم»ی بە نموونە هێناوەتەوە و دەڵێ لە کەرتی دووەمیدا بزوێن نییە . بۆ پێ سەلماندنی نەبوونی بزوێنیش دەنگی (م)ی بزواندووە و شێوەی «گەنمەکە»ی هێناوەتەوە . . . وەك پێشتر روونم کردەوە کەرت دەبێ دەنگی بزوێنی تێدا بێ . وشەی «گەنم» لە دوو کەرت (گە ـ نم ge — nim) پێکهاتووە و ئەوەی دوای (ن)ەکە بزوێنە ، نەك هێز . راستە کە دەڵێین «گەنمەکە» ، ئەوە بزوێنی نێوان (ن) و (م)ەکە نامێنێ ، بەڵام دەبێ بزانین هۆی ئەوەیە کەرتەکان گۆرانیان بەسەردا دێت و دەبنە (گەن ـ مە ـ کە gen — me — ke) . دەبینین (گە ـ ge) کەرتی یەکەمی وشەی «گەنم»ە ، کەچی لە شێوەی «گەنمەکە»دا بووە بە (گەن ـ gen) .

بەپێی ئەو بۆچوونەی مامۆستا مەسعوود محەمەد ، دەبێ نەك هەر لە وشەکانی «خر ، در ، دز ، پر ، من . . .»دا کە یەك برگەیین ، بەڵکو لە وشەی دوو برگەیی و سێ برگەیی وەك «کردن ، بردن ، خستن ، مردن ، پرشنگ ، جلشتن ، درزبردن . . .» و گەلێ دەستەواژە و رستەی وەك «بشم گرن ، کردمن ، گرم گرت ، جلم برد شتم ، من کرمم گرت ، من لنگم بلند کرد ، من پرشنگم برد بچم برنج بکرم ، من چل گسك پترم شر کرد . . .»یشدا هەر بزوێن نەبێ . ئەگەر بێینە سەر ئەو باوەرەش کە هێز دەوری جیاکردنەوەی برگە دەبینێ ، ئەی چۆن ئەوە بسەلمێنین وشە بەتایبەتی وشەیەك کە لە برگەیەك پتر بێ ، لە پێکهاتنیدا دەنگی بزوێن نەبێ . ئەگەر ئەمەشمان سەلماند ، ئەی بۆ ئەوە وەڵامان چی بێ کە لە سەرلەبەری دەستەواژەیەك یان رستەیەکدا یەك بزوێن چی یە

---

(8) مەسعوود محەمەد ، رێنووسی کۆر ، «گۆڤاری کۆری زانیاری کورد» ، ب ٤ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٥٣ ـ ٢٥٤ .

نەبێ . . . لە زانستی زماندا ئەوە روون کراوەتەوە کە هەموو وشەیەکی تەواو[9] چۆن دەنگی کۆنسۆنانت هەروەها دەنگی بزوێنیشی هەیە . . . جا ڕێکخەرانی ئەلفوبێی لاتینی وەنەبێ بێ لێکۆڵینەوە پیتی (i)یان بۆ ئەو دەنگە دانابێ . لەگەڵ هەموو ئەوەشدا ئەو دیاردەیە کورتە بزوێن بێ یان هێز ، لەبەرئەوەی دەوری جیاکردنەوەی برگە دەبینێ ، بۆ نووسین جیاوازی ناکا و پێویستی بە نیشانە هەیە . بە هەمەچەشن لە ئەلفوبێی عەرەبیشدا دەبێ نیگاری بۆ دابنرێ .

ئەو هەموو بەڵگە و نموونانەی لەسەر بنکەی زانستی زمان بۆ پێ سەلماندنی ئەوە هێناومنەوە کە ئەو (i)ە کورتە بزوێنە ، مامۆستا مەسعوود لە وتاری «لەگەڵ دەنگسازی کوردیدا»دا[10] بە قسەی پروپووچی فۆنۆلۆجیستەکانیان دادەنێ و بۆ دانەنانی بە بزوێن دوو بەڵگەی زۆر لاوازی هێناوەتەوە :

١ ـ دەڵێ : «ڕۆژئاواییەکان لە نووسینی ئێستاکەیاندا لە زۆر حاڵ و باردا گوێنادەنە ئەم (كسرة . . .)یە تا هەموو جارێك نیگاری بۆ دابنێن . بەنموونە کە دەنووسن : (burn, turn, Worm) نیگار بەدوا پیتی (r)دا نانووسن هەروەهاش نیگار ناخەنە دوای ئەو پیتەی کە لە سەرەتای وشەوە بێ بزوێنی ئاشکرا دێت وەك : (Crow, Please, bring, Screen) و هی تریش» (ل ١٩) .

ئەلفوبێی ڕۆژئاواییەکان پاشماوەی کۆنی تێدا ماوە و وەنەبێ لە سەدا سەد لەسەر بناغەی یەکسانی لەنێوان ژمارەی پیت و ژمارەی فۆنێمدا دامەزرابێ . جا ئەگەر ئەوان لە زۆر حاڵدا دایان نەنا ، ئەوە بەڵگەی فۆنێم نەبوونی نییە لە کوردیدا .

٢ ـ مامۆستا مەسعوود وا دادەنێ ، ئەگەر (كسرة مختلسة) فۆنێم بوایە ، نەدەبوو لە هەندێ حاڵدا تێبچوایە . . .

ئەم تێچوونە هیچ شتێك لە فۆنێم نەبوونی ئەو کورتە بزوێنە ناگۆڕێ . بۆ پێ سەلماندنی ئەو رایە دوو بەڵگە دێنمەوە :

أ ـ لە زمانی کوردیدا کورت و درێژی بەدەمدا هاتنی بزوێنی (وو ـ u˘)

---

(٩) بۆیە وتوومانە وشەی تەواو ، چونکە هەندێ وشەی ناتەواو بەو چەشنە نین .

(١٠) مەسعوود محەمەد ، لەگەڵ دەنگسازی کوردیدا ، گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» ، ژ ٩٥ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٧ ـ ٣٣ .

نموونه‌یه‌کی زۆر له‌باره . به‌وێنه ئه‌و بزوێنه له (نووسین ، پێنووس . . .)دا درێژتر ته‌له‌فوز ده‌کرێ وه‌ك له (نووسرا . . .)دا . هۆی ئه‌مه‌ش ئه‌وه‌یه که له حاڵه‌تی یه‌که‌مدا هێز له‌سه‌ر ده‌نگی (وو)ه ، به‌ڵام له وشه‌ی (نووسرا)دا ، هێز ده‌خرێته سه‌ر ده‌نگی (ا) . جا بزوێنێکی درێژی وه‌ك (وو) له باری بێ‌هێزیدا وه‌ك (و)ی لێ بێت ، ئه‌وه بزوێنێکی ئێجگار کورتی وه‌ك (i) ئه‌گه‌ر هێزی له‌سه‌ر نه‌بێ ، به‌دیار نه‌که‌وێ شتێکی دوور له یاسا و ده‌ستوور نییه .

ب ـ له زمانی رووسیدا وا رێ‌ده‌که‌وێ بزوێنی ئاشکرای وه‌ك (ۆ) و (ێ) تێ‌ده‌چن . به‌وێنه وشه‌ی (سۆن ـ « خه‌و ») له حاڵه‌تی جه‌ردا ده‌بێ به (سنا) و له حاڵه‌تی کۆدا ده‌کرێته (سنی) . وشه‌ی (دێن ـ « رۆژ ») له حاڵه‌تی جه‌ردا ده‌بێته (دنیا) و له حاڵه‌تی کۆدا ده‌بێ به (دنی) . . . گومان له‌وه ناکرێ که (ۆ) و (ێ) له رووسیدا فۆنێمن و فۆنێمی دیار و چالاکیشن . جا که له هه‌ندێ باردا تێدا ده‌چن ، هۆی فۆنێم نه‌بوونیان نییه ، به‌ڵکو یاسای فۆنه‌تیکی ئه‌و زمانه وا پێداویست ده‌کات[11] .

## گیر وگرفتی (و ـ W) و (ی ـ Y) کۆنسۆنانت :

یه‌کێك له‌و ره‌خنانه‌ی له گشت شێوه رێنووسێکی کوردی به ئه‌لفوبێی عه‌ره‌بی هه‌ڵده‌ستێ ، ئه‌وه‌یه که بزوێنی (و ـ u) له کۆنسۆنانتی (و ـ w) و هه‌روه‌ها بزوێنی (ی ـ î) له کۆنسۆنانتی (ی ـ y) له‌یه‌ك جیانه‌کراونه‌ته‌وه .

ئه‌و دوو ده‌نگه بزوێنه (و ـ u) و (ی ـ î) که له ته‌له‌فوز و ده‌وردا له‌گه‌ڵ (و ـ W) و (ی ـ y)ی کۆنسۆنانت جیاوازن ، ده‌بوو له رێنووسدا نیگاریان ره‌نگی ئه‌و جیاوازییه‌ی وه‌ربگرتایه . چۆن قوتابیان که‌شیده‌ی سه‌ر واوی درێژ به‌ سه‌ر (فتحه) تێ‌ده‌گه‌ن ، هه‌روه‌ها هه‌موو (و ـ W)یه‌کی کۆنسۆنانت به بزوێنی (و ـ u) و گشت (ی ـ y)یه‌کی کۆنسۆنانت به (ی ـ î) بزوێن وه‌رده‌گرن . بۆ به‌رپه‌رچی ئه‌و قسانه‌م که وتوومه دوو بزوێن به‌دوا یه‌کدا نایه‌ن رووناکبیری ناسراو هه‌بووه وشه‌ی

---

(11) بۆ زانستی زیاتر له‌م‌باره‌وه ، بروانه : د. ئه‌وره‌حمانی حاجی مارف ، چه‌ند وشه‌یه‌ك ده‌رباره‌ی وتاری (له‌گه‌ڵ ده‌نگسازی کوردیدا) ، گۆڤاری « به‌یان » ، ژ ۹۰ ، به‌غدا ، ۱۹۸۳ ، ل ٦٢ ـ ٦٩ .

(وەرە ، رەوە ، یاری ، یاخی . . . ) کردووە بە بەڵگە . . . ڕاستە ڕواڵەتی نووسین بە ئەلفوبێی عەرەبی و نەبوونی وێنەی (و) و (ی)ی کۆنسۆنانت تێیدا نابێ نەك هەر سەر لە شارەزای زمان ، بەڵکو لە قوتابیش تێك بدا ، بەڵام خۆ لە ڕێنووسیشدا دەبێ هێندە زانست بەکارهێنرابێ ، کە نیگارێك بۆ دوو فۆنێمی جیاواز دانەنرابێ .

**نووسینی دیفتۆنگەکان :**

هەندێ لە کوردناسان لەورایەدان کە بزوێنی دوولانـە (ادغام حـرفی علە - Diphthong) لە زمانی کوردیدا نییە . . . بەشێکیش بەپێچەوانەوە ژمارەیەك دەنگی وایان : ( وا ، وە ، ەو ، یا . . . ) بە بزوێنی دوولانە داناوە ، کە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ مەفهووم و مەرجی ناساندنەکە ڕێك ناکـەون[12] . بەلای منـەوە لە زمـانی کوردیدا دەتوانرێ سێ بزوێنی دوولانە دەست نیشان بکرێ .

١ - وێ ، وەك :

نوێژ ، نوێن ، گوێز ، گوێ . . .

٢ - وی ، وەك :

هەنگوین ، پێنجوین . . .

---

(١٢) هەروەها لە زانستی زماندا بە تێکەڵبوونی سێ دەنگی بزوێن دەوترێ بـزوێنی سێ لانە (Triphthong) و بە تێکەڵبوونی چوار دەنگی بزوێن دەوترێ چوارلانە (Teraphtong) . . . من لەو ڕایەدام کە بزوێنی سێ لانە و چوارلانە . . . لە زمانی کوردیدا نـیە و زوربەی زۆری کوردناسانیش هەر لەسەر ئەم ڕایەن . بەڵام ئەوەی لەم ڕووەوە سەرنجی ڕاکیشاوم ، ئەوەیە کە مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی لە لاپەڕە (١١ - ١٢ ، ٤٠ ، ٤٢ - ٤٣)ی کتێبی «فۆنەتێکی زمانی کوردی»دا وای نیشان داوە ، کە لە زمانی کوردیدا بزوێنی سێ لانە و چوارلانە . . . هەیە . بەم بۆنەیەوە نووسیوێتی ، دەڵێ : «زمانی کوردی جیاوازی هەیە لەگەڵ زمانەکانی تردا بەوەی کە چەند بزوێنێك کۆدەبنەوە یەك بە شوین یەکدا . . . » . . . «لە زمانی کوردیدا وەختی وا هەیە زیاتر لە سێ دەنگ (دەنگی بزوێن - ئەورەحان) لە یەك هێشوودا کۆدەبێتەوە . . . » (ل ٤٠) . نووسەر بۆ پێ سەلماندنی ئەو بیرورایەی هـەندێ نموونەی هێناوەتەوە . بەوێنە : (ەو)ی لە وشەی «شەو»دا بە بزوێنی دوولانە ؛ (اوە)ی لە وشـەی «ساوەر»دا بـە بزوێنی سێ لانـە ؛ (آوای)ی لە وشـەی «ئـاوایی»دا بـە بـزوێنی چوارلانە ؛ (ەوایە)ی لە وشەی «ڕەوایە»دا بە بزوێنی پینج لانە لە قەلەم داوە . . . (٤٣) .

ئەو دوو بزوێنە دوولانەیە ـ واتە (وێ ، وی) تەنیا لـە ناوچـەی سلێمانی و موکریان[13] و هەندێ شوێنی دیکەی کوردستان باون . دەنا لە زوربەی دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی کوردیدا بە جۆرێکی تر خۆیان دەنوێنن ، واتە ـ (هەر دوو دەنگی «وْ ـ ێ ؛ و ـ ی»ی بێ تێکەڵبوون تەلەفوز دەکرێن ، هەروەك «د ـ ێ ؛ د ـ ی» و یا هەر کۆنسۆنانتێکی تر بێت لە جیاتی «د» بێ تێکەڵبوون لەگەل (ێ ـ ی)دا تەلەفوز دەکرێت .

٣ ـ وی ، وەك :

دویر ، سویر ، کویر ، موی . . .

ئەم دەنگە بزوێنە دوولانەیە لە بەشێکی زۆری دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا باوە . . .[14] هەرچەندە لە ئەلفوبێی عەرەبیدا لەگەڵ (وی)ی کرمانجیی خواروودا وەك یەك دەنووسرێن ، بەلام شێوەی تەلەفوزیان جیایە ، واتە وەها ناخوێندرێنەوە وەك رواڵەتی نووسینیان نیشانی دەدات .

ئەو سێ دیفتۆنگە هەر لەزووەوە بەو شێوەیەی نیشانمان داون نـووسراون و

---

= بەداخەوە مامۆستا محەمەد ئەمین لەمەدا بەهەڵەچووە . هۆی ئـەو بەهـەڵە چـوونەشی ئەوەیە ، کە (ی ـ y) و (و ـ w)ی کۆنسۆنانت بە بزوێن تێگەیشتووە (بڕوانە : ل ٣٢ی کتێبی «زمانی کوردی لەبەر رۆشنایی فۆنەتیکدا» ، کە دەربارەی نیمچە بزوێنەکانی زمانی کوردییە) . لێرەدا ئەوە دێنمەوە یاد ، کە لە زمانی کوردیدا دوو یاخود پتر دەنگی بزوێن لەپاڵ یەکدا ناتوانن ببن . لەبەرئەوە زۆر جار لەنێوان دوو دەنگی بزوێندا کۆنسۆنانتی (ی ـ y) یان (و ـ w) پەیدادەبێ ، یاخود بزوێنێکیان تێدەچێ .

هەروەها لە لاپەرە (٤٠ ـ ٤١)دا مامۆستا هەورامانی ژمارەیەك بزوێنی دوولانە و سێ لانە . . . ی هێناوەتەوە ، وەك : (آوە ، آوا ، آوای ، آیە ، وێ ، وێە ، ەو ، یا ، یوە . . . ) کە بەشی هەرەزۆریان بزوێنی تێکەڵبوونین .

(١٣) د. کەریمی ئەیووبی و د. ئی . ئا . سمیـرنۆڤـا لە (کتێبی «دیـالێکتی کوردی مـوکری» لێنینگراد ، ١٩٦٨ ، ل ١٣)دا پەنجەیان بۆئەوە راکێشاوە کە ئەو بزوێنی دوولانەیە (وی ، وێ) لە بەشە دیالێکتی موکریدا هەن ، بەلام ئەوەی جێی رەخنەبێ ، ئەوەیە کە (وا)شیان هەر بە بزوێنی دوولانە داوەتە قەڵەم .

(١٤) جێی سەرسوڕمانە کە لە نووسینەکانی کوردناسانی سۆڤێتدا ، بە هیچ چەشنێك باسی ئەو بزوێنە دوولانەیە نەکراوە .

دەنووسرێن ، بەڵام (و ـ کەشیدەیەکی لەسەر) لەجیاتی (وێ) نووسین کە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات پەیڕەوی دەکەن ، کە بە ناوەڕۆك هەڵە و بە ڕوخسار ناحەزە ، پێویستی بە دوورخستنەوەیە ، چونکە نیگارکێشانی دوو دەنگ بە یەك پیت پەسەند نییە .

شایانی باسە مامۆستا مەسعوود محەمەد لەو وتارەیدا کە بۆ یەکەم کۆڕی لێکۆڵینەوەی کتێبی قوتابخانە بە زمانی کوردی (شەقڵاوە ، تەمووز ۱۹۷۳)ی ئامادە کردبوو[15] بە شێوەیەکی زانستی و بە بەڵگەی زۆر و ڕاست و لەبار نووسینی دیفتۆنگی (وێ)ی بە (و ـ کەشیدەیەك لەسەری) ڕەت کردۆتەوە[16] . هەروەها د. کەمال فۆئاد لە وتاری «چەند سەرنجێکی زمانەوانی»[17] دا نووسینی دیفتۆنگی (وێ)ی بەوچەشنەی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات پەیڕەوی دەکەن بە هەڵە داناوە[18] .

دەستەی بەڕێوەبەرانی گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات وایان داوەتە قەڵەم کە ئەو ڕێنووسەی ئەوان لەسەری دەڕۆن ، ئەوە ئیملای ستانداردی کوردییە . . .[19] بەلێ لەمێژە کە ئەلفوبێی کوردی لە ئەلفوبێیەکی عەرەبی دەستکاری کراوەوە بۆ نووسینی کوردی سازکراوە و هەموو لایەك لەسەری ڕۆیشتوون و ناوناوەش هەولی پێشخستن و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی دراوە . کۆڕی زانیاری کورد لە کۆششی خۆیدا هەرچەندە هەندێ گیروگرفتی ئەو ڕێنووسەی باش چار کرد ، بەڵام بەداخەوە لە سەرێکی ترەوە هەندێ قۆرتی نوێشی هێنایە ناوەوە . . . هەرچی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیاتە جگە لەوەی هیچ گیروگرفتێکیان

---

(۱۵) مەسعوود محەمەد،گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی ، گۆڤاری « پەروەردە و زانست » ، ژ ٦ ، بەغدا ، ۱۹۷۳ ، ل ۷ ـ ۲۸ .

(۱٦) هەمان سەرچاوە ، ل ۱۸ .

(۱۷) د. کەمال فوئاد ، چەند سەرنجێکی زمانەوانی ، گۆڤاری «ڕۆژی کوردستان» ، ژ ۲ ، بەغدا ۱۹۷۱ ، ل ۵۸ ـ ۵۹ .

(۱۸) هەمان سەرچاوە ، ل ۵۸ .

(۱۹) بڕوانە : پەراوێزی لاپەرە (۸٦)ی وتاری د. جەمال نەبەز ، سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد ، «گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات» ، بەغدا ، ۱۹۷۸ ، ژ ۲۲ .

چارەسەر نەکرد ، بەڵکو کارێکی ڕاستیشیان کردە تەگەرە ، ئەویش ئەوەیە لەبریتی دیفتۆنگی (وێ) ، هاتن (و ـ کەشیدەیەك لەسەری)یان پەسەندکرد . ئەمە پێشنیاری هەر زانایەك بێ لە ڕووی زمانەوانییەوە ڕاست نییە . لەسەرەوە ئەوەم ڕوون کردەوە کە بەپێی زانستی زمان وا پەسەندە بۆ هەر دەنگێك یەك پیت دابنرێ . جا ئەم دیفتۆنگە کە لە دوو دەنگ پێکهاتووە ، پێویستی بەوەیە کە دوو پیت بینە نیگاری . ئەمە کە خۆی لە ئیملای کوردیدا ڕاستو ڕەوان بوو بە خوتو خۆڕایی شێواندنیان . بەخێری لە هەموو گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردیدا ئەوەیان بەدی کرد و ئەویش وای بەسەر هێنرا . سەرەڕای ئەوە لە گۆڤاری ناوبراودا هەر لە یەك لاپەڕەدا بە هەردوو شێوەکە ـ واتە (و ـ کەشیدەیەك لەسەری) و (وێ) ـ دەبینرێ . ئەگەر دەستەی بەڕێوەبەرانی گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات نووسینی دیفتۆنگ بە یەك پیت بەلایانەوە ڕاستە ، ئەوە بۆچی تەنیا دیفتۆنگی (وێ)یان بەبیردا هاتووە و ئەوانی دییان لەبیرکردووە . لێرەدا دەبێ شوکرانەبژێر بین کە هەستیان بە دیفتۆنگەکانی دی نەکردووە ، ئەگینا ئەوانیشیان بە دەردی دیفتۆنگی (وێ) دەبرد . . . ئەگەر دەستەی بەڕێوەبەرانی ئەو گۆڤارە بروایان بەوەیە کە ئەو ئیملا کۆنەی کوردی ستانداردەو پێویستی بە دەستکاری کردن نییە ، ئەوە دەبێ بشوترێ ئەدەب و زمان و مێژووی کورد پێویستیان بە لێکۆڵینەوە نییە . خۆ ئەگەر بڕواشیان وایە کە دیفتۆنگی (وێ) گیروگرفت بووە و بە (و ـ کەشیدەیەك لەسەری) چارەسەر کراوە و ئیملاکە بووەتە ستاندارد ، ئەو هەر لەسەری نەڕۆین چاکترە .

**نووسینی (ڕ) یان (ڕ) یان (رر) :**

لە سەرەتای گەڵاڵەبوونی ئیملای کوردییەوە دەبینین کە بۆ جیاکردنەوەی وێنەی دەنگی (ر)ی قەڵەو لە (ر)ی لاواز ، چوکڵەیەك لەژێر یەکەمیاندا دانراوە و ئەمە ڕۆیشتووە . من لەو ڕایەدام ئەمە کارێکی ژیرانە و زانستی یە . . . مامۆستا عەلائەدین سەجادی بۆ ئەوەی نیشانەکان هەموو لەسەر یەك شێوە بڕۆن وای پێشنیار کردووە کە چوکڵەکە لەسەرەوە بێت . . .[20] کۆڕی زانیاری کوردیش

(٢٠) بڕوانە : عەلائەدین سەجادی ، دانانی نیشانەکانی پیتی کوردی ، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ» ، ژ ١٢ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١٧ ؛ هەروەها : دەستوور و فەرهەنگی زمانی

لەسەر بناغەی ئەو ڕایەی مامۆستا سەجادی بڕیاریدا هەموو چوکلەکان لە سەرەوەی پیتەکان دابنرێن و مەبەستیش لەمە چوکڵەی پیتی (ڕ)ی قەڵەو بوو . . .[21] دواتریش مامۆستا مەسعود محەمەد لە وتاری «ڕێنووسی کۆڕ»دا تەواو پشتگیری لەو کارە کردووە . . .[22] .

هەندێ لە ڕووناکبیران و زانایانی کورد ڕەخنەیان لە گۆڕینی شوێنی ئەو چوکڵەیە گرت . من بەتەواوی ڕام لەگەڵ د. نەبەز دەگونجێ لەوەدا کە دەڵێ : «دانانی چوکڵە لەسەر (ر) بۆ کردنی بە ڕێی قەڵەو لەباری هونەرییەوە ناراستە چونکە چوکڵە خستنە سەر (ر) وا لە (ر)ەکە دەکا کە لە نووسینیدا لەگەڵ (ز) و (ژ) ، بەتایبەتی (ژ) لە یەکدی بگۆڕێن و ڕێنووسەکە زەحمەتتر بکات . لەبەرئەوە چوکڵەکە هەر لەژێر (ر)ەکەدا بەمجۆرە (ڕ) بمایەوە چێتر بوو» . . . .[23] بێگومان کۆڕ لەم بارەیەوە بەهەڵەدا چووە و لە هیچی نەبوو گیروگرفتێکی نوێی بۆ ڕێنووسی کوردی دروستکرد . نموونەش بۆ پەیدابوونی ئەو گیروگرفتەو سەلماندنی ڕایەکەی د. نەبەز تەنیا ئەوە بەسە کە لە دروشمی کۆڕدا ، کە بەسەر یەکەم لاپەڕەی هەموو ژمارەکانی گۆڤارەکەوەیەتی ، پیتی (ڕ)ی وشەی (کۆڕ) بووە بە (ز) . کەچی مامۆستا عەلائەدین سەجادی لەو ڕایەدایە کە جیاوازی لە شێوەی جیاکردنەوەیاندا زۆرە و ئەو تێکەڵ بوونە زەحمەتە و ئەو بەڵگەیە بە پینەکردن دادەنێ[24] .

دەبینین هەندێ نووسەر دەنگی (ڕ)ی قەڵەو بە دوو پیت دەنووسن ، وەك : «شەرر ، پرر ، بررِیار ، دررین ، کررین . . .» . سەیر لەوەدایە ، ئەگەر بەوچەشنە ڕێنووسە وشەی وەك : «گۆرران . . .» بنووسین ، ئەوە دەبێ چوار (ر) لەتەك یەکەوە ریزبکەین ـ واتە بنووسین «گۆرررران . . .» بەپێی زانستی زمان دانانی دوو پیت بۆ یەك دەنگە ڕاست نییە ، سەرەڕای ئەوە دزوێیات کردنەوە بە هیچ جۆرێك نیشانەی قەڵەوی ناگەیەنێ . . . بێگومان دانانی چوکڵە ئاسانترو خێراترە لە

---

= کوردی ـ عەرەبی ـ فارسی ، بەغدا ، ۱۹٦۲ ، ل ۲۱ .

(۲۱) بروانە : کۆڕی زانیاری کورد ، ڕێنووسی کوردی ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، ب ۱ ، ژ ۱ ، بەغدا ، ۱۹۷۳ ، ل ۳٦۸ .

(۲۲) سەرچاوەی ناوبراو ، مەسعود محەمەد ، ڕێنووسی کۆڕ ، ل ۲٥٦ ـ ۲٥۷ .

(۲۳) سەرچاوەی ناوبراو ، د. جەمال نەبەز ، سەرنجێك لە چەند . . . ، ل ۹٤ .

(۲٤) سەرچاوەی ناوبراو ، عەلائەدین سەجادی ، دانانی نیشانەکانی پیتی کوردی ، ل ۱۸ .

نووسینی پیتێکی سەرلەبەر . جگە لەوەش لەبەرئەوەی لە زمانی کوردیدا حاڵەتی ئەوتۆ هەیە کە دوو دەنگی (ر)ی لاواز بەیەکەوە دێن ، بۆ تێکەڵ نەبوون وا چاکترە بە نیشانە وێنەی دەنگی (ڕ)ی قەڵەو لە وێنەی دەنگی (ر)ی لاواز جیابکرێتەوە[25] .

ئەوانەی (ڕ)ی قەڵەو بە دوو (ر) دەنووسن بەوپێیە دەبوو (ڵ)ی قەڵەویش هەر بە دوو (ل) بنووسن ، بەڵام چونکە لەم پیتەدا کێشە لەسەر شوێنی نیشانەی چوکڵەکە نییە ، بۆیە نووسینی ئەم پیتانەیان نەکردۆتە گیروگرفت .

لەو ڕایەدام کە تێکڕای ڕووناکبیران دژی نووسینی دوو (ر) و دوو (ل)ن و هەموو هەست بە ناڕاستی و نادروستی ئەو کارە دەکەن ، کەچی بەداخەوە گەلێ کەس هەن ، هۆی هەرچی یەك بێ لەوە تێناگەن یاخود نایانەوی لەوە تێبگەن کە نووسینی دوو واو بۆ دەنگی (وو)ی درێژ هەمان هەڵەی زمانەوانی یە .

باسێکی دی نووسینی (ڕ)ی قەڵەو کە کێشەی لەسەربێ ، (ڕ)ی سەرەتای وشەیە ، وەك ئاشکرایە ، هەموو (ر)یەك کە لە سەرەتای وشەوە بێ لە کوردیدا قەڵەوە و کورد هیچ کاتێك دەم بە (ر)ی لاواز ناکاتەوە . لەبەرئەوە هەندێك لەوڕایەدان ئەو (ر)یانەی لە سەرەتای وشەوە دێن پێویست ناکا چوکڵە بخرێتە سەریان ، چونکە لە کەس ناگۆڕێن[26] . بە بیری من ئەوکەسانە زۆر بەهەڵەدا چوون ، چونکە لە زمانی کوردیدا دوو فۆنیمی (ر) و (ڕ) هەیە ـ واتە یەکێك لاواز و یەکێك قەڵەو . بە وێنە لە وشەی (کەر)دا ئەگەر فۆنیمی (ر) بکرێت بە (ڕ) ، ئەوە وشەی (کەڕ) پەیدا دەبێ کە جیاوازییەکی تەواو لە مانایاندا هەیە . جا بەپێی ئەو

---

(٢٥) بە پێویستی دەزانم ، پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشم کە مامۆستا شێخ حەسەن و د. مارف خەزنەدار دەمێکە دەربارەی نادروستی دوو (ر) نووسین هەندێ بەڵگەی واقیعی یان خستۆتەڕوو .
بڕوانە :
أ ـ شێخ حەسەن ، ڕەخنەیەکی زانستی لە مامۆستای بەڕێز جەمیل ڕۆژبەیانی ، گۆڤاری «پێشکەوتن» ، ژ ١٠ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٦ ـ ٨ .
ب ـ مارف خەزنەدار ، زمانەوانی ، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ» ، ژ ٦ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٢٥ .

(٢٦) بەوێنە بڕوانە : د. جەمال نەبەز ، سەرچاوەی ناوبراو ، سەرنجێك لە چەند . . . ، ل ٩٤ .

پێویستی یە لە ڕێنووسی کوردیدا دوو پیت بۆ ئەو دوو فۆنێمە دانراوە ، کە ئەوەش نیشانەی جیاکردنەوەیانە . جا هەر لەبەر ئەوەی هەموو (ڕ)یەك کە لە سەرەتـای وشەی کوردییەوە دێت قەڵەوە و کورد هیچ کاتێك دەم بە (ر)ی لاواز ناکاتەوە ، ڕاست نییە بچین وێنەی فۆنێمێکی تر لەجێی دابنێین ، بەتایبەتی کـە ئەو فـۆنێمە وێنەی خۆی هەبێ . دانانی وێنەی فۆنێمێك بۆ فۆنێمێکی تر ، نەك هەر پێـڕەوی نەکردنی دەستووره سەرەتایی یە ئاشکراکـانی زمانـەوانی یە ، بـەڵکو پـەیداکـردنی گیروگرفتێکی نوێ یشه[٢٧] [٢٨] .



لەبەر ڕۆشنایی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا ، بۆمـان دەرکەوت کـە وێنەی دەنگی بزوێنی (و) و (ی) درێژ و کورتە بزوێنی (ا) و کۆنسـۆنانتی (و) و (ی) و دیفتۆنگی (وێ)و کۆنسـۆنانتی (ڕ)ی قەڵەو لە ڕێنووسی کوردیدا گیروگرفتیان هەیەو کێشەیان لەسەرە و پێویستیان بە چارەسەر کردنە .

دەنگی بزوێنی (و)ی درێژ کە لە ڕێنووسدا بە دوو واو یان (و ـ کەشیدەیەکی لەسەر) دەبینرێ ، هەردوو نیگارەکە باش نین . یەکەمیان ـ واتە دوو واو نووسین ـ لە ڕووی زانستی زمانەوە هەڵەیە ؛ دووەمیان ـ واتە (و ـ کەشیدەیـەکی لەسـەر) شێوەی ناحەزە . بۆیە ئەم دەنگە پێویستی بە نیگارێکی نوێی گونجاوە .

---

(٢٧) لە وتاری ناوبراوی د. نەبەزدا ، دەستەی بەڕێوەبەرانی گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات ڕای د. نەبەزیان ڕەت کردۆتەوە و بوونی چوکڵەیان بە پێویـست داناوە (بڕوانە : د. جەمـال نـەبەز ، سـەرچاوەی نـاوبراو ، سـەرنجێك لـە چەنـد . . . ، پـەراوێـزی ل ٩٤) . هـەرچەنـدە دەسـتەی نـاوبراو بـە شێـوەیـەکی عـەفـەوی خـۆیـان لـەو مـەسـەلـەیـە تێ هەڵقورتاندووە ، بەڵام بە ڕێکەوت نیشانیان پێکاوە .

(٢٨) شایانی باسە ، مامۆستا شێخ حەسەن لە وتاری ناوبراودا (ڕەخنەیەکی زانستی لە مامۆستای بەڕێز جەمیل ڕۆژبەیانی ، گۆڤاری «پێشکـەوتن» ، ژ ١٠ ، بەغـدا ، ١٩٥٨ ، ل ٧) لەبارەی پێویستی دانانی چوکڵەی (ڕ)ی سەرەتای وشەشەوە ، هەندێ بەڵگەی دروستی خستۆتە پێش چاو .

هەڵەی نووسینی دوو (ی) یان (ی ـ کەشیدەیەکی لەسەر) بۆ دەنگی بزوێنی (ی ـ î) لەوەدایە ، یەکەمیان پەیرەوی یاسای فۆنەتیکی تێدا نەکراوە و دووەمیشیان شێوەی نالەبارە . جا لەبەرئەوەی هیچ کامێکیان لەگەڵ هەڵکەوتی زمانی کوردیدا ناگونجێن ، پێویستە لەبیر ببرێنەوە .

نەبوونی نیشانەیەك بۆ کورتە بزوێنی (i) و کۆنسۆنانتی (و) و (ی) بووەتە هۆی کێشەیەکی گەورەی رێنووسی کوردی و ئەم ناتەواوییە نەك هەر سەری لە قوتابیان ، بەڵکو لە هەندێ زمانەوانیش تێكداوە . لەبەرئەوە دانانی نیگار بۆ ئەو دەنگانە کارێکی زۆر پێویستە لە نەهێشتنی کەموکورتی ئەو رێنووسەدا .

دیفتۆنگی (وێ) کە هەندێ کەس بە (و ـ کەشیدەیەکی لەسەر) دەینووسن ، بە ناوەرۆك هەڵە و بە رووخسار ناحەزە . ئەمە پێویستی بە دوورخستنەوەیە و نابێ لە هیچی نەبوو گیروگرفت پەیدا بکرێ .

بۆ نیشاندانی قەڵەویی دەنگی (ر)ی قەڵەو لە هەموو روویەکەوە نووسینی دوو (ر) هەڵەیە و دانانی چوکڵە راستە . هەرچی چوکڵەشە لەسەرەوە دانانی گیروگرفت پەیدا دەکا و باشتر وایە وەك لە زووەوە رۆیشتووە لە ژێرەوە دابنرێ . دانەنانی چوکڵەش بۆ (ڕ)ی سەرەتای وشە کارێکی ناشیانەیە .

بەو پێیە باشتر وایە :

١ ـ نووسینی دوو واو یان (و ـ کەشیدەیەکی لەسەر) بۆ بزوێنی (و)ی درێژ لەگەڵ نووسینی دوو (ی) یان (ی ـ کەشیدەیەکی لەسەر) بۆ بزوێنی (ی)ی هێزدار فەرامۆش بکرێ .

٢ ـ وێنە بۆ بزوێنی (و)ی درێژ و کورتە بزوێنی (i)و کۆنسۆنانتی (و ـ w)و (ی ـ y) بکێشرێ .

٣ ـ نیگاری دەنگی (ی ـ î) و (وێ) و (ڕ) زوو چۆن بوون وا بمێننەوە و ئەو دەستکارییانەی کراون لەبیر ببرێنەوە .

بینیمان لەو ئەلفوبێ عەرەبییە دەستکاری کراوەدا کە بۆ نووسینی کوردی سازکراوە نیگاری هەندێ دەنگ گیروگرفتیان هەیە و کێشەی زۆریان لەسەرە و پێویستیان بە چارەکردنە . بەڵام بێتوو لە ئەلفوبێی لاتینیدا تەماشای نیگاری ئەو چەند دەنگە بکەین ، ئەوە گیروگرفتێکی ئەوتۆ بەدی ناکەین . بەو پێیە وێنەی دەنگەکانی ئەلفوبێی لاتینی بۆ نووسینی کوردی لەبارترە .

## - ٢ -

# گیروگرفتی نووسینی وشەکان و تێکبەستنیان

لە نووسینی وشەکانی زمانی کوردی و تێکبەستنیاندا گیروگرفت ئێجگار زۆرە و باسکردنی گشتیان شتێکی ئاسان نییە . هەرچەندە ئەو تێبینیانەی لێرە بەدواوە دەیانخەینە بەرچاو مشتێکن لە خەرواری گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی ، بەلام هەرە گرنگەکانیان و کێشە زۆرەکانن . . . بەپێی لێکۆڵینەوەو بۆچوونمان ئەو کۆسپانەی لە وشەکان و تێکبەستنیاندا هەیە ، لەو چەند خاڵەی خوارەوەدا کۆمان کردوونەتەوە :

١ - نەنووسینی هەندێ پیت و پێڕەوی نەکردنی پاراستنی بناغەی وشە و کاری فۆنەتیك لە ڕێنووسدا .

٢ - وشەی سادە لەگەڵ مۆرفێمە ئەفیکسی یەکان .

٣ - وشەی لێکدراو .

٤ - ناڕاستی لکاندنی هەندێ وشە بە پێش یان بەپاش وشەی دی یەوە .

٥ - تێکبەستنی پیتەکان .

٦ - نووسینی وشەی بێگانە .

## نەنووسینی هەندێ پیت و پێڕەوی نەکردنی پاراستنی بناغەی وشە و کاری فۆنەتیك لە ڕێنووسدا

وشەکانی وەك : وچان / ووچان ، وژە/ ووژە ، ولات/ وولات ، ولاخ/ وولاخ ، ون/ وون ، ورد/ وورد ، ورە/ وورە ، ورگ/ وورگ ، ورتە/ وورتە ، وڕووژان/ ووڕووژان ، وڕووکان/ ووڕووکان ، وریا/ ووریا ، وڕ/ ووڕ ، وڕە/ ووڕە ، وڕێنە/ ووڕێنە ، وس/ ووس ، وسڵ/ ووسڵ ، وسمە/ ووسمە ، وشە/

ووشـه ، وشك/ووشـك ، وشتر/ ووشـتر ، وتن/ ووتن ، وتار/ووتـار ، وزه/ ووزه . . . کـه به دهنگی (و ـ w)ی کـۆنسۆنـانت دهست پێ دهکـهن ، هـهنـدێ لهورایهدان که بهیـهك واو بنووسـرێن و ههنـدێکیش نووسینی دوو واو پـهسهنـد دهکهن .

بهشێك لهوانهی یهك واو دهنووسن ، بێ ئهوهی بیریان لێ کردبێتهوه ، ههر له خۆڕا وایان بهلاوه باشتره . . . ههرچهنده بهشهکهی دی له ئهنجامی لێکدانهوه و بۆچوونهوه ئهو ههڵوێستهیان وهرگرتووه ، بهڵام تارادهیهك کهوتوونهته ههڵهوه . بهوێنه مامۆستا مهسعوود محهمهد که لایهنگیری یهك واو نووسینه بهڵگهی ئهوهیه که دهڵێ : «له نووسینی ئهو وشانهی به (ڕ)ی قهڵهو دهست پێ دهکـهن ، نووسـهران دهڵێن پێویست نییه نیشانهی (ڕ)ی قهڵهو بخرێته سهر ، چونکه ههمیشه دهنگی (ڕ) له سهرهتای وشهدا به قهڵهوی دهردهبردرێت ، کهواته لزووم به نیشانه ناکات . که ئهم لێکدانهوهیه و ئهو بریاره قبووڵ بکـرێت ، دهبێ بهنیسبـهت وشهی (ورچ ، وشه ، وزه . . .)یشهوه ههمان لێکدانهوه بکرێت»[۲۹] . له سهرێکهوه جیـاوازی لهنێوان (ڕ)ی سهرهتای وشه و (و ـ w)ی کۆنسۆنانتدا ، که کورته بزوێنی (و ـ u) یان (i)ی بهدوادا دێت ، ههیه . له سهرێکی تریشهوه فرێدانی وێنهی دهنگێك دهبێته هۆی پهیدابوونی ناتهواوی له پارچه پێکهێنهکانی وشهدا . جا که تێکرای دهنگهکانی وشهیهك وێنهیان ئاشکرا نهبوو ، ئهوه ئهو رهچـاو نهکـردنه نـهك ههر لادانـه له سهرهتای زمانهوانی ، بهڵکو له زۆر ڕووهوه دهبێته گیـروگرفت . بـهوێنه ئـهگهر تهماشای وشهی (ووزه) بکهین دهبینین له چوار دهنگ (و ـ w/ و ـ u/ ز ـ z/ ه ـ e) و دوو برگه (وو ـ wu/ زه ـ ze) پێکهاتووه و له ههر برگهیهکیاندا بزوێن ههیهو وهك ئاشکراشه مهرجه له برگهدا بزوێن ههبێ . جا که ئهم وشهیه به دوو واو نووسرا ئهوه هیچ دهنگێکیان بێ نیگار نابێ و هیچ برگهیهکیان ناتهواوی تێناکهوێ . کـه دهنگهکانیش له نووسیندا وێنهیان وا ڕوون بێ ، ئهوه گیروگرفت نایهتهرێ . بهڵام بێتوو ئهو وشـهیه بـه یهك واو بنـووسین ، ئـهوه دهنگێکیان بێوێنـه دهمێنێتهوه و برگهیهکیان کهم دێنێ . سهرهرای ههموو ئهوهش ، ئهمه سهر له قوتابیان و ئهوانهی فێری زمانی کوردی دهبن تێك دهدات . بێگومان له دانانی رێنووسدا زۆر گرنگه که

---

(۲۹) مهسعوود محهمهد ، سهرچاوهی ناوبراو ، رێنووسی کۆڕ ، ل ۲۷٤ .

مەسەلەی پەروەردە رەچاو بکرێ .

هەندێك لەوانەی دوو واو دەنووسن ، بە هەڵە وا تێگەیشتوون کە ئەو جۆرە وشانە بە بزوێنی (وو ـ ū) دەستپێدەکەن . هەرچەندە کۆمەڵی دووەم لە رێگەی لێکدانەوەوە بۆ ئەوە چوون کە بەدوا دەنگی (و ـ w)ی کۆنسۆنانتی سەرەتادا کورتە بزوێنی (و ـ u) دێت ، بەڵام لێکۆڵینەوەی تەواویان نەکردووە . لەم رووەوە بۆچوونی مامۆستا نووری عەلی ئەمین ، بەتایبەتی کە پێکهاتنی برگەکانی ئەو جۆرە وشانەو بوونی ئەو کورتە بزوێنی (و ـ u)ی کردۆتە بەڵگەی دوو واو نووسین[30] بە لای منەوە رایەکی زانستی یە و شایانی باسە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆ تەواو روون کردنەوە و چەسپاندنی ئەو رایە هەندێ لایەن و بەڵگەی دی هەن ، کە لێیان دەدوێین .

بەر لە هەموو شتێك گومان لەوەدا نییە کە ئەو وشانە بە بزوێنی (وو ـ ū) دەستپێناکەن ، چونکە وەك ئاشکرایە لە زمانی کوردیدا بزوێن لە سەرەتای وشەوە نایەت . سەرەرای ئەوە ئەگەر بزوێن بوایە دەبوو (ئـ) لەپێشیانەوە پەیدا بێ و بوترێ (ئووشە ، ئـووشك ، ئـووریا ، ئـوورتە . . .) . دەشـزانین کـەوا ناوترێ .

گومان نییە کە دەنگی سەرەتای ئەو وشانە (W)ە ، بەڵام دەبێ بکۆڵینەوە و بزانین دووەم دەنگە (u)ە یان (i)ە . جا کە گەیشتینە ئەو ئەنجامە ، ئەوسا دەتوانین بریار بدەین کە چۆن بنووسرێ .

لـە رۆژنامـەی «تێگـەیشتنی راستی»دا ئـەو وشـانـە جـارویـار بـە دوو واو نووسراون . بەوێنە بروانە : «ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٣ ـ «ام وولاتە») ؛ (ژ ٦٥ ، ل ٣ ، س ٣ ، د ٢٦ ـ «ووتی») . . . بەمەدا دەردەکەوێ مێجەر سۆن بۆ ئەوە چووە کە لەو جۆرە وشانەدا بەدوا دەنگی (و ـ w)ی کۆنسۆنانتی سەرەتادا کـورتە بزوێنی (و ـ u) دێت بۆیە بە دوو واو نووسیونی . ئەوەی پتر ئەم رایەمان بچەسپێنێ ئەوەیە ، مێجەر سۆن لەو دوو کتێبی رێزمانەدا کە یەکێکیانی بەر لە شەر ـ واتە لە ساڵی ١٩١٣[31] ـ و ئەوی دی یانی دوای شەر ـ واتە ساڵی ١٩١٩[32] ـ بڵاوکردۆتەوە ،

(٣٠) نووری عەلی ئەمین ، رابەری بو ئیملای کوردی ، بەغدا ، ١٩٦٦ ، ل ٣٢ ـ ٣٣ .

(٣١) E. B. Soane, Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language, London 1913.

(٣٢) E. B. Soane, Elementary Kurmanji Grammar, Baghdad 1919.

سەرەتای بەشێك لەو جۆرە وشانەی بە (wu) نووسیوە . بەوێنە لە کتێبی یەکەمدا ، بڕوانە : (ل ١٥٤ ، د ٢٤ ـ «wuti» ؛ (ل ١٨٤ ، د ٢٩ ـ «wushtir») . . . و لە کتێبی دووەمدا ، بڕوانە : (ل ٩١ ، د ١ ـ «wurdik») ؛ (ل ١٠٥ ، دوادێڕ ـ «wurr») . . .
مێجەر سۆن لە هەردوو کتێبی ناوبراودا بۆ نیشاندانی دەنگی دووەمی کەمێك لەو وشانەی بە (و ـ w) دەستپێ دەکەن ، پیتی (i)ی داناوە ، نەك (و ـ u) . بەوێنە بڕوانە : کتێبی یەکەم (ل ١٧٨ ، د ٨ ـ «wirch») . . . کتێبی دووەم (ل ٩٠ ، د ٢٣ ـ «wishik») . . . بێگومان ئەمەش دەبێتە بەڵگەی ئەوەی بتوانین ، بڵێین ، نووسەری ناوبراو لەو رایەدا بووە کە دەنگی دووەمی زوربەی هەرە زۆری ئەو جۆرە وشانەی بە کۆنسۆنانتی (و ـ w) دەستپێ دەکەن ، کورتە بزوێنی (u)ن ، بەلام لەناویاندا وشەی ئەوتۆ هەن ، کە بەدوا (و ـ w)ی کۆنسۆنانتدا کورتە بزوێنی (i) هاتووە .

لە فەرهەنگەکەی مامۆستا تۆفیق وەهبی و س . ئەدمۆنس‌دا تێکرای ئەو وشانەی بە (و ـ w)ی کۆنسۆنانت دەستپێ دەکەن ، پیتی (u) بەدوایاندا هاتووە ، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ئەو دوو زانایە باوەڕیان وایە دەنگی دووەمی ئەو وشانە کورتە بزوێنی (u)ە[٣٣] . لە فەرهەنگی مامۆستا قەناتی کوردۆدا زوربەی وشەکان هەر بەو چەشنە تۆمارکراون ، بەلام چەند وشەیەك بە هەردوو شێوە ، واتە ـ پیتی دووەم (u)و (i) ـ نووسراون . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە مامۆستا کوردۆ وای بۆچووە کە لە هەندێ وشەدا دەنگی دووەم دوور نییە (i) بێت[٣٤] .

من لەو رایەدام کە زوربەی هەرە زۆری ئەو جۆرە وشانە کورتە بزوێنی (u)ە ، بەلام لەناویاندا وشەی ئەوتۆ هەن ، کە بەدوا (و ـ W)ی کۆنسۆنانتدا بزوێنی (i) هاتووە . بێگومان لە ڕێگای ئامێری تایبەتی پێوانە و کێشانەی دەنگە و قووڵ بوونەوەوە لە یاسای فۆنەتیکی زمانەکەمان ، باشترین ساغ کردنەوەی ئەو کێشەیە دابین دەکرێ . بەداخەوە ئێمە هێشتا نەبووینەتە خاوەنی ئەو جۆرە ئامێرانە و لێکۆڵینەوەی فۆنەتیکی زمانەکەشمان هێندە کزە تازە بەئاستەم توێژی سەرەوەی

(٣٣) Taufiq Wahby and C. J. Edmonds, A Kurdish- English dictionary, London 1966, P. 154-155.

(٣٤) قەناتی کوردۆ ، فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٧٩٢ ـ ٧٩٣ .

خەریکی دەرکەوتنە . جا منیش لیرەدا هەر ئەوەندەم لە دەست دێ کە لەو توێژاڵەی سەرەوە بەڵگە بێنمەوە :

بۆنموونە لە زمانی کوردیدا (گوتن ـ gutin)یش و (ووتن ـ Wutin)یش دەوترێ . گۆڕانی دەنگی (و ـ W)ش بە (گ) هەیە . دیارە کە (گوتن) و (ووتن) هەر یەك وشەن و تەنیا یەکەم دەنگ گۆڕانی بەسەردا دێت . لە (گوتن)دا ئاشکرا دیارە کە دووەم دەنگ کورتە بزوێنی (و ـ u)ە . جا بەوپێ یە لە (ووتن)یشدا هەر هەمان بزوێن بەدوا (و ـ W)دا هاتووە . . . لە وشەی (حوشتر / ووشتر)یشدا هەمان دیاردە دەبینین ـ واتە دەنگی (ح) و (W) بە یەك دەگۆڕدرێنەوە . بزوێنی (و ـ u)ش ڕەوان لەدوای (ح) ەوە هاتووە . جا دەبێ هەر (u)ش بێ بەدوا (W)شدا هاتبێ .

بەمە و بە گوێڕاگرتن لە تەلەفوزکردنی زوربەی ئەو جۆرە وشانەدا دەردەکەوێ کە دەبێ بە دوا (و ـ W)ی کۆنسۆنانتدا کورتە بزوێنی (و ـ u) بێت ، بەڵام پێویستە سەرنج بۆ ئەوە ڕابکێشین کە بزوێنەکانی دیش بەئاشکرا لەدوای (و ـ W)ەوە دێن ، وەك : (وازهێنان ، واشە ، واتە ، وانە . . . وەرز ، وەتەن ، وەڕین ، وەجاخ . . . وێڵ ، وێر ، وێژە ، وێرا . . . هتد) . جا کەوابوو پێویستە بیر لەوەش بکەینەوە ، کە ئایا کورتە بزوێنی (i) بەدوا (و ـ W)دا دێت .

ئەگەر لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا بەراوردێك لەنێوان هەندێ لەو جۆرە وشانەدا بکەین ، ئەوە بۆمان ئاشکرا دەبێ ، کە حاڵەتی ئەوتۆ هەیە بەدوا (و ـ W)ی کۆنسۆنانتی سەرەتای وشەدا کورتە بزوێنی (i) دێت . بەوێنە لە کرمانجیی ژووروودا دەوترێ (هرچ ـ hirç ، هشك ـ hişk . . .) ، لە کرمانجیی خواروشدا (ورچ ـ Wirç ، وشك ـ Wişk . . .) . دیاردەی گۆڕانی دەنگی (هـ ـ h) بە (و ـ W) باوە و ئەمە کێشەی لەسەر نییە . هەرچی دووەم دەنگە لە دیالێکتی ژووروودا ئاشکرایە کە کورتە بزوێنی (i)ە و بە هیچ جۆرێك (u) نییە و هیچ کات (هورچ ـ hurç ، هوشك ـ huşk) نالێن . بەوپێ یە دەبێ لە دیالێکتی خواروشدا دەنگی دووەم (i) بێ و وشەکان (ورچ ـ Wirç ، وشك ، Wişk) بێ .

بەوپێ یە دەبێ لەپێشەوە هەندێ کێشەی فۆنەتیکی زمانەکەمان ساغ بکەینەوە ، ئەوسا بڕیاری نووسینی دوو واو یان یەك واو بدەین : ئەگەر ئاشکرا بوو کە بەدوا دەنگی (و ـ W)دا کورتە بزوێنی (و ـ u) هاتووە ، ئەوە لەبەر ئەو

هۆیانەی لەسەرەوە نیشانمان‌دان ، باشترە بە دوو واو بنووسرێ[٣٥] خۆ بێتوو کورتە بزوێنی (i) ی بەدوادا بێت ، ئەو دەمە ڕاستتر وایە بە یەك واو بنووسرێ[٣٦] . . .

دەزانین لە وشەکانی (دوو ، موو ، مووروو ، بەڕوو ، ئارەزوو ، جوانوو ، ئەرازوو . . .) دا دەنگی کۆتایی بزوێنی (وو ـ ū)ی درێژەو ئەمە لە ڕێنووسی باوی کوردیدا دوو پیتی واوی بۆ کراوەتە نیگار و کۆڕیش پیتێکی واو (و ـ کەشیدەیەکی لەسەر)ی بۆ پەسەند کردووە . . . هەروەها ئەوەش دەزانین کە دوو دەنگی بزوێن پێکەوە نایەن و لە حاڵەتی پاراستنیاندا کۆنسۆنانتی (ی ـ y) یان (و ـ W) دێتە نێوانیانەوە . بۆنموونە کاتێ نیشانەی (ان) ی کۆ بخرێتە سەر وشەیەك کە کۆتایی بە بزوێنی (ا ، ێ . . .) هاتبێ ، ئەوە کۆنسۆنانتی (ی ـ y) پەیدا دەبێ ، وەك :

برا + ی ـ y + ان = برایان

پێ + ی ـ y + ان = پێیان

بەڵام ئەگەر وشەیەك کۆتایی بە بزوێنی (وو ـ ū) بێت و نیشانەیەکی بە بزوێن دەست‌پێ‌کردووی پێوە بلکێنرێ ، ئەو دەمە لە نێوان وشە و نیشانەکەدا کۆنسۆنانتی (و ـ W) دێتە کایەوە[٣٧] . بەوێنە :

---

(٣٥) ئەو دوو واو نووسینەش هەموو گیروگرفتەکان لانابا و بەشێکی هەر دەمێنێ ، چونکە دوو واو کە یەکەمیان وێنەی کۆنسۆنانتی (W)و دووەمیان وێنەی کورتە بزوێنی (u)ە خاوەنی یەك نیگارن . جا دەمێك کێشە نامێنێ کە لە ئەلفوبێی عەرەبیدا نیگار بۆ (w)ش بکێشرێ .

(٣٦) ئەمیش ئەو ناتەواوییەی هەر تێدا دەمێنێ ئەگەر ئەو ڕێنووسە دەنگی (i)ی بۆ زیاد نەکرێ .

(٣٧) ئەم دەستوورە کە ئەمڕۆش هێشتا گەلێك لە ڕووناکبیران و بەشێك لە زمانەوانانی کورد لێی بێ‌ئاگان ، کەچی مێجەر سۆن هەستی پێ کردووە . ئەگەرچی لە ڕۆژنامەی «تێگەیشتنی ڕاستی»دا بەدەگمەن نموونەی وا بەرچاو دەکەوێ ، کە لەوجۆرە حاڵەتانەدا (و ـ w)ی کۆنسۆنانتەکەی بۆ نووسرابێ (بەوێنە بڕوانە : ژ ٣ ، ل ٢ ، س ١ ، د ٤ ـ «پێشووەوە» . . .) ، بەڵام ئەمە هیچ لە مەسەلەی ئەو دەرك‌پێ‌کردنە کەم ناکانەوە و ناگۆڕێ .

أ ـ نیشانەی (ان) ی کۆ :

m˘ur˘u + W + an ⟶ m˘ur˘uwan

ber˘u + W + an ⟶ ber˘uwan

ب ـ نیشانەی (ەکە)ی ناسیاوی :

araz˘u + W + eke ⟶ araz˘uweke

teraz˘u + W + eke ⟶ teraz˘uweke

حـ ـ نیشانەی (ە)ی ناسیاوی :

t˘u + W + e ⟶ t˘uwe

c˘u + W + e ⟶ c˘uwe

. . . و هەندێکی تر[٣٨] .

راستە لەم جۆرە حاڵەتانەدا بزوێنی (وو ـ u˘)ی کۆتایی وشەکە کەمێك لە باری ئاسایی کورتتر دەوترێت ، بەڵام ئەم دیاردەیە کە هۆی جێ گۆڕینی هێز یان پێکەوەهاتنی دەنگی وێکچوو یان دەنگەکانی دەوروبەر . . . ە ، نابێ ببێتە هۆی شێواندنی بناغەی وشە .

هەندێ کەس بێ ئەوەی بیر لە ئاکام بکەنەوە وایان بە باش زانیوە چۆن بە دەمدا دێت هەر بەوچەشنە بینووسن . لە سەرێکی تریشەوە نادروستی نیگاری بزوێنی (وو ـ u˘) نووسەرانی ناچارکردوە فەزڵی هەڵە بەسەر راستدا بدەن . بۆ نموونە دەنووسن (جوانووەکە ، دووەم ، جووە . . .) ، کەچی راستەکەی (جوانوووەکە ، دوووەم ، جوووە . . .)یە . شێوەی نالەباری سێ واو بەدوا یەکدا هاتن وای لە خەڵك کردووە واوێکیان فڕێ بدەن . بەڵێ لەرووی ڕوخسارەوە دوو

---

(٣٨) مارف خەزنەدار راست بۆ ئەوە چووە کە دەڵێ ، کاتێ (ەم) بەدوای وشەی (سێ ، نۆ ، دە)دا دێت ، ئەوە بۆ پاراستنی بزوێنەکان (ی ـ y) لەنێوانیاندا پەیدا دەبێ . بەڵام لەوەدا بە هەڵە چووە کە وا تێگەیشتووە (ەم) چۆن بە رەوانی بەدوا وشەی (یەك)ەوە دەلکێ ، هەر بەوچەشنە بە کۆتایی وشەی (دوو)یشەوە دەنووسێ (بڕوانە : مارف خەزنەدار ، زمانەوانی ، گۆڤاری «رۆژی نوێ» ، ژ ٨ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١٣) . راستی ئەوەیە ، کاتێ (ەم) بەدوا وشەیەکدا بێت ، کە کۆتایی بە بزوێنی (وو) هاتبێت ، ئەوە بۆ پاراستنی بزوێنەکە (و ـ w) دێتە ناوانەوە .

واو جوانتره و سێ واو بەیەکەوە نووسینێ ناشیرینە ، بەڵام لە ڕووی تـاوەرۆك و واقیعی زمانەوانی یەوە دوو واو هەڵەیە و سێ واوە ناشیرینەکە ڕاستە .

بەپێی ڕێنووسی کۆڕیش کە لە بریتی دوو واو (و ـ کەشیدەیەکی لەسـەر) پەسەند کراوە ، دەبوو بنووسن (جوانۆوەکـە ، دۆوەم ، جۆوە . . .) ، کـەچی دەنووسن (جوانووەکە ، دووەم ، جووە . . .) . لێرەدا کورت بوونەوە کۆری بەو هەڵەیەدا بردووە کە وێنەی فۆنیمی (و ـ u) لە جێی وێنەی فۆنیمی (وَ ـ ˆu) دابنێت .

وەك پێشتر لە باسی نووسینی (ڕ)ی سەرەتای وشەدا پەنجەم بۆ ڕاکێشاوە ، لە ڕووی زانستی زمانەوە هەڵەیە وێنەی فۆنیمێك بۆ فۆنیمێکی تر دابنرێ . سـەرەڕای ئەوە ئەمە بناغەی وشە تێك‌دەدا ، چونکە ئەگەر لە ڕووی وێنەی ئەو نووسینەوە وشە و نیشانەکان لە یەك جیا بکەینەوە ، ئەوە (جوانو ، دو ، جو . . .) دەمێنێتەوە . جا لەم سەرەشەوە هەڵەیەکی تریش سەرهەڵدەدا .

ئەوەی لەم بارەیەوە پتر جێی ڕەخنە بێ ، ئەوەیە لە چاپەمەنییەکانی کۆڕدا ، بەتایبەتی لەوانەی مامۆستا مەسعوود محەمەددا وشەی (dˆuwem) نووسراوە (دوەم) . باشە . ئەم وشەیە کە لە (dˆu + W + em) پێکهاتووە ، کوا پیتی (وَ ـ û ) ؟ . خۆ ئەگەر لەسەر بناغەی ئەو جۆرە نووسینە تەماشای ڕۆنانی ئەو وشەیە بکەین ، ئەوە دەبینین لە (د + و ـ W + ەم) سازبووە ، واتە لە نیگارەکانی وشەی (دۆ)دا تەنیا پیتی دال دیارە . بەلای منەوە لە هەموو ڕوویەکەوە نووسینی (دوەم) هەڵەیە ، جا با لە هەندێ ناوچە بزوێنی (وَ)ش قووت بـدرێ . بەو پێیـە دەبێ لە نـووسیندا دالـە کلۆرەکەی سلێمانیش نەنووسرێ .

نەشێواندنی بناغەی وشە لە مەسەلەی ڕێنووسدا زۆر گرنگە و شایانی باسە هەندێ حاڵەت لەلایەن هەموانەوە پارێزراوە . هەر لە کورت و درێژی بەدەمدا هاتنی بزوێنی (وو ـ ˆu)دا چەندین نموونەی ئاشکرا هەیە . بەوێنە ئـەو بزوێنـە لە (نووسین ، پێنووس)دا درێژتر تەلـەفوز دەکـرێ وەك لە (نـووسرا . . .)دا[٣٩] ، کەچی تێکرا بە دوو واو دەینووسن . ئەمەش کارێکی ڕاستە و لەگەڵ زانستی زماندا دەگونجێ .

---

(٣٩) هۆی ئەمەش ، ئەوەیە کە لە وشەکانی (نووسین ، پێنووس . . .)دا ، هێز لەسەر دەنگی (وو ـ ûu)ە ، بەڵام لە وشەی (نووسرا)دا ، هێز دەخرێتە سەر دەنگی (ا) . . . لە زمانی کوردیدا دیاردەی گوێزانەوەی هێز لە بڕگەیەکەوە بۆ بڕگەیەك زۆر باوە ، بەڵام بەداخەوە لە

=

پێڕەوی کردنی پاراستنی بناغەی وشە و کاری فۆنەتیك هەندێ حاڵەتی تری وشە دێنێتەوە بیر :

**١ ـ کورت کردنەوە و تێداچوون**

ئەگەر دوو دەنگی وێکچوو یاخود لێك نزیك بکەونە پاڵ یەك ، ئەوە لە دەربریندا یەکێکیان ون‌دەبێ . بەوێنە کاتێ نیشانەی (تر)ی بەراورد ئیزافەی سەر وشەی (کورت) دەکەین ، ئەوە دەبێتە (کورتتر) ، بەلام لە دەربریندا دەوترێ (کورتر) . (پاك کردن) کە لە (پاك) و (کردن) پێکهاتووە ، بە (پاکردن) بەدەمدا دێت . . . وشەی (دەست‌کەوت) کە لە (دەست + کەوت) سازبووە بە (دەسکەوت) تەلەفوز دەکرێ ، چونکە لەسەرێکەوە دەربرینی سێ دەنگی (س ، ت ، ك)ی کۆنسۆنانتی کپ پێکەوە خۆش و ئاسان نییە ، لە سەرێکی تریشەوە لە زمانی کوردیدا (ت) کە لە دوای (س)ەوە دێت ، زۆر جار قووت‌دەدرێ . بەوێنە لە زۆر جێگە (دەست) دەبێتە (دەس) ؛ (مەبەست) دەکەنە (مەبەس) . . .

بە رای من راست نییە ئەو جۆرە وشانە لەسەر بناغەی تەلەفوز بنووسرێن ، بەڵکو لە نووسیندا پێویستە شێوەی پێکهاتنیان رەچاو بکرێ و ئەو پەراندن و ون‌بوون و تێکەڵاوبوونە رەنگ نەداتەوە ـ واتە راسترە بنووسرێ : کورتتر ، پاك‌کردن ، دەست‌کەوت . . .

بەراستی تێچوونی دەنگی (ت) روون‌کردنەوە و لێکۆڵینەوەی تەواوی دەوێ ، چونکە لە زۆر جێگەدا بێ رەچاوکردنی نێزیکی و دووری نێوان دەنگەکان ئەم (ت)ە دەقرتێ ، وەك دەوترێ (دەڕوا) لەجیاتی (دەڕوات)[40] . یاخود لە

---

= مەسەلەی رێنووسدا رەچاو نەکراوە . . . بە رای ئێمە ، نووسینمان وەك نووسینی هەندێ لە زمانە ئەورووپاییەکان ، بەتایبەتی بۆ هەڵەنەکردن لە نووسین و خوێندنەوەی هەندێ وشەدا و بۆ تۆمارکردنیان لە فەرهەنگدا پێویستی بە بوونی (هێز ـ Stress)ە . هەرچەندە بوونی ئەو نیگارە گیروگرفت دەرەوێنێتەوە ، پێویست ناکا بۆ هەموو وشەیەك بەکاربهێنرێ ، بەڵکو تەنیا لەکاتی پێویستدا بۆ جیاکردنەوە .

(٤٠) دیاردەی تێچوونی (ت) لە وشەکانی وەك : دەکات ، دەچێت ، دەڕوات . . . دا زوو پەرەی سەندووە . بەوێنە لە رۆژنامەی «تێگەیشتنی راستی»دا نەك هەر ئێجگار زۆر بووە ، بەڵکو بەدەگمەن غوونەی ئەوتۆ بەرچاو دەکەوێ پیتی (ت)ەکەی لەگەڵدا نووسرابێ .
=

شێوەکانی ئاخاوتنی سلێمانی لە زۆر جێگەدا (ت)ەکە کلۆر دکرێت ، وەك کە دەڵێن « ئەمە . . . (و) لەچی » لەبریتی « ئەمەت لە چی ؟ » یاخود « را . . . (و) لێیە » لەجیاتی « رات لێیە » . . .

بێگومان ئەو جۆرە قرتاندن و کلۆرکردنە کە تایبەتی یە بە ناوچەیەك ، نابێ لە زمانی ئەدەبی و نووسیندا رەنگ بداتەوە .

هەروەها ئەگەر (ی)ی ئیزافە بخرێتە سەر وشەیەکی کۆتایی هاتوو بە بزوێنی (ی) ، ئەو کاتە نیشانەی (ی)ی ئیزافە لە تەلەفوزدا دەرناکەوێ ، وەك : (رێوی قەمچووغە ، ماسی گەورە . . .).بێگومان بۆ نیشاندانی باری رێزمانی و بوونی دۆخی ئیزافە ، باشتر وایە (ی)ی ئیزافەکە بنووسرێ با نەشخوێندرێتەوە ، واتە پێویستە بنووسرێ : (رێویی قەمچووغە ، ماسیی گەورە . . .) . شایانی باسە ، رۆژنامەی « تێگەیشتنی راستی » لە زۆر شوێندا ئەمەی رەچاو کردووە[41] و گۆڤاری « پەیام » سی ساڵێك پێش ئێستا پەنجەی بۆ ئەو راستی یە راکێشاوە[42] و مامۆستا شێخ حەسەنیش بیست ساڵێك لەمەوبەر بەباشی ئیسپاتی کردووە[43] . . .

---

= بۆنموونە لە ژمارە (١٠)دا هەژدە وشەی لەو جۆرە وشانە هەیە و هەر هەژدەیان بێ پیتی (ت) نووسراون . بروانە : (ل ١ ، س ١ ، د ٢٠ ـ «پیك‌دیْ») ؛ (ل ١ ، س ١ ، د ٢٣ ـ «دیکا») ؛ (ل ١ ، س ٢ ، د ٤ ـ «دردکوی») ؛ (ل ١ ، س ٢ ، د ٦ ـ «دکا») ؛ (ل ١ ، س ٢ ، د ١٠ ـ «دکا ، دیەوی») ؛ (ل ١ ، س ٢ ، د ١١ ـ «ببینی») ؛ (ل ١ ، س ٢ ، د ١٢ ـ «بکا») ؛ (ل ١ ، س ٢ ، د ١٤ ـ «دبینی ، دیەوی») ؛ (ل ١ ، س ٢ ، د ١٦ ـ «بکا») ؛ (ل ١ ، س ٢ ، د ١٩ ـ «دکا») ؛ (ل ٢ ، س ٢ ، د ١ ـ «دنوسی») ؛ (ل ٢ ، س ٢ ، د ٣ ـ «بکا ، دترسی ، دزانی») ؛ (ل ٢ ، س ٢ ، د ٤ ـ «دکا») ؛ (ل ٢ ، س ٢ ، د ٥ ـ «دنوسی») .

(٤١) بۆنموونە ، بروانە : (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ٧ ـ «مردیی اوان») ؛ (ژ ٢ ، ل ١ ، س ١ ، د ٢٣ ـ «سختیی جییان») ؛ (ژ ٣ ، ل ٢ ، س ١ ، د ١٣ و١٤ ـ «سربستیی خویان») ؛ (ژ ٤ ، ل ٢ ، س ١ ، د ٩ و١٠ ـ «کەشتیی دوشمن») . . .

(٤٢) لە (پۆستەی خوێنەواران)ی ژمارە (٢٠١)ی گۆڤاری «پەیام» (بەغدا ، ٣ی ئابی ١٩٥٣)دا چەند پرسیارێك لەبارەی نووسینی کوردییەوە کراوە و یەکێکیان لەمەڕ (ی) ئیزافەوەیە ، کە دەڵێ : «بۆچی ئەنووسن دیاریی گەنجەکان . ئایا ئاسانتر نی یە بنووسن دیاری گەنجەکان ؟» . لە وەڵامدا نووسراوە : «نەخێر . . . چونکە ئەگەر بنووسین دیاری گەنجەکان ، بەعنی دیار ی . . . گەنجەکان . ئەمە بێمەعنایە ، بەڵام ئەگەر =

بەداخەوە کۆڕی زانیاری کورد، تەنیا بە دەمداهاتنی ئەو وشانەی ڕەچاوکردووە و بڕیاری‌داوە ، ئەگەر (ی)ی ئیزافە چووە سەر ئەو وشانەی کۆتاییان بە دەنگی (ی) دێت نەنووسرێت[44] . مامۆستا مەسعوود محەمەد هەرچەندە زانایانە لەو مەسەلەیە دواوە و گەلێك سەری لێك داوەتەوە و زانیاریی باشی خستۆتە پێش چاو ، بەڵام هەر شێوەی تەلەفوزکردنی پەسەند کردووە[45] . د. کوردستانی موکریانیش بێ‌ئەوەی هیچ لەو کێشەیە قووڵ بێتەوە ، دەڵێ : « ئەگەر دیارخەر کۆتایی بە پیتە بزوێنی (ی) هات . ئامرازی خستنەسەر (ـی) لەگەڵ ئەم بزوێنەدا لێك‌دەدات و دەبن بە یەك . بۆیە نابێ لەگەڵ دیارخەرێکی کە دوا پیتی بزوێنی (ی) بوو پیتی (ی) بنووسرێ »[46] . . .

وەك دەزانین لە شێوەی سلێمانیدا دیاردەی گۆڕینی دەنگێك بۆ دەنگێکی تر یان کلۆرکردنی دەنگێك یان تێداچوونی دەنگێك یان قووت‌دان یان سوان یان قرتان . . . زۆر پەرەی سەندووە . ئەگەرچی ئەم جۆرە بابەتە پتر کێشەی زمانی ئەدەبین ، بەڵام تا ڕادەیەك پێوەندییان بە ڕێنووسیشەوە هەیە . جا لەم بارەیەشەوە کورتە گەشتێك بە زمانی کوردی و چاپەمەنی کوردیدا دەکەین :

ئاشکرایە لە شێوەی سلێمانیدا نیشانەی (دە)ی موزارەعەت دەبێ بە (ئە) ، وەك : دەڕۆم ـ ئەڕۆم ؛ دەچم ـ ئەچم ؛ دەزانم ـ ئەزانم . . .

---

= بنووسین دیاری . . . ی . . . گەنجەکان ، یەعنی هدیەی گەنجەکان . لەم گردە (جملة)یەدا یای یەکەم هی (دیاری) خۆیەتی ، یای دووەم هی إضافەکردنی (دیاری)یە بۆ گەنجەکان» (ل ٥) .

(٤٣) بڕوانە : شێخ حەسەن ، (ی)ی ئیزافە و (واو)ی عەتف ، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ» ، ژ ٦ ، ساڵی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٦١ ، ل ١٥ ـ ١٦ .

(٤٤) بڕوانە : کۆڕی زانیاری کورد ، ڕێنووسی کوردی ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣٧٨ .

(٤٥) بڕوانە : مەسعوود محەمەد ، بەکارهێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردی‌دا ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٦٦ ـ ٧٤ .

(٤٦) د. کوردستانی موکریانی ، ئامرازەکانی خستنەسەر لە زمانی کوردیدا ، «گۆڤاری زانکۆ» ، ب ٤ ، ژ ١ ، ل ١٥٩ .

ئەگەر بۆ دەست نیشان کردن و روون کردنەوەی پلە کان و شێوەی گۆرانی (دە) بە (ئە) ، گەشتێك بە دیوانی شاعیرانی کۆن و نوێی ناوچەی سلێمانیدا بکەین ، ئەوە دەبینین کە لە زوودا قاڵبی (دە) بەکارهاتووە و دوایی بووە بە (ئە) . بەوێنە لە تێکرای شیعرەکانی نالی و شاعیرانی دی سەردەمی ئەودا وێنەی (ئە) بە هیچ جۆرێك نابینرێ . . . بەلام ئەگەر بەرەوپێش بێین ، ئەوە دەتوانین رەورەوەی ئەو گۆرانە دیاری بکەین . بۆنموونە لە شیعرەکانی مەحویدا هەرچەندە بە زۆری (دە) بەکارهاتووە ، بەلام تاکە تاکەیەك شێوەی (ئە)ش دەبینرێ . زێوەر کە ماوەیەك بەدوا مەحویدا هاتووە ، بەپێچەوانەوە بە زۆری (ئە)ی بەکارهێناوە و دەنکە دەنکەیەکیش (دە)ی وتووە . . . بێکەس کە کەمێك پاش زێوەر کەوتووە تێکرا (ئە)ی وتووە و بە هیچ چەشنێك لە شیعرەکانیدا (دە) نابینرێ .

لە کاتی دەرچوونی رۆژنامەی « تێگەیشتنی راستی »یەوە تا سالآنی ۳۰ دیاردەی بوونی (دە) بە (ئە) بە شێوەیەکی سەرنج راکێش دەبینرێ و لەنێوان نووسەراندا جیاوازی بەدی دەکرێ . زوربەی نووسەرانی ئەم سەردەمە بە زۆری هێشتا (دە)یان بەکاردەهێنا و بەشێکیشیان پتر (ئە)یان دەنووسی . مستەفا پاشا و رەفیق حیلمی و عەلی کەمال باپیر . . . زیاتر بەلای (دە)دا دەچوون . بەوێنە وتارێکی مستەفا پاشا کە لە ژمارە (۱)ی رۆژنامەی « بانگی کوردستان »دا بە ناوی « جەمعیەتی کوردستان »ەوە بلاوکراوەتەوە[٤٧] حەوت نموونەی تێدایە ، کە شەشیان (دە)ن و تەنیا یەکێکیان (ئە)یە . لە ژمارە (۳)شدا وتارێکی هەیە[٤٨] (۳۰) نموونەی تێدایە ـ (۲٦)یان (دە)ن و تەنیا (٤)یان (ئە)ن . لە ژمارە (٤)یشدا وتارێکی بلاوکردۆتەوە[٤٩] (٥) نموونەی تێدایە و هەر (٥)یان (دە)ن . . . رەفیق حیلمی لەو شیعرەیدا کە لە ژمارە (۲)ی رۆژنامەی « بانگی کوردستان »دا چاپی کردووە[٥٠]

(٤٧) مستەفا پاشا ، جەمعیەتی کوردستان ، «بانگی کوردستان» ، سالی ۱ ، ژ ۱ ، ۲ ی ئابی ۱۹۲۲ ، ل ۱ ـ ۳ .

(٤٨) مستەفا پاشا ، حەسەب حالی دووەم ، «بانگی کوردستان» ، سالی ۱ ، ژ ۳ ، ۲۱ی ئابی ۱۹۲۲ ، ل ۱ ـ ۲ .

(٤٩) مستەفا پاشا ، ئەحوالی ضابطانی کورد ، «بانگی کوردستان» ، سالی ۱ ، ژ ٤ ، ۲۸ی ئابی ۱۹۲۲ ، ل ۱ ـ ۲ .

(٥٠) رەفیق حیلمی ، بۆ کوردان ، «بانگی کوردستان» ، سالی ۱ ، ژ ۲ ، ١٤ی ئابی ۱۹۲۲ ، ل ۳ .

تێکرا (دە)ی بەکارهێناوە . . . عەلی کەمال باپیر لە وتاری « تەربیەی ئەولاد »دا[51] (١٥) جار (دە)ی بەکارهێناوە و (٩) جاریش (ئە) . . . لەمانەو لە گەلێك نووسینی دی « بانگی کوردستان » و چاپەمەنی تری ئەوکاتەدا بە زۆری (دە) دەبینرێ ، بەڵام بەشێکی کەمیشیان پتر (ئە)یان دەنووسی ، وەك : زەکی صائب و م . نووری . . . بەوێنە زەکی صائب لە وتاری « مەسەلەی مەکتەب کردنەوە »دا[52] - (١٥) جار (ئە) ی بەکارهێناوە کەچی تەنیا جارێك (دە) . . . م . نووریش لە وتاری « ماکینەی چاپ »دا[53] - (١٧) کەرەت (ئە)ی نووسیوە و تەنیا دوو جار (دە) . . .

ژمارە (١) و (٢)ی رۆژنامەی « تێگەیشتنی راستی » لە مەسەلەی بەکارهێنانی (دە) و (ئە)دا چاو خەڵەتێنن ، چونکە وا نیشان دەدەن ، کە نووسەرانی ئەو رۆژنامەیە لایەنگیری بەکارهێنانی (ئە) بووبن . بەڵام تەماشاکردنی ژمارەکانی تر ئەو تەمە دەرەوێنێتەوە و ئەوەمان پێ دەسەلمێنێ ، کە د. کەمال مەزهەر ورد لەو کێشەیەی کۆڵیوەتەوە و راست بۆ ئەوە چووە کە « تێگەیشتنی راستی » زۆر جار (دە)ی وەك خۆی هێشتۆتەوە و جارو باریش کردوویە بە (ئە)[54] .

چاوخەڵەتێنی ژمارە (١) و (٢) لەوەدایە کە شێوەی (ئە)یان لە (دە) کەمێك پتر تێدا بەکارهێنراوە . بۆنموونە لە ژمارە (١)دا پازدە (ئە) و چواردە (دە) هەیە ؛ ژمارە (٢) شەش (ئە) و پێنج (دە)ی تێدایە . کەچی لە ژمارە (٣)وە ئەم دیاردەیە نەك هەر بەپێچەوانەوە دەبینین ، بەڵکو تا پتر بەرەو دوا ژمارەکانیشی بروێن نیسبەتی بەکارهێنانی (دە) زیاددەکا و (ئە) بەرەو کەم بوون دەچێ . بەوێنە لە ژمارە (٣)دا پازدە (ئە) و هەژدە (دە) هەیە ؛ ژمارە (٤) چوار (ئە) و پازدە (دە) ی

---

(٥١) عەلی کەمال باپیر ، تەربیەی ئەولاد ، «بانگی کوردستان» ، ساڵی ١ ، ژ ٥ ، ٤ی ئەیلولی ١٩٢٢ ، ل ٢ - ٣ .

(٥٢) زەکی صائب ، مەسەلەی مەکتەب کردنەوە ، «بانگی کوردستان» ، ساڵی ١ ، ژ ٢ ، ١٤ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ١ - ٣ .

(٥٣) م . نووری ، ماکینەی چاپ ، «بانگی کوردستان» ، ساڵی ١ ، ژ ٣ ، ٢١ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ٣ - ٤ .

(٥٤) د. کەمال مەزهەر ، «تێگەیشتنی راستی»و شوێنی لە رۆژنامەنووسی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ١٥٢ - ١٥٣ .

تێدایە ؛ لە ژمارە (١٠)دا چوار (ئە) و نۆزدە (دە) دەبینرێ ؛ شەش (ئە) و چل وحەوت (دە) لە ژمارە (٦٥)دا بەرچاو دەکەوێ[٥٥] .

من وای بۆ دەچم ، مێجەر سۆن (ئە)ی پێ خۆش بووبێ ، بەلام زوو لەوە تێگەیشتبێ کە بۆ زمانی ئەدەبی و نووسین شێوەی (دە) لەبارترە[٥٦] . ئەگەرچی لە ئاخاوتنی ئێستای سلێمانیدا تەنیا (ئە) بەکاردەهێنرێ و (دە) بەتەواوی لەبیرچووەتەوە ، بەلام لەبەرئەوەی گۆرانێکی شێواوە و سەرەرای ئەوەش چونکە نەك هەر لە دیالێکتی ژووروودا ، بەلکو لە زوربەی بەشە دیالێکتەکانی تری خوارووشدا هەر شێوەی (دە) ماوەتەوە ، بۆیە راست وایە لە زمانی ئەدەبی و نووسیندا واز لەو جۆرە تایبەتی یە ناوچەییانە بهێنرێ . شایانی باسە ، کە مامۆستا تۆفیق وەهبیش لە هەمان رادایە و بەو بۆنەیەوە دەڵێ : پێوستە « لەباتی (ئە) ی پیتە قالبی (دە) بەکاربێنین »[٥٧] .

لە شێوەی ئاخاوتنی سلێمانیدا زۆر جار ئەوە بەرگوێ دەکەوێ کە دەنگی (د) کلۆر دەکرێ ، وەك : (منالْ) لەبریتی (مندالْ) ؛ (مەحوو) لەجیاتی (مەحموود) ؛ (کرانی) لەباتی (کراندی) . . . شایانی باسە رۆژنامەی « تێگەیشتنی راستی » پیتی (د)ی ئەوجۆرە وشانەی نووسیوە . یەوێنە بروانە : (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٦ ـ « خاوەند ») ؛ (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ٢٢ ـ « دەیان نالاند ») ؛ (ژ ١ ، ل ١ ، س ٢ ، د ١٦ ـ « دایان مەزراند ») ؛ (ژ ١ ، ل ٣ ، س ٢ ، د ٢ ـ « پەلاماربداتە ») ؛ (ژ ٣ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٦ ـ « نواند ») ؛ (ژ ٢ ، ل ١ ، س ٢ ، د ١ ـ « چند ») ؛ (ژ ٤ ، ل ١ ، س ١ ، د ٧ ـ « تیدا ») ؛ (ژ ٤ ، ل ٢ ، س ٢ ، د ٢ ـ « لە فلسطیندا ، لە عراقدا ») ؛ (ژ ٥ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٩ ـ « دولتاندا ») ؛ (ژ ١٤ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٢ ـ « دامەزراندنی ») . . .

---

(٥٥) ئەو (ئە)یانەش کە لە دوا ژمارەکاندا دەبینرێن ، بەزۆری لە وشەی (ئەڵێ)دان .

(٥٦) مێجەر سۆن لەو وتارانەیدا کە لە رۆژنامەی «پێشکەوتن»دا بلاوی کردوونەتەوە بەدەگمەن شێوەی (ئە)ی بەکارهێناوە . جا ئەمەش بەلگەیەکی پتەوە ، کە ناوبراو شێوەی (دە)ی پەسەند کردبێ .

(٥٧) تۆفیق وەهبی ، ئەسڵێ پیتە قالبی (ئە)ی شێوەی سلێمانی ، «گۆڤاری کۆری زانیاری کورد» ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣١ .

جاروباریش ئەو (د)انەی نەنووسیوە ، بەوێنە بروانە : (ژ ٢ ، ل ١ ، س ١ ، د ٢٠ ـ « لپاشا » ؛ (ژ ٣ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٩ ـ « شتیکا ») . . .

دیاردەی بوونی (دە) بە (ئە) لە سالآنی بیستدا چۆن گەشەی دەکرد و چۆن لە کەسێکەوە بۆ کەسێك جیاواز بوو ، سوانی (د)ش هەر بەوچەشنە دەبینرێ . پێشتر نیشانمان‌دا ، کە زوربەی نووسەرانی ئەو دەمە بەزۆری (دە)یان بەکاردەهێنا . جا گەڕان بە چاپەمەنییەکاندا ئەوە ئاشکرا دەکا ، کە نووسینی (د)ش پتر باوبووە . بۆ ئەوەش کە لەو ڕووەوە جیاوازی لەنێوان نووسەردانـدا هەبـووە ، تەنیا پەنجەڕاکێشان بۆ ئەوە بەسە کە لە هەموو ئەو وتارانەی « تێگەیشتنی ڕاستی » ، کە بەلآمانەوە هی مێجەر سۆنن ، لە چەندین شوێندا وشەی (چەند)ی بە بێ‌سواندنی (د) نووسیوە ، بەلآم ئەو زانا کوردەی لە ژمارە (١٦) و (١٧)دا وتارێکی بلآوکردۆتەوە[٥٨] (چەن)ی بەکارهێناوە .

دیارە مێجەر سۆن لەوەشدا هەر شێوەی لەباری هەڵبژاردووە . با شێوەی سلێمانی بناغەی زمانی ئەدەبیشمان بێت ، بەلآم نە ئەو شێواندنە و نە ئەو تایبەتێتی‌یە ناوچەیی‌یە ڕاست نییە لە نووسین و زمانی نوسیندا شوێن پێ‌یان دیاربێ . مامۆستا تۆفیق وەهبیش لەم بارەیەوە نووسیوێتی : « (د) ی کلۆر دەبێ بەجارێ بکرێتە دەرەوە لە زمانە ئەدەبیەکەمان ؛ وە لەو جێ‌یانەشدا کە (د)ە کلۆرەکان کەوتوون ، یان گۆڕاون بە دەنگێکی تر ، (د)ی پتەو بخرێتەوە کار »[٥٩] .

بەڕاستی سوان و تێچوونی (د) ڕوون‌کردنەوە و لێکۆڵینەوەی تەواوی دەوێ ، چونکە لە زۆر شوێنی‌تری وشەدا دەقرتێ . بەوێنە ئەمرۆ لە هەندێ شوێنی کوردستاندا ، بەتایبەتی لە ناوچەی سلێمانیدا دەنگی (د)ی ژمارەکانی (یازدە ، دوازدە ، سیازدە ، پازدە ، شازدە ، حەڤدە) سواوە و دەترێ (یانزە ، دوانزە ، سیانزە ، پانزە ، شانزە ، حەڤڤە) . لەبەرئەوەی قووت‌دانی ئەم (د)ە بووە بە هۆی قورسی دەربڕینی ئەو وشانە ، بۆیە ئاخێوەر بۆ سووك‌کردنی ئەو نالەباری‌یە ناچار

---

(٥٨) نطق عالیکی اجتماعی گەورەی کوردان بو رؤسای عالی قدر کردان ، «تێگەیشتنی ڕاستی» ، ژ ١٦ ـ ١٧ .

(٥٩) تۆفیق وەهبی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ئەسڵی پیتە قاڵبی (ئە)ی شێوەی سلێمانی ، ل ٣١ .

بووه دەنگی (ن) بیێنێتە ناو (یازە ، دوازە ، سیازە ، پازە ، شازە)ەوە و (ڤ)ی (حەڤە)ش دووبارە بکاتەوە[٦٠] .

ئەسڵی ئەو وشانە کە (یازدە ، دوازدە ، سیازدە ، پازدە ، شازدە ، حەڤدە)ن ، بێگومان چ بۆ نووسین و چ بۆ زمانی ئەدەبی ڕاست وایە پەیڕەوی ئەسڵەکەیان بکرێ . شایانی باسە کۆڕی زانیاری کوردیش لەوڕایەدا بووە ، کە دەبێ « ئەسڵی ئەو ژمارانە لە نووسیندا بپارێزرێت »[٦١] .

سوانی ئەم ژمارانەش ، هەر وەك سوانی (د)ی هەندێ وشەی دی ، کە پێشتر باسمان کردن ، لە ساڵانی بیستدا لە گەڕدا بوو . بەڵگەش ئەوەیە کە لە چاپەمەنییەکانی ئەو سەردەمەدا شێوەی جیاوازی بەکارهێنانیان ـ واتە نەسوان و سوان ـ دەبینرێ . بەوێنە بڕوانە ، « تێگەیشتنی ڕاستی » : (ژ ٢١ ، ل ٤ ، س ١ ، د ٢٩ ـ « یازدە ») ؛ (ژ ١٧ ، ل ٢ ، س ٢ ، د ٥ ـ « دوانزە » )[٦٢] . . . « بانگی کوردستان » : (ژ ٩ ، ل ٥ ، س ١ ، د ١٨ ـ « دوازدە ») ؛ (ژ ٣ ، ل ٦ ، س ٢ ، د ٤ ـ « یانزە ») . . .

لە «تێگەیشتنی ڕاستی »دا سەرنج ڕاگرتن لە ژمارەکان ، ئەو ڕاستییەشمان پێ دەسەلمێنێ کە ئەو (هـ)یەی هەندێ لە نووسەران دەیخەنە نێوان ژمارە و نیشانەی (ەم ، ەمین) ی پلەیانەوە ، شتێکی زیادەیەو لەلاوە هێنراوەتە ناوانەوە . لە گشت شوێنێك و تێکڕای وتارەکانی « تێگەیشتنی ڕاستی »دا تاکە ژمارەیەك چییە (هـ)ی لەگەڵ نەنووسراوە ، بەوێنە بڕوانە : (ژ ٢١ ، ل ١ ، س ٢ ، د ٦ ـ « دومین ») ؛

---

(٦٠) شایانی باسە ، مامۆستا مەسعوود محەمەد بە شێوەیەکی زانستی و بەڵگەی زۆر و ڕاست و لەبار دەربارەی چۆنیەتی نووسینی ژمارەکان دواوە (بڕوانە : مەسعوود محەمەد ، چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی ڕێنووس و ئەلفوبێی کوردی ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد» ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٣٤١-٣٤٤) .

(٦١) کۆڕی زانیاری کورد ، ڕێنووسی کوردی ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣٧٠ .

(٦٢) لە هەندێ شوێندا شێوەی (یانزدم ، دوانزدە . . .)ش ـ واتە مانەوەی (د)ەکە و پەیدابوونی (ن) ـ بەرچاو دەکەوێ . بەوێنە بڕوانە : (ژ ٢١ ، ل ٤ ، س ٣ ، د ١٢ ـ «یانزدە») . . .

(ژ ٢١ ، ل ١ ، س ٢ ، د ١٥ ـ « سیمین ») ؛ (ژ ٢١ ، ل ١ ، س ٢ ، د ٢٠ ـ « چوارمین ») ؛ (ژ ٢٨ ، ل ٣ ، س ٣ ، د ٢٠ ـ « دومین) ؛ (ژ ٢٨ ، ل ٣ ، س ٣ ، د ٢٨ ـ « دوم ») . . .

هەروەها نەبینینی ئەو (هـ)ە لە چاپەمەنییە کوردییەکانی تری ئەو سەردەمەدا ، رای دانانی بە شتێکی زیاد و لە لاوە هێنراو پتەوتر دەکات . بۆنموونە بڕوانە : « رۆژی کوردستان » (ژ ١ ، ل ٢ ، س ١ ، د ٢٧ ـ « بیستەمین ») . . .

لە هەندێ شێوەدا لەو کردارنەدا کەوا لە ڕێژەی کارابزردا دوو (ر) یان دوو (ر) کۆدەبنەوە (د) دەخەنە نێوانیانەوە ، وەك : کررا/ کردرا ؛ گۆررا / گۆردرا . . . بووررا / بووردرا ؛ ژمێررا / ژمێردرا . . . هتد[63] . ئەگەر لەم ڕووەوە سەرنج لە چاپەمەنییەکانی ساڵانی بیست بدەین ، دەبینین ئەو جۆرە وشانە هەروەك ئەمرۆی بەکارهێنانی سلێمانی نووسراون . بەوێنە بڕوانە ، ڕۆژنامەی « تێگەیشتنی ڕاستی » (ژ ٨ ، ل ٢ ، س ١ ، د ٩ ـ « کوررا » ) ؛ (ژ ٢١ ، ل ٤ ، س ٢ ، د ١٢ ـ « پی دەنیرری » ) . . .

ئەمرۆ کە دەوترێ (لەو ، لەوان . . .) ، ئەوە ئەسڵەکەیان (لە ئەو ، لە ئەوان . . .) بووە و (ئە/ە)[64] کەی سەرەتایان تێچووە . لە ئاخاوتن و نووسینی

---

(٦٣) بڕوانە :

أ ـ ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ١٣٥ ـ ١٣٩ .

ب ـ د. عەبدوڵڵا نەقشبەندی ، پاشکۆی (درا) ، «گۆڤاری کۆری زانیاری کورد» ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١٢٦ ـ ١٢٧ .

(٦٤) وەك ئاشکرایە ، لە زمانی کوردیدا دوو بزوێن بەیەکەوە نایەن . جا بەوپێیە لەو نموونانەی سەرەوەدا کاتێ (ە)ی کۆتایی (لە)و (ە)ی سەرەتای (ئەو ، ئەوان) ، کە کەوتوونەتە پاڵ یەك ، یەکێکیان تێچووە و کورت بوونەوە هاتۆتە کایەوە . . .

بێگومان ، خوێنەر کە لە نووسینی وشەکانی (ئەو ، ئەوان)دا دەبینێ لە سەرەتایاندا پیتی هەمزە نووسراوە ، هەقیەتی لەوەی وتوومە سەرسام بێ و بپرسێ : کەی دوو دەنگی (ە)ی کۆتایی (لە)و (ە)ی سەرەتای (ئەو ، ئەوان) کەوتوونەتە پاڵ یەك ، نووسەر چۆن ئەو هەمزە زلەی نەبینیوە ؟ . . .

گلەیی لە خوێنەر ناکرێ بەوچەشنە بیر بکانەوە ، بەڵام جێ داخە کە زۆربەی زمانەوانانی کورد هەر بەوەندەی کە بینیویانە لە ئەلفوبێی کوردیدا وێنە بۆ هەمزە دانراوە ،

ئەمڕۆی کوردیدا لەوانەیە بڵێین خەڵك هەموو ، وشەکان بەیەکەوە دەڵێن و بەیەکەوە دەیان نووسن ـ واتە مەودا ناخەنە نێوان پرپۆزیشنەکە و وشەی دوایەوە .

دیارە ئەم دیاردەیەش وەك[بوونی] (دە) بە (ئە) ، یان سوانی (د) لە ساڵانی بیستدا لە دەوری گۆڕاندا بووە ، چونکە لە چاپەمەنییەکانی ئەو دەمەدا هەردوو بارەکە بەرچاودەکەوێ ـ واتە بەجیاش و بەسەر یەکیشەوە . بۆنموونە بڕوانە «تێگەیشتنی ڕاستی» : (ژ ٧ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٣ ـ «لو») ؛ (ژە ، ل ١ ، س ١ ، د ١٥ ـ «لە») ؛ (ژ ٣ ، ل ٢ ، د ١٠ ـ «لەوان») . . . (ژ ٤ ، ل ١ ، س ٢ ، د ٣ ـ «لە اوان») ؛ (ژ ٧ ، ل ١ ، س ٢ ، د ١٣ ـ «لە او») . . .

وەك ئاشکرایە لە پێکهاتنی کرداری داخوازی و ئیلزامیدا نیشانەی (ب) هاریکارە . هەندێ جار ئەو (ب)یە قووت‌دەدرێ و زۆربەی نووسەرانیش لەسەر بناغەی ئەو بەدەمدا هاتنە دەنووسن : (ڕاکە ، هەڵگرە ، وەرگرە . . .)بەڵێ خەڵك ئازادن بەپێی ڕاهاتنی زمان و شێوەی خۆیان نووسراو بخوێننەوە ، بەڵام ئەمە نابێ کار لە شێوەی نووسینەکە بکات . جا ڕاست ئەوەیە لە نووسیندا بنچینە و قاڵبی وشە بپارێزرێ . بەوپێیە پێویستە بنووسرێ : (ڕابکە ، هەڵبگرە ، وەربگرە . . .) . . . گەڕان و پشکنین بۆمان ڕوون‌دەکەنەوە ، کە لە سەردەمی « تێگەیشتنی ڕاستی »دا هێشتا ئەو دیاردەیە سەری هەڵنەدابوو . بەڵگەش ئەوەیە کە لە نووسینەکانی مێجەر سۆن و نووسەرانی تری[٦٥] ئەو ڕۆژنامەیە و چاپەمەنی‌یەکانی

---

= ئیتر بێ‌ڵێك‌دانەوە وەك فۆنێمێکی کۆنسۆنانت مامەڵەیەیان لەگەڵ کردووە . . .
بەڵێ لە حاڵەتی (لەو ، لەوان)دا (ە) نەماوە ، نەك (ئە) ، بەوپێیە پێویستە بزانین کە (دە)ی موزارەعەتیش نەبووە بە (ئە) ، بەڵکو (د) تێچووە . . .
هەرچەندە دەمێکە گەیشتوومەتە ئەو ڕایە ، بەڵام چ لە نووسینەکانی پێشوومدا و چ لەم نووسینەمدا ، کاتێ لە کێشەی (دە)ی موزارەعەت دواوم ، نەدەبوو لەسەر شێوەی ئەو هەڵە باوە باسەکەم دابڕێژم . هیوام وایە لە نووسینی لەمەوپاشمدا شێوازێکی باش بۆ دەربڕینی ئەو باسە بدۆزمەوە .

(٦٥) وەك پێشتر نیشانم‌دا ، لە ڕووی ڕێنووسەوە وتاری «نطق عالیکی اجتماعی کورەی کوردان بو رؤسای عالی قدر کردان» لەگەڵ نووسینەکانی مێجەر سۆن و شوکریلفەزلی‌دا جیاوازی زۆرە ، بەڵام ئەوەی شایانی باس بێ ، ئەوەیە کە لە مەسەلەی نووسینی (ب)دا یەك‌دەگرنەوە . بێ‌گومان ئەمەش بەڵگەیەکی چاکە بۆ بێ‌سەلماندنی ئەوەی کە لە سەردەمی «تێگەیشتنی ڕاستی»دا هێشتا دیاردەی تێچوونی (ب) نەهاتبووە کایەوە .

دی‌دا هه‌میشه (ب) نووسراوه . بەوێنە بڕوانە ، « تێگەیشتنی ڕاستی » : (ژ ۳ ، ل ۱ ، س ۱ ، د ٤ ـ « هەمولەکەل یکتری ری‌بکون ») ؛ (ژ ۸ ، ل ۱ ، س ۲ ، د ۷ ـ «خوتان . . . رزکار بکن » ؛ (ژ ۱۳ ، ل ۱ ، س ۲ ، د ۲ ـ «اوی تماشای تاریخ بکا » )؛ (ژ ١٦ ، ل ۱ ، س ۱ ، د ۱۱ ـ « خوی . . . رزکار بکا ») . . . « ڕۆژی کوردستان » : (ژ ۳ ، ل ۱ ، س ۱ ، د ۸ ـ « بیان بکا ») ؛ (ژ ۳ ، ل ۱ ، س ۲ ، د ۱۷ ـ « . . . اداره بکرین ») . . . « بانگی کوردستان » : (ژ ۱ ، ل ۱ ، س ۲ ، د ۳ ، ـ « جمعیتیکی کورد تشکل بکا » ) ؛ ( ژ ۱ ، ل ۳ س ۱ ، د ۱۸ ـ « دل کویی لی بکری ») . . .

## ۲ ـ تواندنەوە Assimilation

وەك ئاشکرایە ، لە زمانی کوردیدا دەنگی کۆنسۆنانتی ئاوازەدار و کپ هەن . جا لە زۆر زماندا ، هەروەها لە زمانی کوردیدا ، ئەگەر لەدوای دەنگێکی ئاوازەدارەوە دەنگێکی کپ بێت ، ئەوسا دەنگە کپەکە کاردەکاتە سەر دەنگە ئاوازەدارەکەی بەردەمی و وەکو خۆی دەیکاتە دەنگێکی کپ ـ واتە دەیهێنێتە ڕیزی ئەو پۆلە دەنگانەی کە خۆی یەکێکە لێیان . جا بەشێوەیەکی کەم و سست ، ئەم ڕووداوە لە فۆنەتیکی کوردیدا دەبینرێ ، بەتایبەتی ئەگەر لەپاش دەنگی (ز)و(ژ)وە دەنگی (ت) هەبێت ، وەك :

أ ـ زۆر جار (ز) لە بەردەم هەندێ دەنگی کپدا ، وەك (س) تەلەفوز دەکرێت ، بەوێنە :

گەزین ـ گەست ، گەستی

پارێز ـ پاراستن ، پاراستی

ب ـ گەلێك جار (ژ) کە دەکەوێتە پێش هەندێ دەنگی کپەوە ، وەك (ش) بەدەمدا دێت ، بەوێنە :

ڕژان ـ ڕشتن ، ڕشتی

کوژرا ـ کوشتن ، کوشتی

نێژرا ـ ناشتن ، ناشتی

هەژدە ـ هەشت ، هەشتا

بەپێچەوانەشەوە لە زمانی کوردیدا ، ئەگەر لەدوای دەنگێکی کپەوە دەنگێکی ئاوازەدار بێت ، ئەوسا دەنگە ئاوازەدارەکە کار دەکاتە سەر دەنگە کپەکەی بەردەمی و وەکو خۆی دەیکاتە دەنگێکی ئاوازەدار ـ واتە دەیهێنێتە ریزی ئەو پۆلە دەنگانەی کە خۆی یەکێکە لێیان . جا بە شێوەیەکی کەم و سست ئەم رووداوە لە فۆنەتیکی کوردیدا دەبینرێ ، بەتایبەتی ئەگەر لەپاش دەنگی (س)ەوە دەنگی (گ ، ب . . .) هەبێت . بەوێنە هەندێ جار (س) کە دەکەوێتە پێش دەنگی ئاوازەدارەوە وەك (ز) تەلەفوز دەکرێت ، وەك :

دەزگا

وشەی «دەزگا» لە «دەست + گا» پێکهاتووە . لە سەرێکەوە (ت) فووت دراوە ، واتە لەمەدا بەر یاسای کورت کردنەوە کەوتووە . لە سەرێکی دیکەوە (گ) کە کۆنسۆنانتی ئاوازەدارە لەگەڵ دەنگی (ز)دا کە ئەمیش هەر کۆنسۆنانتی ئاوازەدارە پتر دەگونجێ ، وەك لەگەڵ (س)دا کە کۆنسۆنانتی کپە . لەم رووەوە یاسای تواندنەوە کاری کردووە .

دەزبەر

لە هەندێ ناوچە بە «دەستەبەرە» دەڵێن «دەزبەر» . لە حاڵەتی یەکەمدا (س) کە کەوتۆتە پێش (ت)ەوە هیچ گۆرانێك نەبووە ، بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا کە کورت کردنەوە رووی داوە ـ واتە (تە) لابراوە ، (س)ی کۆنسۆنانتی کپ کەوتۆتە بەردەم (ب)ی کۆنسۆنانتی ئاوازەدارەوە و یاسای تواندنەوە کاری کردووە .

. . . . هتد .

لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە گۆرێ : ئایا ئەو چەشنە وشانە چۆن بەدەمدا دێن وا بنووسرێن ؟ یان بەجۆرێك بنووسرێن کە بناغە و شێوەی پێکهاتنیان دیاربن ؟ . . . وەك ئاشکرایە ، لە نووسینی ئەو وشانەدا هەر لە زووەوە رێگەی شێوەی تەلەفوز گیراوە . هەرچەندە رێگەی پاراستنی ئەسڵ کەمێ گرانی و کێشەی تێدایە ، بەڵام هەمووکەس ناتوانێ بە ئاسانی لەوە تێبگا کە لە وشەی (گەست ، گەستی . . .)دا (گەز) رەگە بێ ، یاخود (کوژ) رەگی وشەی (کوشتن ، کوشتی . . .) بێ ؛ یان (دەزگا) لە (دەست) و (گا) پێکهاتبێ . . . جا بۆیە پاراستنی قاڵب بە باشتر دەزانم . ئەو گرانی و کێشەیەش کە رەچاوکردنی پاراستنی ئەسڵ و بناغە سازی دەکا ، زانینی دەستووری تواندنەوە دەیرەوێنێتەوە .

٣ - کارتێکردن .

دەنگی (گ ، ك) کە دەکەونە پێش دەنگی (ێ ، ی ، وێ ، وی) شێوەی دەربڕینیان دەگۆڕێت و تارادەیەك لە تەلەفوزی دەنگی (چ ، ج) نێزیك دەبنەوە ، وەك :

کێرد ، کێشە ، کێم ، گێلاس ، گێرانەوە ، کیسە ، گیسك ، کوێ ، گوێ ، هەنگوین . . .

ئەوانەی وا بە پێویست دەزانن کە بۆ ئەو جۆرە (ك) و (گ) انە نیگاری تایبەتی دابرێژرێ ، زۆر بەهەڵەدا چوون[٦٦] ، چونکە وەنەبێ ئەو (ك) و (گ)انە کە بەوچەشنە بەدەمدا دێن فۆنێمیکی تر بن ، بەڵکو هەمان فۆنێمن کە لە حاڵەتی ئاساییدا دەبینرێن . لێرەدا تەنیا کارتێکردنی (ێ ، ی ، وێ ، وی) وا شێوەی تەلەفوزی گۆڕیون و ئەمە نابێتە هۆی واتاگۆڕی .

٤ - شێواندن و گۆڕینی دەنگ .

زۆر جار کە (د) دەکەوێتە دوای (ن) ، وەك (گ) دەردەبڕرێت (ئەمەش بەتایبەتی خاسیەتی شێوەی سلێمانییە) ، وەك : توند ـ تونگ ، مەند ـ مەنگ ، دەربەند ـ دەربەنگ . . .

ئەمەش هەروەك ئەو شێواندنەیە کە لە ناوچەی کۆیە و خۆشناوەتی و دزەییاتی و گەردییایەتی (ڵ) دەکەن بە (ر) ، یان شاری هەولێر دەیکا بە (ل) . . . بێگومان ڕێگە لە کەس ناگیرێ بەپێی ئارەزووی شێوەی خۆی ئەو دەنگانە بگۆڕێ ، بەڵام هیچ یەکێك لەم چەشنە شێواندنە نابێ لە نووسین و زمانی ئەدەبیدا ڕەنگ بداتەوە و ڕاست وایە شێوەی ڕەسەنیان بنووسرێ .

## وشەی سادە لەگەڵ مۆرفێمە ئەفیکسییەکان

١ - پێشگر وپاشگر .

هەرچەندە ڕەگی وشە مانای سەرەکی وشە هەڵدەگرێ ، بەڵام هیچ زمانێك ئەو توانستەی نییە تەنیا بە ڕەگ و وشەی سادە مەبەست دەرببڕێ .

---

(٦٦) بەوێنە بڕوانە : طاهیر صادق ، ڕێنووس ـ چۆنیەتی نووسینی کوردی ، کەرکوك ، ١٩٦٩ ، ل ١٠ ، ٥٦ ، ٥٨ .

ڕەگی وشە و وشەی سادە بە یاریدەی پێشگر و پاشگر دەتوانن سەدان وشە دروستبکەن و سەدان مانا و مەبەست دەربڕن . بەوێنە پاشگری (ێنە) کە دەچێتە سەر وشەی وەك «نیسك ، ماش . . .» ، دوو وشەی نوێ دادەڕێژرێ : «نیسکێنە ، ماشێنە . . .» ؛ پاشگری (ین) کە بە وشەی سادەی وەك «سەر ، نەرم . . .»ەوە دەلکێ ، ئەو دەمە وشەی داڕێژراوی «سەرین ، نەرمین . . .» سازدەبێ ؛ پاشگری (ار) کە بە ڕەگی کرداری وەك «وتن ، کوشتن . . .»ەوە دەنووسێ ، وشەی «وتار ، کوشتار . . .» پێكدێنێ . پێشگری (ڕا) کە دەچێتە سەر کرداری سادەی وەك «هاتن ، بوون . . .» دەیانکاتە «ڕاهاتن ، ڕابوون . . .» کە کرداری داڕێژراون ؛ پێشگری (بێ) کە بە ناوی سادەی وەك «هۆش ، هێز . . .»ەوە دەلکێ ، دەیانکاتە ئاوەڵناوی داڕێژراوی «بێهۆش ، بێهێز . . .» ؛ پێشگری (پێ) کە بە ڕەگی کرداری سادەی وەك «ویستن ، خەفتن . . .»ەوە دەنووسێ ، ناوی داڕێژراوی «پێویست ، پێخەف . .»یان لێ سازدەکات . . . هتد .

بەم چەشنە ، ئەو پێشگر و پاشگرانەی دەوری وشەڕۆنان دەبینن ، جۆرێکی تایبەتین لە مۆرفێم و لە زانستی زماندا بە (مۆرفێمی وشەداڕێژ ـ Derivational morpheme ) ناسراون .

پێشگر و پاشگر لە زماندا بەتەنیا بایەخیان نییە و بە شێوەیەکی سەربەخۆ کارناکەن ، بەڵکو کە دەچنە سەر وشە دەتوانن دەوری ڕۆنانی وشە ببینن و واتا ببەخشن . بەویێیە ڕاست نییە بەجیا بنووسرێن . بەڵام ئەمە نابێ هەندێ تایبەتێتی زمانی کوردیمان لەبیربەرێتەوە :

لە وشەی ناسادەی زمانی کوردیدا پاشگر هەمیشە لەدوای ڕەگی وشەوە دێت و ئنجا بەدوای ئەودا نیشانە ـ واتە هەردەم پاشگر پێش نیشانە دەکەوێ . بەوێنە : وشەی «فیلبازتر» کە لە وشەی «فیل» و پاشگری «باز» و نیشانەی «تر» پێکهاتووە ؛ وشەی «ئاسنگەران» کە لە وشەی «ئاسن»و پاشگری «گەر» و نیشانەی (ان) پەیدابووە ؛ وشەی «مۆمدانەکە» کە لە وشەی «مۆم» و پاشگری «دان» و نیشانەی «ەکە» دروستبووە . . . هتد . لەم جۆرە حاڵەتانەدا پاشگر و نیشانەکە دەبێ بلکێنرێن بە کۆتایی وشەوە ، چونکە دەبنە بەشێکی پێکهێنی تەواوی واتای وشەکە .

هەرچی پێشگرە لە ڕووی لکانەوە جیاوازی لەگەڵ پاشگردا هەیە و ئەوەش بووەتە هۆی دروست‌کردنی کێشەی نووسینی . وەك وتمان پاشگر هەمیشە بە کۆتایی ڕەگی وشەوە دەنووسێ و نووسینی گیروگرفت پەیداناکات . بەڵام پێشگر هەموو کات بە پێشی ڕەگی وشەوە نالکێت و زۆر جار لەنێوان پێشگر و ڕەگی وشەدا شتی دی پەیدا دەبێ . بەوێنە لە کرداری «هەڵدەگرم»دا ، (دە)ی نیشانەی موزارەعەت ؛ لە کرداری «ڕام کرد»دا ، جێ ناوی لکاوی کەسی یەکەمی تاك ؛ لە کرداری «وەربگرە»دا ، (ب)ی نیشانەی فەرمان ؛ لە کرداری «هەڵت‌نەدەگرت»دا ، جێ ناوی لکاوی کەسی دووەمی تاك و ئامرازی (نە)ی نەفی و (دە)ی نیشانەی موزارەعەت لەنێوانِ پێشگر و بناغەی وشەدا هاتوون .

هەرچەندە لە لکاندنی پێشگر و پاشگردا ئەو جیاوازییە هەیە ، بەڵام بەلای منەوە ئەمە نابێ ببێتە هۆی ئەوەی لە هەندێ باردا پێشگر بەتەنیا بنووسرێ ، چونکە وەك پێشتر پەنجەم بۆ ڕاکێشاوە ، پێشگر و پاشگر بە شێوەی سەربەخۆ کارناکەن و واتا نابەخشن . سەرەڕای ئەوەش بەجیا نووسین جیاوازی دەخاتە نێوان نووسینی لەگەڵ پاشگردا . . . کۆڕی زانیاری کورد و مامۆستا مەسعوود محەمەد لەوڕایەدان کە لە نموونەی وەك : «هەڵدەگرێ ، هەڵبگرە . . .»دا پێشگرەکە بەجیا بنووسرێ[٦٧] .

وەك ئاشکرایە (هەڵ) بەتەنیا بەکارنایەت و سەربەخۆ واتا ناگەیەنێ . جگە لەوەش ئەگەر پێشگری (هەڵ) لە کردارەکە بکرێتەوە ، ئەوەی دەمێنێتەوە ئەو واتایە نادا کە لەگەڵ (هەڵ)دا هەیەتی[٦٨] . بۆنموونە واتای «هەڵدەگرێ» لەگەڵ «دەگرێ»دا ؛ یان «هەڵبگرە» لەگەڵ «بگرە»دا . . . زۆر جیاوازە . هەروەها ئەگەر

---

(٦٧) بڕوانە :
أ - کۆڕی زانیاری کورد ، سەرچاوەی ناوبراو ، ڕێنووسی کوردی ، ل ٣٧٣ .
ب - مەسعوود محەمەد ، سەرچاوەی ناوبراو ، ڕێنووسی کوڕ ، ل ٢٦٢ - ٢٦٣ .

(٦٨) سەرەڕای ئەوە ، کۆڕ وشەی «هەڵدەگرێ ، هەڵبگرە . . .»ی بە کرداری لێکدراو داناوە (بڕوانە : کۆڕی زانیاری کورد ، سەرچاوەی ناوبراو ، ڕێنووسی کوردی ، ل ٣٧٣) . وەك ئاشکرایە ، ئەوانە کرداری دارێژراون ، چونکە تەنیا یەك وشەی واتاداریان تێدایە . کاتێك دەتوانرێ پێیان بوترێ لێکدراو ، کە بەلایەنی کەمەوە لە پێکهاتنیاندا دوو وشەی واتادار بەشداریان کردبێ .

«هەڵدەگرێ» لەگەڵ «خواردنەوەکە»دا بەراوردبکەین ، لە سەرەتادا ئەوە دێتە پێش چاو کە جیاوازی لە کەرەستەی پێکهاتنیاندا هەبێ ، چونکە دەبینین یەکەمیان لە (پێشگر + نیشانە + وشەی واتادار) سازبووە و دووەمیان لە (وشەی واتادار + پاشگر + نیشانە) . بەڵام ئەگەر لەڕووی زانستی زمانەوە بۆ ئەم مەسەلەیە بچین ، ئەوە دەبینین یەك جۆر مۆرفێم هەردووکیانی پێکهێناوە . لە هەر یەکێکیاندا (مۆرفێمی ڕیشەیی) و (مۆرفێمی وشەدارێژ) و (مۆرفێمی وشەگۆڕ)[69] هەیە[70] . جا وێکچوونی کەرەستەی ڕۆنانیان بەڵگەیەکی زانستییە بۆ یەکێتی نووسینیان .

بۆ هەندێ حاڵەتی ئاڵۆزی وەك «پێیان هەڵنەدەگرتم» یش مامۆستا مەسعوود محەمەد لەو ڕایەدایە کە لە نووسیندا بە سێ بەش بنووسرێ ـ واتە بنووسرێ «پێیان هەڵ نەدەگرتم»[71] ، بێ گومان مامۆستا مەسعوود لە ڕێگەی لێکدانەوەیەکی زۆرەوە گەیشتۆتە ئەو ئەنجامە ، بەڵام بەلای منەوە بێواتایی و سەربەخۆ کارنەکردنی (پێیان) و (هەڵ) مەودای بەجیا نووسینیان تەسك دەکاتەوە . سەرەڕای ئەوە ، خۆ ئەگەر ئەمە لەگەڵ حاڵەتێکی ئاڵۆزی وەك «شکاندیانمەوە ، کوژاندنەوەکەیانم . . .» دا بەراورد بکەین ، ئەوە چۆن لە «پێیان هەڵنەدەگرتم»دا کارا و بەرکار و وشەی واتادار و ئافیکس هەن ، لەمانیشدا هەر هەن ، کەچی کەس بیر لەوە ناکاتەوە ئەمان پارچە پارچە بکات .

٢ ـ نیشانە .

لە سەرەوە لە پێشگر و پاشگر دواین و نیشانماندا کە چۆن لەکاتێکدا دەچنە سەر ڕەگێك یاخود وشەیەکی سادە وشەیەکی نوێی دارێژراو دێننە کایەوە . . . بەڵام پێویستە ئەوەش لەیادنەکەین کە وشەکانی زمان لەناو خۆیاندا پێوەندی هەمیشەیی یان هەیە . ئەو وشانەی فرێز و ڕستە پێك دەهێنن پێوەندی ئاشکرا و دیاری کراویان لەگەڵ یەکتردا هەیە . بۆ دەربڕینی هەر مەبەستێك ، وشەکان

---

(٦٩) بۆ زانینی زیاتر لەبارەی (جۆرەکانی مۆرفێم)ەوە ، بڕوانە : د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٣٠ ـ ٣٤ .

(٧٠) جیاوازی تەنیا لە چۆنیەتی ڕیزبوونی مۆرفێمەکاندا هەیە .

(٧١) مەسعوود محەمەد ، سەرچاوەی ناوبراو ، ڕێنووسی کۆڕ ، ل ٢٦٣ ـ ٢٦٤ .

بەگوێرەی دەستووری ئەو زمانە دەچنە پاڵ یەك و فۆرمەی پێویستی خۆیان وەردەگرن و رستە پێكدەهێنن و مەبەستی دیاریکراو دەگەیەنن .

وەك :

* کورە هات بۆ لام
سەردار کوڕی خاڵە شاسوارە
کورەکەی خاڵە شاسوار ناوی سەردارە
لەنێو کورانی خاڵە شاسواردا سەردار دیارە
سەردار کوڕێکی چاکە
سەردار لە سیروانی برای ئازاترە
سەردار ئازاترین کوڕی خاڵە شاسوارە
. . . هتد .
* سەردار دەچوو بۆ قوتابخانە
سەردار بچۆ بۆ قوتابخانە
سەردار ناچێ بۆ قوتابخانە
سەردار نەچوو بۆ قوتابخانە
سەردار مەچۆ بۆ قوتابخانە
. . . . هتد .

بەو نموونانەی سەرەوەدا ، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە یەکێك لە هۆ کاریگەرەکانی ڕێکخستنی وشە ، نیشانەیە . نیشانە دەچێتە سەر وشە و حاڵەتی جیاوازی ڕێزمانی پێكدێنێ . نیشانە کە لە زانستی زماندا مۆرفێمی وشەگۆری پێ دەوترێ ، وەك پێشگر و پاشگر ـ واتە مۆرفێمی وشەدارێژ ـ بە سەرەتا و کۆتایی وشەوە دەلکێ ، بەلام دەوری دارشتن نابینێ . لە بەشی یەکەمی ئەو نموونانەی سەرەوەدا ، نیشانەی (ە ، ی ، ە کە ـ ی ، ان ـ ی ، ێك ـ ی ، تر ، ترین . . .) بە کۆتایی وشەی «کوڕ» یان «ئازا»وە لکاون و حاڵەتی جیاوازی ڕێزمانییان دەربڕیوە . لە وشەکانی بەشی دووەمیشدا (دە ، بـ ، نا ، نە ، مە . . .) کە لە سەرەتاوە هاتوون هەمان ئەرکیان بەجێ هێناوە .

بەم چەشنە بۆمان روون بووەوە کە لە زمانی کوردیدا دوو جۆر مۆرفێمی وشەگۆڕ هەیە و پێیان دەوترێ (نیشانە) . ئەو نیشانانەی بە کۆتایی وشەوە دەلکێن بە (Inflexion) ناسراون . هەرچی جۆری دووەمی نیشانەیە کە بە سەرەتای وشەوە دەلکێ و لە زمانی کوردیدا باوە ، لە زانستی زماندا (Augment)ی پێ دەوترێ .

ئەو دوو جۆرە نیشانەیەی زمانی کوردی لەبەرئەوەی بوونی سەربەخۆیان نییە و دەوری هەرە گرنگیشیان دەربڕینی مانای جۆربەجۆری ڕێزمانی یە ، بۆیە وەك دەستوورێکی گشتی ڕاست وایە بە وشەوە بلکێنرێن . . . شایانی باسە زوربەی زۆری نووسەرانی کورد نیشانەکان لە وشە دادەبڕن .

## وشەی لێکدراو

وشەی لێکدراو ئەو وشەیەیە کە بەلای کەمەوە دوو وشەی واتاداری تێدابێ .

لە زمانی کوردیدا وشەی لێکدراو لە دوو ڕێگەوە پەیدا دەبێ :

١ - بێ یاریدە . وەك :

گولاو ، شاهەنگ ، سەرگەرم ، دەستدرێژ ، ملنان ، دەستبرین . . .

٢ - بە یاریدەی یەکێك لەو ئینتەرفیکسانە :

أ - (ە) :

بەردەنوێژ ، مزرەسێو ، بووکەشووشە ، گوڵەباخ . . .

ب - (و) :

لەرزوتا ، هێلکەوڕۆن . . .

جـ - (ەو) :

بانەوبان ، شارەوشار ، ماڵەوماڵ . . .

د - (او) :

ڕەنگاورەنگ ، دەماودەم ، چەماوچەم . . .

هـ - (ان) :

بەرانبەر ، سەرانسەر . . .

ی - (بە) :

چاوبەکل ، گوڵبەدەم ، جێ بەجێ . . .

دەبینین هەر یەکێك لەو وشە لێکدراوانە کە لە دوو وشە یان زیاتر ، بێ یاریدە یان بە یاریدەی ئینتەرفیکس پێکهاتبن ، لەئەنجامدا بوونەتە وشەیەکی لێکدراو و واتایەکی نوێیان هێناوەتە کایەوە . بەوێنە «هێلکە» و «رۆن» دوو وشەی سەربەخۆن و هەریەکە خاوەنی واتای خۆیەتی ، بەلام کاتێ بە یاریدەی (و)ی پێوەندی ئەو دوو وشەیە دەدرێتە دەم یەك ، ئەوە وشەیەکی نوێ ـ «هێلکەورۆن» کە ناوی خواردنێکە پەیدا دەبێ . یاخود وشەی «گولاو» کە ناوە بۆ ئەو بۆنەی لە «گول» دروستدەکرێ ، لەئانجامی لێکدانی دوو وشەی «گول» و «ئاو» سازبووە . . . جا ئەگەر چی ئەو جۆرە وشانە لە رۆنانیاندا چەند مۆرفیمێك هاریکاری کردووە ، بەلام لەبەر ئەوەی بوونەتە یەك وشە ، دەبێ بەسەریەکەوە بنووسرێن . . . بەلام ئەمە نابێ ئەو حالەتانەمان لەبیربباتەوە کە هەندێ جار ئەو ئینتەرفیکسانە بەتایبەتی (و) وەك ئینتەرفیکس کارناکەن ، بەلکو وەك ئامراز خۆیان دەنوێنن . بۆنموونە : «کور و کچ ، ژن و پیاو ، چاو و لووت . . .» . ئەو جووتە وشانە کە بەهۆی (و)ی پێوەندییەوە دەکەونە شوێنی یەکتر دەبێ بەجیا بنووسرێن[72] .

هەندێ جار لە نووسینی کوردیدا ئەوە دێتە پێش چاو کە وشەی لێکدراوی وەك : «لەرزوتا ، هێلکەورۆن ، رەنگاورەنگ ، گولبەدەم . . .» بەجیا نووسراون ، کەچی بەپێچەوانەوە فریزی وەك : «نان و ماست ، پلاو و بامێ . . .» بەسەریەکەوە . بێگومان ئەمە هەلەیەکی عەفەوییە .

لەبەرئەوەی پێکهاتنی ناو و ئاوەلناو و ئاوەلکرداری لێکدراو کێشەی ئەوتۆی نییە ، بۆیە لە نووسیندا گیروگرفتی زۆری نییە ، بەلام کردار کە هەندێ ئالوزی لە رۆنانیدا هەیە ، گەلێ قۆرتی هێناوەتە نووسینەوە . بەوێنە زووربەی نووسەران کاتێ کرداری (کردن) و (بوون) و (دان) و (نان) و (بردن) و (گرتن) و (هێشتن) و (خواردن) و (کەوتن) و (هاتن) . . . کە لەگەل ناو یان ئاوەلناودا دێن ، سەربەخۆ دەیان نووسن ، بەلام : «تۆبەکردن ، گەرمکردن ، تێربوون ، گەرمابوون ، راونان ، بانگهێشتن ، سەرکەوتن . . .» ، کە بوونە کردارێکی لێکداراو و واتایەکی نوێیان هێنابێتە کایەوە ، ئیتر بۆ دەبێ بە جیا بنووسرێن ؟ ئایا وشەی

---

(۷۲) شایانی باسە ، کۆڕ پەنجەی بۆ ئەو تایبەتی‌یە راکێشاوە (بڕوانە : کۆڕی زانیاری کورد ، سەرچاوەی ناوبراو ، رێنووسی کوردی ، ل ۳۷٦) .

«سەرکەوتن» ئەگەر جیا بکرێتەوە ، پارچەکانی بە جیا و ئاشکرا ئەو مانایە دەدەن کە لە ئەنجامی لێکدانەکەدا دەبینرێ ؟

وا رێك دەکەوێ لە نێوان ناو یان ئاوەڵناو و کردارەکەدا پێشگر پەیدا دەبێ ، وەك : «سەرهەڵدان ، سوورهەڵگەران . . .» . یاخود کرداری «کردن» و ئەوانی دی کە دەچنە سەر ناو و ئاوەڵناوی دارێژراو و لێکدراو ، وەك «رێگاگرتن ، بەهێزبوون . . . ماستاوکردن ، سەرخۆش بوون . . .» . لەم حاڵەتانەشدا لەبەرئەوەی دەبنە وشەیەك ، ئەوە پێویستە ـ بەسەریەکەوە بنووسرێن . . . بەڵام کە دەوترێ «رێگام گرت ، ماستاوم کرد ، سەرم هەڵبری . . .» ئەوە دەبنە وشەی سەربەخۆ و لێرەدا دەبێ بەجیا بنووسرێن .

## ناراستی لکاندنی هەندێ وشە بە پێش یان بە پاش وشەی دییەوە

**١ ـ ئاوەڵناوی (تر) .**

لە زمانی کوردیدا دوو مۆرفێمی هاوبێژی (تر) هەیە . یەکێکیان ئاوەڵناوی (تر)ە ، وەك کە دەوترێ «کچی تر / کچێکی تر / کچەکەی تر . . . کتێبی تر / کتێبێکی تر / کتێبەکەی تر . . .» . ئەوی دییان نیشانەی بەراوردی (تر)ە ، وەك : «باشتر ، جوانتر ، ئازاتر . . .» .

لە نووسینی کوردیدا زۆر جار ئەوە دێتە بەرچاو کە هەردوو مۆرفێمی (تر) بە کۆتایی وشەوە دەلکێنرێ . جا ئەو دوو مۆرفێمە کە یەکەمیان بەشە ئاخاوتنی سەربەخۆیە و دووەمیان نیشانەیە ، راست نییە وەك یەك تەماشابکرێن و بنووسرێن . (تر)ی ئاوەڵناو دەبێ سەربەخۆ بنووسرێ و (تر)ی نیشانە پێویستە بە وشەی پێش خۆیەوە بلکێنرێ ، چونکە وەك پێشتر رووغمان کردەوە بەشەکانی ئاخاوتن وشەی تەواو بن یا ناتەواو دەبێ بەجیا بنووسرێن ، بەڵام نیشانە و پێشگر و پاشگر کە بوونی سەربەخۆیان نییە پێویستە بە وشەوە بلکێنرێن .

لێرەدا ئەوەش دێنینەوە یاد ، کە لە زمانی کوردیدا وشەکانی «دیکە ، دی ،

کەءش هاوواتای ئاوەڵناوی (تر)ن و بێگومان ئەمانیش هەر دەبێ وەك ئەو سەربەخۆ بنووسرێن[٧٣] .

٢ - (و)ی پێوەندی .

بەشێکی زۆری وشەکانی زمانی کوردی ـ وەکو هەموو زمانەکانی ئەم سەرزەمینە ـ ئەو وشانەن کە سەربەخۆ و ڕاستەوخۆ مانای دیاردەیەکی مەوزووعی واقیعی جۆراوجۆر دەبەخشن و دەتوانن وەك ئەندامێکی ڕستە خۆیان بنوێنن و بەم وشانەش دەڵێن وشەی تەواو (الكلمة التامة ـ Autosemantic word) . شەش بەشە ئاخاوتنی کوردی (١ ـ ناو ؛ ٢ ـ ئاوەڵناو ؛ ٣ ـ جێناو ، ٤ ـ ژمارە ، ٥ ـ کردار / چاوگ ؛ ٦ ـ ئاوەڵکردار) بەر وشەی تەواو دەکەون .

هەروەها پێویستە ئەوەش لەبیرنەکەین کە هەندێ پۆلە وشە هەن ، ڕاستەوخۆ پێوەندیان بە دیاردەی واقیعی یەوە نییە و سەربەخۆ ناتوانن وەك ئەندامێکی ڕستە خۆیان بنوێنن ، بەڵکو دەوریان یاریدەدانی وشە تەواوەکانی بەشەکانی ئاخاوتنە لە بەجێ هێنانی ئەرکەکانیاندا ، بەتایبەتی لە دەربرینی واتایاندا و پێکەوە بەستنیان لە ڕستەدا . لە زانستی زماندا بەمچەشنە وشانە دەڵێن وشەی ناتەواو (الكلمة الناقصة ـ Syntactic word) . چوار بەشەکەی دیکەی ئاخاوتن (١ ـ ئامرازی پێوەندی ؛ ٢ ـ پرپۆزیشن ؛ ٣ ـ ئامرازی بانگهێشتن و سەرسوڕمان ؛ ٤ ـ پارتیکل) بەر گرووپی وشەی ناتەواو دەکەون .

شەش جۆر وشەی تەواو و چوار جۆر وشەی ناتەواو زمانی کوردییان پێکهێناوە . هەر بەشێك لە بەشەکانی ئاخاوتنی کوردی لە ڕیزی وشەی تەواو بێت یان ناتەواو بوونی سەربەخۆی خۆی هەیە و دەوری دیار و ئاشکرایە . جا ئەو دە بەشە ئاخاوتنەی زمانی کوردی پێك دەهێنن پێویستە لە نووسیندا بە جیا بنووسرێن .

(و) ی پێوەندی وشەیەکە لە بەشە ئاخاوتنی (ئامرازی پێوەندی) . ئامرازی پێوەندیش بەشێکە لە دە بەشە ئاخاوتنی کوردی ، ئەم وشەیە دەوری سەرەکی بەیەکەوە بەستنی دوو وشە یان دوو دەستەواژە یان دوو ڕستەیە .

---

(٧٣) کۆڕی زانیاری کورد بە باشی ئەو دیاردەیەی ڕوون کردۆتەوە (بڕوانە : کۆڕی زانیاری کورد ، سەرچاوەی ناوبراو ، ڕێنووسی کوردی ، ل ٣٧٦ ـ ٣٧٧) .

تایبەتێتی ئەم وشەیەی کوردی ئەوەیە کە لە یەك دەنگ پێکهاتووە و لە کاتی تەلەفوز کردنیشدا لەگەڵ وشەی پێش خۆیدا دێت . جا ئەمە وای لە زۆر کەس کردووە لە نووسیندا بە وشەی پێشیەوە بلکێنن ـ واتە دەیکەنە پیتێك لە پیتەکانی ئەو وشەیە . ئەو نووسەرانە تەنیا چمکی بەدەمدا هاتنی وشەی (و) ی پێوەندیان ڕەچاوکردووە و سەرەکانی دیکەی ئەو مەسەلەیەیان نەخوێندۆتەوە . . . ئەگەر ئاوڕێك لە زمانی ئینگلیزی و ڕووسی بدەینەوە ، ئەوە باشتر سەربەخۆ نووسینی (و) ی پێوەندیمان بۆ ئاشکرا دەبێ . بەوێنە لە زمانی ئینگلیزیدا (and) ی پێوەندی لە دەنگێك پتر پێکهاتووە و لە نووسینیشدا بە هیچ وشەیەکەوەی نالکێنن . لە ڕووسیشدا (ی) ی پێوەندی هەرچەندە لەگەڵ وشەی دوای خۆیدا تەلەفوز دەکرێ ، بەلام لە نووسیندا پێوەی نالکێنن .

بەڵگەیەکی دی ئەو نووسەرانەی (و) ی پێوەندی بە وشەی پێش خۆیەوە دەلکێنن ، ئەوەیە کە لەگەڵ (ی) ی ئیزافەدا بەراوردی دەکەن ـ واتە دەڵێن چۆن (ی)ی ئیزافە بەدوای وشەوە دەلکێنرێ (و) ی پێوەندیش هەر دەبێ وەك ئەو بێت . من لەو ڕایەدام کە بۆ وەلام تەنیا ئەوە بەس بێ کە بڵێم (ی) ی ئیزافە نیشانەیە و (و) ی پێوەندی وشەیە .

کۆڕی زانیاری کورد هەرچەندە لەو کێشەیە نەدواوە ، بەلام بێگومان پەسەندکردنی بەجیا نووسینی (و) ی پێوەندی لەئەنجامی لێکۆڵینەوەوە هەڵقولاوە . . .[٧٤] شایانی باسە ساڵی ١٩٦١ مامۆستا شێخ حەسەن بە بەڵگەی ڕاست و زانستییەوە ئەوەی نیشانداوە ، کە (و) ی پێوەندی دەبێ سەربەخۆ بنووسرێ[٧٥] [٧٦] .

---

(٧٤) هەمان سەرچاوە ، ل ٣٧٨ .

(٧٥) شێخ حەسەن ، سەرچاوەی ناوبراو ، (ی) ی ئیزافە و (واو) ی عەتف ، ل ١٦ ـ ١٧ .

(٧٦) مامۆستا مستەفا نەریمان بەجیا نووسینی واوی پێوەندی بە کاری کۆڕی زانیاری کورد داناوە (ڕێنووسی کوردی لە ڕەگە و ڕیشەوە ، ل ٤٥) ، بەلام ئەگەر تەماشای ژمارە (٦) ی ساڵی (٢) ی گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ی بکردایە ، بۆی دەردەکەوت کە مامۆستا شێخ حەسەن دوازدە ساڵ بەر لە کۆڕی زانیاری بە بەڵگەی ڕاست و زانستییەوە ئەوەی تۆمار کردووە .

**٣ - پرپۆزیشن .**

هەرچەندە پرپۆزیشن لە ریزی وشەی ناتەواوە ، بەڵام وەك هەر بەشێكی وشەی تەواو رواڵەتی سەربەخۆی هەیە و لە زمانی كوردیدا یەكێكە لە بەشە ئاخاوتنە چالاكەكان . سەرەرای ئەوە لە دەربرینیشدا بە پێش یان بە پاشی وشەوە نالكێنرێ . بەوێنە كە دەوترێ : « ئەو بە سواری ئەسپ هات » ، دەبینین پرپۆزیشنی (بە) رواڵەتی سەربەخۆی هەیە و نە بە وشەی «ئەو» و نە بە وشەی « سواری » یەوە نەلكاوە . . . كاتێ دەڵێین « نەوزاد بێ تۆ ناژی » ، ئەوە پرپۆزیشنی (بێ) لە هەموو سەرێكەوە سەربەخۆیە . . . یاخود ئەگەر بڵێین « پار لە سلێمانی بووم » ، دەبینین پرپۆزیشنی (لە) بە هیچ وشەیەكەوە نەلكاوە . . . جا بۆیە پێویستە پرپۆزیشن بە جیا و سەربەخۆ بنووسرێ .

هەرچی پۆستپۆزیشنی (دا ، را ، ەوە) یە بەپێچەوانەوە پێویستە بە كۆتایی وشەوە بلكێنرێ[٧٧] . ئەگەر ئەو پرسیارە بكرێت كە بۆ پرپۆزیشن دەبێ سەربەخۆ بنووسرێ و پۆستپۆزیشن بە كۆتایی وشەوە بلكێنرێ ، ئەوە لە وەڵامدا دەڵێین :

١ - پرپۆزیش بەشێكە لە ئاخاوتن و بوونی سەربەخۆی هەیە ، بەڵام پۆستپۆزیشن بەشێك نییە لە ئاخاوتن و بوونی سەربەخۆی نییە .

٢ - پرپۆزیشن سەرەكی یە و پۆستپۆزیشن تەواوكەرێتی

لێرەدا پێویستە ئەوە بێنینەوە یاد كە لە زمانی كوردیدا دیاردەی گوێزانەوەی وشە لە بەشێكی ئاخاوتنەوە بۆ بەشێكی دیكەی ئاخاوتن یان بوونی وشە بە ئافیكس و ئینتەرفیكس زۆر كاریگەرە[٧٨] بەویێ یە دەبینین هەندێ لە پرپۆزیشنەكان وەك پێشگر و ئینتەرفیكس خۆیان دەنوێنن . بەنموونە لە وشەی وەك : « بەهێز ، بێهۆش ، لەبار . . . » دا ، (بە) و (بێ) و (لە) . . . بوونەتە پێشگر . یاخود لە

---

(٧٧) كۆڕی زانیاری كوردیش هەر لەو رایەدایە كە پۆستپۆزیشن بە كۆتایی وشەوە بلكێنرێ ، بەڵام بۆ پێ سەلماندنی ئەو رایە هیچ بەڵگەیەكی نەهێناوەتەوە و سەرەرای ئەوەش تەنیا ناوی (دا ، را) ی بردووە و (ەوە) ی لەبیركردووە (بروانە : كۆڕی زانیاری كورد ، سەرچاوەی ناوبراو ، رێنووسی كوردی ، ل ٣٧٩) .

(٧٨) بۆ زانستی زیاتر لەبارەی گوێزانەوەی وشەوە لە بەشێكی ئاخاوتنەوە بۆ بەشێكی دی ، بروانە : (د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، رێزمانی كوردی ، بەرگی یەكەم ، بەشی یەكەم ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ١٢ - ١٥) .

وشەی وەك « چاوبەکل ، سەربەخۆ ، گوڵبەدەم . . . » دا (بە) وەك ئینتەرفیکس خۆی دەنوێنێ . . . لەبەرئەوەی ئافیکس و ئینتەرفیکس سەر بە هیچ بەشە ئاخاوتنێك نین ، سەربەخۆ بەکارنایەن . بۆیە ڕاست نییە وشەی وەك « بەهێز ، بێهۆش ، لەبار . . . » و « چاوبەکل ، سەربەخۆ ، گوڵبەدەم . . . » کەرت کەرت بکرێن . لێرەدا ئەو (بێ) و (بە) و (لە) یە نین ، کە لە ڕستەکانی ( ئەو بە سواری ئەسپ هات » ، « نەوزاد بێ تۆ ناژی » ، « پار لە سلێمانی بووم » دا دەوری پرێپۆزیشنیان بینیوە . شایانی باسە مامۆستا مەسعوود محەمەد پەنجەی بۆ ئەو دیاردەیە ڕاکێشاوە و بە بەڵگەی ڕاست و گونجاو چەسپاندوویەتی[79] .

لە باسی خۆنواندنی پرێپۆزیشندا ، هەروەها کێشەیەکی دی هەیە ، ئەویش ئەوەیە کاتێ لە پێش وشەیەکەوە بێت کە دەنگی سەرەتای سوابێ ، ناچار بە وشەکەوە دەلکێ ، وەك « لەوێ ، لەم ، بەم ، بەمان ، بەوان . . . » کە لە بنەڕەتدا « لە ئەوێ ، لە ئەم ، بە ئەم ، بە ئەمان ، بە ئەوان . . . » بوون و (ە) تێچووە[80] . جا لەم حاڵەتەدا پرێپۆزیشن لەگەڵ پاشماوەی وشەکاندا تێکەڵ بووە و ناکرێ بەجیا بنووسرێن .

## تێك بەستنی پیتەکان

وەك ئاشکرایە لە ئەلفوبێی عەرەبیدا هەر دەنگێك چەند نیگارێکی هەیە . بەوێنە پیتی (یاء) بە چوار جۆر دەنووسرێ : لە سەرەتادا (یـ) ، لە ناوەڕاستدا (ـیـ) ، لە کۆتاییدا ئەگەر بە پیتی پێشیەوە بلکی (ـي) و ئەگەر نەلکێ (ی) . ئەمە سەرەڕای گرانی و قورسی بووەتە هۆی پەیداکردنی ژمارەیەك گیروگرفت لە نووسینی کوردیدا . دەبینین زوربەی ئەو وشانەی پیتی دواییان بە پیتی لکاو دوایی دێت ، کاتێ نیشانە یان پۆستپۆزیشن وەردەگرن ، جۆربەجۆر دەنووسرێن ، وەك : « جوان تر ـ

(79) مەسعوود محەمەد ، سەرچاوەی ناوبراو ، ڕێنووسی کوڕ ، ل ٢٧٥ ـ ٢٧٧ .

(80) وتوومانە (ە) تێچووە ، بەڵام لەبەرچاو وا پێ دەچێ کە (ئـ) و (ە) سوابن . وەك پێشتر لێی دواوین ، بە ڕای ئێمە لە زمانی کوردیدا (ئـ) فۆنیم نییە ، بەڵکو دەنگێکی یاریدەدەرە و لە سەرەتای ئەو وشانەوە یاخود ئەو برگانەوە پەیدا دەبێ کە بە بزوێن دەست پێ دەکەن .

جوانتر ، هاوڕێی باش ـ هاوڕێی باش ، لە سلێمانیدا ـ لە سلێمانیدا ، لە موکریانرا ـ لە موکریانرا . . . » . یاخود ئەو وشە ناسادانەی مۆرفیمی یەکەمیان بە پیتی لکاو کۆتایی دێت ، هەمەچەشن دەنووسرێن ، وەك : « چاپخانە ـ چاپخانە ، پێ نووس ـ پێنووس ، بەرگ‌دروو ـ بەرگدروو ، ڕەش ماڵ ـ ڕەشماڵ ، ئاسن گەر ـ ئاسنگەر ، دڵ سۆز ـ دڵسۆز ، جێ گە ـ جێگە . . . » . کەچی ئەو وشانەی مۆرفیمی یەکەمیان بە پیتی نەلکاو تەواو دەبێ ، گیروگرفتیان نییە و وەك یەك دەیان نووسن ، بەوێنە (ئازاتر ، لە هەولێردا ، ڕووڕەش ، زەرداو ، دووڕوو ، زۆربلێ ، کوردستان . . . » .

بێ‌گومان بەلای ئێمەوە ئەو دەستەیە مەبەستە کە گیروگرفتیان هەیە ، واتە ئەوانەی بە هەمەجۆر دەنووسرێن . . . هەندێ لە نووسەران وا بە باش دەزانن کە ئەو جۆرە وشە ناسادانە بەیەکەوە نەلکێنرێن[81] ، بەڵگەشیان بۆ ئەمە ئەوەیە کە هەر وشەیەك پارێزگاریی قەوارەی خۆی دەکا و شێوەی ڕۆنانیان ئاشکرا دەکا . بەشێکی دی نووسەران بەیەکەوە لکاندنیان پەسەند دەکەن و بەڵگەشیان ئاسانیی نووسینە . . .[82] بەڵێ هەردوو باوەڕ بنەمایان هەیە ، بەڵام من شێوەی بەیەکەوە لکانم بەلاوە باشترە ، ئەویش چونکە ڕێنووسی گشتی ئەرکی ئەوەی لەسەر نییە شێوەی ڕۆنان نیشان بدا . هەروەها ئەو جۆرە نووسینانە بۆ کاری لێکۆڵینەوەی زمان باشە . جۆری یەکەم سەرەڕای گرانی و دەست هەڵگرتن لە نووسیندا ، هەروەها ناوەناوە بەرێکەوت پارچەکانی یەك وشە دوور لەیەکەوە دەنووسرێن و ئەمەش شیرازەی وشە تێك دەدا . هەرچی جۆری دووەمە ، سەرەڕای ئاسانی ، هەروەها پێکهاتنی وشە ناسادەکە پتر دەچەسپێنی ، بەتایبەتی لە زمانی کوردیدا کە وشەی ناسادە کێشەی زۆرە .

ئەمە تا ئێرە شێوەی سادەی پیتی نەلکاو و لکاوە ، بەڵام جگە لەو شێوە سادەیە ، شێوەی ئاڵۆزیش هەیە و ئەمیان گیروگرفتی پترە . بەوێنە وشەی وەك

---

(٨١) بەوێنە ، بڕوانە : نووری عەلی ئەمین ، ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی ، بەغدا ، ١٩٦٦ ، ل ٤٩ ـ ٥٠

(٨٢) بەوێنە ، بڕوانە : طاهیر صادق ، ڕێنووس ـ چۆنیەتی نووسینی کوردی ، کەرکووك ، ١٩٦٩ ، ل ٣٢ ـ ٣٣ ، ٣٥ ـ ٣٧ ، ٥٧ ، ٦٠ . . .

« گوێلێگرتن » . دەکرێ بە چوار جۆر بنووسرێ : « گوێ لێ گرتن ، گوێ لێگرتن ، گوێلی گرتن ، گوێلێگرتن ».لەبەرئەوەی گومان لەوە ناکەم کە وشەی ناوبراو وشەیەکی لێکدراوە ، بۆیە هەروەك وشەکانی پێشوو وا بەراست دەزانم بنووسرێ « گوێلێگرتن » . بەلاّم کە دەوترێ « گوێم لێت گرت » ، لەبەر ئەوەی بووەتە رستە ، نەك هەر نابێ پێتی لکاو لێکیان بدات ، بەلکو نابێ پێتە نەلکاوەکانیش لەیەك نێزیك بن ـ واتە دەبێ مامەلەی رستەی لەگەل بکەین .

بێگومان ، وەنەبێ ئەوەی لەم بارەیەوە وتوومە هەمووی بەشێوە جوان بێ ، بەلاّم هێندە هەیە ، ئەوەی پێشنیارم کردووە لەسەر لێکدانەوە و زانستی زمان و رێزمانی کوردی بنیات نراوە .

## نووسینی وشەی بێگانە

لەئەنجامی پێوەندی دوور و درێژی ئابووری و سیاسی و کولتووری میللەتی کورد لەگەل میللەتانی تردا ، گەلێك وشەی بێگانە هاتوونەتە زمانی کوردییەوە و بنجی خۆیان پتەوکردووە . بێگومان ئەوەی کورد لە بێگانەی وەرگرتووە ، خستوویەتییە ژێر باری فۆنەتیك و رێزمانی کوردییەوە و بەمە بەرگێکی کوردی بەبەردا کردووە . ئەوەش کە پتر پێویستی بە دەستکاریکردن هەبووە وشە عەرەبییەکان بوون . دەستکاری وشەی عەرەبی لە چەند رێگایەکەوە بووە : یەکێك لەو دەستکارییانە لە رووی دەنگ و بەدەمدا هاتنەوە بووە . بۆنموونە ئەگەر لە وشەیەکی عەرەبیدا دەنگێك هەبووبێ کە لەگەل یاسای فۆنەتیکی زمانی کوردیدا رێك نەکەوتبێ ، ئەوە گۆرانێکی بەسەردا هێنراوە ، بەوێنە دەبینین دەنگی (ث ، ص ، ض ، ط ، ظ ، ذ . . .) کە لە گەلێك وشەی عەرەبیدا هەن ، لە کوردیدا کراون بە (س ، ت ، ز . . .) وەك : « صابر ـ سابیر ؛ ثروة ـ سەروەت ؛ طاهر ـ تایەر ؛ قرض ـ قەرز ؛ ظلم ـ زولم ؛ ذخیرة ـ زەخیرە . . . » .

رێکەوتی وەهاش زۆرە کە وشەیەکی عەرەبی بە جۆرێك هاتۆتە زمانی کوردییەوە و بە شێوەیەك دەستکاری کراوە کە لەئەنجامی لێکۆلینەوە و تۆژینەوەی تەواودا هەستی پێ دەکرێ و روون دەبێتەوە و دەردەکەوێ کە ئەو وشەیە بە رەسەن کوردی نییە ، وەك « متمانە ـ مطمئن ؛ تام ـ طعم ؛ مەشخەل ـ مشعل ؛ سات ـ ساعة . . . » .

ئەم جۆرە دەستکاری کردنەی وشە کارێکی گرنگەو پێویستە ، بەتایبەتی چونکە وشەی بێگانە وەردەگیرێ بۆ ئەوەی لەسەر وشەکانی کوردی کەڵەکە بکرێ .
بێگومان ئەم دەستکاری کردنەش دەبێتە هۆی پتەوبوون و ڕەگداکوتانی ئەو وشانە لە زمانی کوردیدا .

کورد چۆن وشەی هەر زمانێکی بێگانەی وەرگرتووە ، شێوە و بەرگی کوردی بەبەردا کردووە و خستوویەتی یە ژێر باری سروشتی فۆنەتیکی زمانەکەیەوە ، هەر بەوجۆرەش پێویستە لە ڕێنووسدا مامەڵەی لەگەڵ بکرێ ، چونکە ڕێنووس ئاوێنەی واقیعی زمانەکەیە .

ئەگەر فارس یان عەرەب یان تورك وشەیەکی کوردی یان هەر زمانێکی دی یان وەرگرتبێ ، بە ڕێنووسی خۆیان نووسیویانە . ئەو دەیان وشە لاتینی و فەرەنسی و ئینگلیزی و تورکی . . . یانەی هاتوونەتە زمانی ڕووسییەوە ، هەر بە ڕێنووسی ڕووسی دەنووسرێن . . . هەر بەوچەشنە لە نووسینی ئەو وشە بێگانانەدا کە کەوتوونەتە زمانی کوردییەوە ، دەبێ پەیرەوی ڕێنووسی کوردی بکرێت ـ واتە پێویستە بنووسرێ : « سابیر ، ئەحمەد ، ئیزاعە ، زوڵم ، حەوز . . . » و « صابر ، احمد ، اذاعة ، ظلم ، حوض . . . » نەنووسرێ .



# خاڵبەندی

لە ئەنجامی وردبوونەوە لە مێژووی نووسینی کوردیدا ، ئەوەمان لێ ئاشکرا بوو ، کە دەمێ ساڵە نووسەرانی کورد کێشەی چۆنیەتی نووسینی زمانەکەیان لەبەرچاو گرتووە و دەیان وتار و لێکۆڵینەوەیان لەبارەی (گیروگرفتی نیگاری دەنگەکان) و (گیروگرفتی نووسینی وشەکان و تێك بەستنیان) ەوە نووسیوەو هەوڵی نەهێشتنی قۆرت و تەگەرەیان داوە تا لە پاشاگەردانی رزگاریان بێ و ئەلفوبێی عەرەبی وا لێ بکەن بتوانرێ دەنگە کوردییەکانی بەجۆرێکی وا پێ دەرببڕرێ خوێندەواری کورد بتوانێ ئەوەی دەیلێ بیخانە سەر کاغەز .

بەڵام بەداخەوە ، هەرچی کێشەی (خاڵبەندی) یە کاری زۆری تێدا نەکراوە و هەوڵی باشی بۆ نەدراوە . ئەوەی لەم رووەوە بڵاوکراوەتەوە هێندە کەمە بە پەنجە دەژمێررێ . کاری هەرە دیاری ئەم مەیدانە بریتییە لەو چەند لاپەرەیەی مامۆستا تۆفیق وەهبی ، کە لە کتێبی « قواعد اللغة الكردية » (١٩٥٦) دا نووسیویتی[1] و ئەوەی مامۆستا ئەمینی عەڤدال کە لە لاپەرە (٤٣ ـ ٥٣) ی کتێبی « خەبەرناما کوردیا راستنڤیساندنە » دا بە ناوی (نقتك دانین) ەوە[2] بڵاوی کردۆتەوە[3] و ئەوەی مامۆستا نووری عەلی ئەمین ساڵی ١٩٦٦ لە بەشی دەیەمی کتێبی « رابەرێ بۆ ئیملای کوردی » دا لێی دواوە[4] . . . هەروەها سێ ساڵێك لەمەوبەر نووسینێکی نوێیش بڵاوکرایەوە ، ئەویش باسێکی د . کامیل بەسیرە ،

---

(١) توفيق وهبي ، قواعد اللغة الكردية ، الجزء الاول ، الباب الثانى ، ١٩٥٦ .

(٢) مامۆستا شوکور مستەفا ئەو چەند لاپەرەیەی کتێبی « خەبەرناما کوردیا راستنڤیساندنە » ، کە بە ناوی (نقتك دانین) ە ، لە ئەلفوبێی سلاڤی یەوە هێناوەتە سەر ئەلفوبێی عەرەبی و لە « گۆڤاری کۆری زانیاری کورد » (بەرگی سێیەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣٠٣ ـ ٣١٨) دا بڵاوی کردۆتەوە .

(٣) ئەمینی عەڤدال ، خەبەرناما کوردیا راستنڤیساندنە ، یەریڤان ، ١٩٥٨ .

(٤) نووری عەلی ئەمین ، رابەرێ بۆ ئیملای کوردی بەغدا ، ١٩٦٦ ، ل ٩١ ـ ٩٩ .

که بەناوی « خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی » یەوە بۆ کۆڕی گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی ئامادەکردبوو[٥] . . .

ئەگەرچی کارەکانی مامۆستا تۆفیق وەهبی و مامۆستا ئەمینی عەڤدال و مامۆستا نووری عەلی ئەمین ناتەواوی و کەم و کورتییان زۆرە ، بەڵام لە هەموو ڕوویەکەوە لەو باسەی د . کامیل[٦] زانستیانەتر و قووڵترن .

باش دانانی نیشانەکانی خاڵبەندی و چاك زانینی دەستووری بەکارهێنانی لە هەر نووسینێکدا کارێکی پێویست و گرنگە .

(خاڵبەندی) لەگەڵ (نووسینی وشەکان) ڕووی هەرە گرنگی دارشتنی نووسینن . باش دانانی نیشانەکانی خاڵبەندی لە شوێنی پێویستدا و ڕاست نووسینی وشەکان یاریدەی زوو تێگەیشتنی خوێنەر دەدەن .

زانینی بەکارهێنانی نیشانەکانی خاڵبەندی پێویستی بە ئەندازەیەك زانیاری هەیە . بۆئەوەش کە نووسەر بتوانێ بە ڕەوانی بەکاریان بێنێ و بزانێ لە شوێنی خۆیاندا دایانبنێ ، دەبێ باش شارەزای سروشت و خاسیەت و ئەرك و دەوریان بێت .

نیشانەکانی خاڵبەندی لە نووسیندا بۆ دابەشکردنی تێکست لە ڕووی سینتاکس و واتاوە بەکاردەهێنرێن . با بزانین مەبەست لە دابەکردنی تێکست لە ڕووی سینتاکس و واتاوە چی یە .

وتار ، نامیلکە ، کتێب دەکرێ بەسەر بەش یان فەسڵ یان بەند یان ڕستە یان پارچەکانی ڕستەدا دابەش بکرێ . لە نووسیندا ئەرکی دابەشکردنی تێکست بەسەر ڕستەدا و ڕستەش بەسەر پارچەی جیاوازدا ئەو نیشانانە بەجێی دێنن ، کە بەناوی نیشانەکانی خاڵبەندییەوە ناسراون .

---

(٥) د . کامیل بەسیر ، خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٥ ـ ١٥ .

(٦) دەربارەی ئەو وتارە بڕوانە :

أ ـ د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، مووروری مالاوسێ مەگەر بەشەو بکرێتەمل ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ، ژ ٩ ، بەغدا . ١٩٨٢ ، ل ٥١ ـ ٧٤ .

ب ـ د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، لە ڕێگای ڕاستگۆیی و دەستپاکی و زانستدا ، ڕۆژنامەی «عێراق» ، بەشی یەکەم ، ژ ٢١٦٠ ، بەغدا ، ٩ی مارتی ١٩٨٣ ، ل ٧ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٢١٧٩ ، بەغدا ، ٣٠ی مارتی ١٩٨٣ ، ل ٧ .

بێ‌گومان ، ڕاست نییه وا به فروانی بووترێ ، که گوایا نیشانه‌کانی خاڵبه‌ندی تێکست به‌سه‌ر ڕسته‌دا دابه‌ش ده‌که‌ن ، چونکه ئاخاوتنی ئێمه خۆی له خۆیدا بریتییه له ڕسته و ڕسته‌ش وه‌سیله‌ی پێکهێن و سازکه‌ری زمانه . هه‌رچی نیشانه‌کانی خاڵبه‌ندی‌یه ته‌نیا وه‌سیله‌یه‌کی یاریده‌ده‌رن بۆ نیشاندانی سنووری نێوان ڕسته و پارچه‌کانی ڕسته له نووسیندا . له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا پێویسته په‌نجه بۆ ئه‌وه ڕابکێشین که وا نیشانه‌کانی خاڵبه‌ندی دیاری‌کردنی ئه‌و سنوورانه به‌ته‌واوی ئاسان ده‌که‌ن[7] .

جاری وا هه‌یه به‌هۆی له‌بیرکردن یان ڕاست‌دانه‌نانی نیشانه‌یه‌که‌وه ، سه‌رپاکی واتای ئه‌وه‌ی وتراوه ده‌شێوێ . به‌وێنه ئه‌و ڕووداوه زۆر ئاشکرایه ، که ساڵی ١٨٦٤ له ئه‌مه‌ریکا کاتی له چاپدانی ئیستیماره‌ی گومرگ ، چه‌ند خاوه‌ن کارگه‌یه‌کی ئینگلیز بۆیان هه‌ڵکه‌وت ڕاستکه‌ره‌وه‌کانی چاپخانه بکڕن بۆ ئه‌و مه‌به‌سته‌ی له ئیستیماره‌کاندا شوێنی ڕاسته‌قینه‌ی کۆمایه‌ك بگۆڕن . به‌هۆی ئه‌و جێ‌گۆڕینه‌ی کۆماکه‌وه ئه‌ندازه‌ی باجی پلێته ئاسن وه‌ك باجی ئاسنی خاوی لێ‌هات . ئه‌و هه‌ڵه‌ی چاپه (ڕاستتر ئه‌و فێڵه) ته‌نیا دوای حه‌ڤده ساڵ هه‌ستی پێ‌کرا . ئه‌مه‌ریکا له‌و ماوه‌یه‌دا له ده‌ستکه‌وتی باجی گومرگدا ٤٩ ٩٥٥ ٧٦٦ دۆلاری له‌کیس چوو[8] .

بێ‌گومان ئاواز و خاڵبه‌ندی پێوه‌ندییان له‌گه‌ڵ یه‌کتر هه‌یه . هه‌روه‌ها چۆن ئاواز یاریده‌ی ڕاست‌دانانی نیشانه‌کانی خاڵبه‌ندی ده‌دات ، هه‌ر به‌وچه‌شنه یاریده‌ی باش تێ‌گه‌یشتنی مه‌به‌ستیش ده‌دات .

س . ی . ئه‌باکومۆڤ ده‌ڵێ : ئاواز و خاڵبه‌ندی دوو منداڵی یه‌ك باوکن . چ ئه‌م و چ ئه‌و یاریده‌ی نیشاندانی پێوه‌ندیی ڕێزمانی له‌نێوان ڕسته‌کان و پارچه‌کانیاندا ده‌ده‌ن و واتای ده‌قه‌که ده‌رده‌خه‌ن . به‌ڵێ ده‌ق به بێ‌نیشانه‌کانی خاڵبه‌ندی مانای ون‌نابێ ، هه‌ر به‌وچه‌شنه به بێ‌ئاوازیش . ئه‌گه‌رچی ده‌کرێ چه‌ند ڕسته‌یه‌ك به بێ‌ئاواز بوترێ ، به‌ڵام جوانی و جه‌وهه‌ری نامێنێ و تێ‌گه‌یشتن لێی زه‌حمه‌ت ده‌بێ . بێ‌گومان ، قسه نابێ له ئاواز بێ‌به‌ش بکرێ ، چونکه ئاواز جه‌وهه‌ری قسه‌یه .

---

(٧) ڤ . ف . ئیڤانۆڤا ، سه‌ره‌تایێکی خاڵبه‌ندیی ڕووسی ، لێنینگراد ، ١٩٦٢ ، ل ٤ ـ ٥ .
(٨) گۆڤاری « ئۆگۆنیۆك » ، ژ ٤ ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ .

تێکستی بێ خاڵبەندیش وەك قسەی بێ ئاوازە[9] .

لە رووی شێوەی دەربرینەوە دوو جۆر دابەش کردنی وتە هەیە : دابەش کردنی وتەی ئاخاوتن و دابەش کردنی وتەی نووسراو . ئەم دوو دابەش کردنەش وێك ناچن و تەنیا یەك گرتنەوەیەکی دیاری کراو لە نێوانیاندا هەیە .

ئاخاوتن خاوەنی تایبەتێتی راوەستانە لەنێوان بەدەمدا هاتنی وشەکاندا (بێ گومان نەك دوای هەموو وشەیەك) . ئێمە کاتێ دەدوێین بۆ دیاری کردنی مەبەست ، وشەکان لە گروپدا پێکەوە دەبەستین و لەنێوان گروپەکاندا کەم یان زۆر رادەوەستین . بەوێنە کە دەڵێین : (کورە هەژارێك / لە بازاری گەورە / سوالێ دەکرد) ، ئەوە ئەم رستەیە لە تەلەفوزکردندا بەسەر سێ گروپی واتاداردا دابەش دەبێ . پێویستە پەنجە بۆ ئەوە رابکێشین گروپی واتادار کە لە زانستی زماندا (Syntagma) ی پێ دەڵێن ، دەلوێ لە یەك وشە پێکهاتبێ ، وەك : (بێ گومان / ئەو خاوەن سۆزە) ؛ (بەڵێ / تۆم خۆش دەوێ) . یاخود دەشێ رستەیەکی سەرلەبەر بریتی بێ لە یەك سینتاگمە ، بەوێنە : (رزگاریی کورد و کوردستانم دەوێ) . . .

جۆرەکەی دی دابەش کردن ، دابەش کردنی نووسینە . لێرەدا شێوازی دابەش کردن بە چەشنێکی ترە . لە نووسیندا بە نیگار گروپەکان جیادەکرێنەوە ، نەك بە ئاوازی دەربرین . ئەگەرچی ئەمیش هەر پارچەی واتاداری ئاخاوتنمانن ، بەڵام دابەش کردنیان لەسەر بناغەی پێکهاتنی رێزمانی رستە دامەزراوە[10] .

نیشانەکانی خاڵبەندی لە دەستووری نووسینی کوردیدا بۆ دەست نیشان کردنی شوێنی راوەستان نین . لە بناغەی خاڵبەندیماندا پێکهاتنی رێزمانی رستە سەرەکی یە . نیشانەکانی خاڵبەندی هەروەها دەتوانن مەبەستی دی بگەیەنن ، ئەویش بەتایبەتی نیشاندانی واتای گوتەیە . بەوێنە نیشانەی پرسیار واتای پرسیاری رستە دەست نیشان دەکا .

لە هەندێ باردا نیشانەکانی خاڵبەندی پێوەندی واتایی لە نێوان پارچەکانی

---

(9) س . ئی . ئاباکومۆف ، کێشەی لێکۆڵینەوەی خاڵبەندی ، گۆڤاری « زمانی رووسی لە قوتابخانەدا » ، ژ ٤ ، مۆسکۆ ١٩٤٧ ، ل ٢١ .

(10) بروانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ڤ . ف . ئیڤانۆڤا ، سەرەتایێکی خاڵبەندیی رووسی ، ل ٩ .

گوتەدا دەست‌نیشان دەکەن . بەوێنە :

١ - من قیژاندم ، ئەوان ڕایان‌کرد . (لە گێڕانەوەی باسەکەدا ژماردنی ڕووداو ڕەچاوکراوە) .

٢ - من قیژاندم - ئەوان ڕایان‌کرد . (ئەوان ڕایان‌کرد ، چونکە من قیژاندم ) .

٣ - من قیژاندم : ئەوان ڕایان‌کرد . (من قیژاندم ، چونکە ئەوان ڕایان‌کرد) .

بەوچەشنە نیشانەکانی خاڵبەندی بەر لە هەر شت دەوری دابەش‌کردنی تێکست بەسەر ڕستەدا لە ڕووی واتاوە دەبینن . وێڕای ئەوە ، هەروەها دەتوانن واتای گوتە دەست‌نیشان بکەن ، یان پێوەندی پارچەکانی گوتە دیاری بکەن . لەکۆتاییشدا حاڵەتی‌وا هەیە ، کە نیشانەکانی خاڵبەندی بۆ دیاری‌کردنی ئاوازی گوتە بەکاردەهێنرێ .

ئەگەرچی د . کامیل بەسیر بە هیچ جۆرێ بەلای ئەو ڕێباز و شێوازەی نیشانەکانی خاڵبەندی‌دا نەچووە و هەروەها زوربەی زمانەوانانی ئەمرۆی کوردیش لە نووسینە زمانەوانیەکانیاندا بێ‌ئاگایانە و نەشارەزایانە ئەو نیشانانە بەکاردێنن ، بەلاّم شایانی باسە ، ئەوە ڕۆژنامەیەکی کۆنی وەك « تێگەیشتنی ڕاستی »[11] و شاعیرێکی سالاّنی پەنجای وەك گۆران و هەندێ نووسەری ئەمرۆی وەك محەمەدی مەلا کەریم و شوکور مستەفا . . . بەکاریان هێناوە تا ڕادەیەك لەسەر بناغەی تیۆری و هەلّکەوتی زمانی کوردی‌یە .

هەرچەندە ئێمە کە نیشانەکانی خاڵبەندیی عەرەبی بەکاردێنین لەڕووی ڕوخسارەوە بە تەواوی ڕوونووسیان دەکەین ، بەلاّم ئەمە واناگەیەنێ کە لە عەرەبیدا لە کوێدا دووخاڵ یان دووکەوانە یان تەقەلّ . . . دایان‌بنێن ، دەبێ لە کوردیشدا هەر لەوشوێنانەدا دایان‌بنێن . وەك ئاشکرایە ، هەر زمانە خاوەنی تایبەتێتی خۆیەتی ، لەبەرئەوە پێویستە لێکۆڵینەوە لە هەر زمانێك لەسەر کەرەستەی چەسپاوی ئەو زمانە دابرێژرێت . . . جا هۆ ئەوە نییە ، کە کورد لەبەرئەوەی

---

(١١) لە ڕۆژنامەی « تێگەیشتنی ڕاستی » دا چۆن پیتی (گە) و (ڤ) نییە ، هەروەها بەشێك لە نیشانەکانی خاڵبەندیش بەرچاو ناکەون . دیارە هۆی ئەمەش هەر نەبوونی ئەو نیشانانەیە لەو چاپخانەیەی لێی چاپ‌دەکرا . . . بەلاّم ئەوەی شایانی باسە ، ئەوەیە زیاتر وایە هەر نیشانەیەك لە هەر شوێنێکدا دانراب زانایانە مامەڵەی لەگەڵ‌کراوە .

نیشانەکانی خاڵبەندیی عەرەبی بەکاردێنێ ، بۆیە هەندێ وێکچوون لـەنێوانیـاندا هەیە ، بەڵکو هۆ ئەوەیە لەنێو زماناندا بنەما و یاسا و دەستووری گشتی هەیە . . .
ئیتر ئەو رایەی د. کامیل بەسیر دەبێ تا کوێ بربکا کە دەڵێ : ئێمە لەبەرئەوەی بە پیتی عەرەبی دەنووسین « پێویستە دەستووری خاڵبەندییەکانی ئەم پیتە وەرگێرینە سەر زمانی کوردی »[12] .

بەپێی ئەو قسانەی د . کـامیل بێ ، ئـەو میللەتانـەی بە ئـەلفوبێی لاتینی دەنووسن ، خۆیان بە کێشەی خاڵبەندییەوە ماندوو نەکردووە و هەر یەکەیان لە لاتینییەوە وەری گێراوەتە سەر زمانەکەی خۆی . . . ئەگەر وابوایە ئەوە تا ئەمرۆش لەمسەر و ئەوسەری ئەورووپا وا بە گەرمی خـەریکی لێکۆڵینـەوەی ئەو کێشـەیە نەدەبوون

با ئێستاش تەماشایەکی ئەو نیشانانە و جۆری بەکارهێنانیان بکەین .

**خاڵ ( . ) :**

خاڵ واتای کۆتایی هـاتنی گوتـە دەگەیـەنێ . یا . ك . گـرۆت دەربارەی دەستووری بەکارهێنانی خاڵ نووسیویێتی : « خاڵ کاتێ دادەنرێ ، کە نووسەر بە پێویستی بزانێ بەتەواوی رستـەیەك لـە رستەیـەکی دی جیا بکـاتەوە »[13] . ئـەم پێناسەیە پێوەندی راستەوخۆی گوتە لە رووی واتاوە بە دانانی خاڵەوە زۆر بە روونی نیشان دەدات .

لەراستیدا ، ئێمە خاڵ بۆ جیاکردنەوەی بیرێك یان واتایەك دادەنێین کەوا لە شێوەی رستەیەکی سەربەخۆدا دارێژرابێ . کاتێ تێکستێکی وا دەخـوێنینەوە کـە نیشانەکانی خاڵبەندی بۆ دانراوە ، لە نووسەر چاوەڕوان دەکەین لەو شوێنانەدا خاڵی دانابێ کە پێویست بکا . جا لەسەر بناغەی بوونی خاڵ حوکم دەربارەی پێوەندی و دابەش کردنی رستە و بیر و واتا لە تێکستەکەدا دەدەین .

لەگەڵ ئەوەشدا ، ئەگەر تێکستێك نیشانەکانی خاڵبەنـدی بۆ دانـەنرابێ ، دەشێ هەرکەسە بەپێی تێگەیشتن و بۆچوونی خۆی خاڵ دابنێ .

---

(١٢) د. کـامیل بـەصیر ، بـۆ مووروووەکـەی د . ئەورەحـان حاجی مـارف ، رۆژنـامـەی « العراق » ، ژ ٢١١٢ ، ١٢ ی کانوونی دووەمی ١٩٨٣ ، ل ٧ .

(١٣) یا . ك . گرۆت ، رێنووسی رووسی ، پێتێربورگە ، ١٨٨٥ ، پەرەگرافی ١٠١ .

بەوێنە ئی . ئا . ڤیکورۆڤسکی لە وتاری « خاڵبەندی تێکستێکی سەرلەبەر » دا[14] سەبارەت بە تاقی کردنەوەیەکی سەرنج ڕاکێش دەدوێ ، کە گوایا لە سمینارێکدا تێکستێك کە هیچ نیشانەیەکی خاڵبەندی تێدا نەبووە ، بە (٣٥) مامۆستای زمان و ئەدەبی ڕووسی داوە داوای لێکردوون ، کە هەریەکە بەپێی تێگەیشتن و بیرکردنەوەی خۆی خاڵ و نیشانەکانی دی خاڵبەندی بۆ دابنێن . لەئەنجامدا جیاوازییەکی زۆر لەنێوانیاندا دەبینێ .

بەم جۆرە دانانی خاڵ بەر ئەو حاڵەتانەی دانانی نیشانەکانی خاڵبەندی دەکەوێ ، کەوا لەڕاستیدا بەپێی تێگەیشتنی تێکستەکە دیاری دەکرێن ـ واتە لەسەر بناغەی مانای تێکستەکە . لەگەڵ ئەوەشدا ، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە نووسەر لە دانانی خاڵدا ئازادە . بەوێنە ئەگەر یەکێك بێت خاڵ لە شوێنێکدا دابنێ کە بیر و مەبەستی تێدا کۆتایی نەهاتبێ ، بێگومان ڕاست نییە .

خاڵ دوو ئەرك بەجێ دێنێ : سنوور لە نێوان ڕستەیەك و ڕستەیەکی دیدا دیاری دەکا و کۆتایی ڕێزمانییان نیشان دەدا ـ ئەمە ئەرکی سینتاکسی یە . جگە لەوە خاسیەتی هەواڵ گەیاندنێکی تایبەتی نیشان دەدا ـ ئەمەش ئەرکی واتایی یە . ئەو دوو ئەرکە لەگەڵ یەك پێوەندیی هەمیشەیی یان هەیە .

هەرچی زمانە پێشکەوتووەکانن چ بەتیۆری و چ بە پراکتیك دەمێکە لە کێشەی شوێنی دانانی خاڵ بوونەتەوە . بەڵام زمانی کوردی هێشتا لە قووڵایی ئەو کێشەیەدا گیری خواردووە . . . جا کە ئەمرۆ نەك قوتابی و خوێندەواری ساکار ، بەڵکو ئەوانەش کە خەریکی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردین شوێنی دانانی خاڵ ، کە نیشانەی هەرە ئاشکرای خاڵبەندی یە نەزانن ، ئیتر چۆن ڕێ بە خۆمان بدەین لەو بارەیەوە کەم و کورتی چاپەمەنیی زوو بخەینە پێش چاو .

ئەگەرچی ڕۆژنامەی « تێگەیشتنی ڕاستی » لە هەندێ شوێنی پێویستدا خاڵی دانەناوە ، بەڵام بەدەگمەن ئەوە بەدی دەکرێ ، کە بەهەڵە خاڵی لەبریتی نیشانەیەکی دی دانابێ یان بەپێچەوانەوە نیشانەیەکی تری لە جیاتی خاڵ نووسیبێ ، کەچی مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی کە زمانەوانە ، ئەوەتە لە کتێبی « زاری

---

(١٤) بڕوانە : گۆڤاری « زمانی ڕووسی لە قوتابخانەدا » ، مۆسکۆ ، ١٩٣٦ ، ژ ٥ ، ل ١٤٣ ـ ١٤٥ .

زمانی کوردی له ترازووی بەراوردا » دا ، کە تازەترین بەرهەمێتی و لەم ساڵانەی دواییدا بڵاوی کردوتەوە[١٥] ، نەك هەر لە زۆر شوێنی پێویستدا خاڵی دانەناوە ، بەڵکو لە سەدان جێشدا بەهەڵە خاڵی لەباتی کۆما یان دووخاڵ یان تەقەڵ . . . داناوە و هەروەها بەپێچەوانەوەش نیشانەی تری لەجێی خاڵ قوت کردووەتەوە[١٦] .
بەڵام ئەوەتە پتر لە شەست ساڵ لەمەوبەر « تێگەیشتنی ڕاستی » لە نووسینی کوردیدا

---

(١٥) محەمەد ئەمین هەورامانی ، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراورددا ، بەغدا ، ١٩٨١ .

(١٦) بەوێنە ، کاتێ لە لاپەڕە (٦٩ - ٧٠) دا لە نەخشەی کۆنی هەورامان دەدوێ ، پێنج ناوچە (١ - هەورامانی عێراق ؛ ٢ - هەورامانی لهۆنی ئێران ؛ ٣ - هەورامانی دزلی ؛ ٤ - هەورامانی تەخت ؛ ٥ - هەورامانی ڕەزاو) ی دیاری کردووە . دەبینین لەپاش ناوبردنی ناوچەی یەکەم کۆمای داناوە و لەدوای ناوهێنانی ناوچەی دووەم و سێیەم خاڵ و پاش نووسینی ناوچەی چوارەم و پێنجەم دووخاڵ . بێگومان ، دانانی نیشانەی جیاواز بۆ ئەو چەند حاڵەتە وێکچووە ، تەواو ساکاری نووسەر نیشان دەدات . ئەوەی پتر سەرنج ڕابکێشێ ، ئەوەیە مامۆستا هەورامانی لە شوێنی نالایەقی ئەوتۆدا خاڵ دادەنێ ، کە هی ئەوە نییە هەڵەی تێدا بکرێ . بۆ پێ سەلماندنی ئەمەش با دوورنەکەوینەوە و هەر تەماشای ئەو لاپەڕانە بکەین ، کە لە نەخشەی کۆنی هەورامان دەدوێ . با ئەم ڕێگەیەش کورتتر بکەینەوە و بڕوانینە خاڵی یەکەم کە نووسیوێتی : « ١ - هەورامانی عێراق ، کە بەشێکە لە هەوارمانی لهۆن و ئەم ، دێهاتانە دەگرێتەوە . بیارە . تەوێڵە . بەڵخەی خواروو ، بەڵخەی سەروو ، سۆسەکان . پالانیان ، هاوار ، تاوێرە . دەرقەیسەر ، خەرپانی ، هانەنەوتی . نارنجلە . گولب . دەگاشیخان . سەرگەت . هانەودنی ، دەرەومەڕێ . ئەحمەدئاوا ، زەڵم . گەچینە . باخەکۆن ، خارگیلان بنجەودرەی » .
لێرەدا نامەوێ باسی هەڵەی کۆمای دوای وشەکانی (عێراق) و (ئەم) و خاڵی پاش وشەی (دەگرێتەوە) بکەم ، بەڵکو ئەوە دەڵێم کە دانانی خاڵ لەنێوان (تەوێڵە) و (بەڵخەی خواروو) ؛ (سۆسەکان) و (پالانیان) ؛ (تاوێرە) و (دەرقەیسەر) ؛ (هانەنەوتی) و (نارنجلە) ؛ (نارنجلە) و (گولب) ؛ (گولب) و (دەگاشیخان) ؛ (دەگاشیخان) و (سەرگەت) ؛ (سەرگەت)و (هانەودنی) . . . هەڵەیەکی زەقە و دەبوو کۆما دابنێ ، هەروەك چۆن لەنێوان ؛ (بیارە) و (تەوێڵە) ؛ (بەڵخەی خواردوو) و (بەڵخەی سەروو) و (سۆسەکان) . . . دا دایناوە .
بەڵێ ، لە هەر لاپەڕەیەکی بەرهەمە نوێکەی مامۆستا هەورامانیدا چەندین هەڵەی

وا راست و ڕەوان نیشانەی خاڵی بەکارهێناوە . بەوێنە :

هەموو لایەك پڕ لە شیوەنو هاوارو باوکەرو بو . بێسەری و بێدەری هەمو وڵاتی خەمبار کرد . (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ٢٠ ـ ٢١) .

بێ ایشی ، بێبازاری خلقی ی لە کیانی خوی بێزار کرد . (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ٢١ ـ ٢٢) .

دووخاڵ ( : ) :

لە زۆر دۆخدا ، باری واتا دانانی دووخاڵ دیاری دەکات . بەوێنە لە سنووری ڕستەدا کاتێ دووخاڵ لەبریتی کۆما دادەنرێ ، کە ڕستەی دووەم ئەو هۆیە نیشانبدا ، کە لە ڕستەی یەکەمدا باسی هاتووە ؛ یاخود کاتێ ڕستەی دووەم ناوەرۆکی ڕستەی یەکەم (یان یەکێك لە ئەندامەکانی ڕستەی یەکەم) ئاشکرادەکات ؛ یاخود کاتێ ڕستەی دووەم ڕستەی یەکەم تەواو دەکات .

بۆ نموونە :

مامۆستایان ئەیانەوێ :
هەتاوی کورد زوو دەرکەوێ ،
ڕێی بیر بۆ مێشکمان خۆش کەن ،
زمانمان بە کوردی گۆش کەن . .

(گۆران ، ل ٣١١)[17]

بازاری قەلا پربوو لە خەڵك : لە دەشتەکی و کۆچەر ، لە ئازربایجانی و خەڵکی وانێ ، لە خەڵکی وڵاتی ئاسۆریان و لە خەڵکی زۆر ناوچەی دیکەش .

(دمدم ، ل ٢٦)[18]

---

ـــ گەورە لە بەکارهێنانی نیشانەکانی خاڵبەندیدا دەبینرێو بەداخەوە ئێرە جێی ئەوە نییە بەدرێژی لێی بدوێم .

(١٧) دیوانی گۆران ، سەرجەمی بەرهەمی گۆران ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

(١٨) عەرەب شەمۆ ، دمدم ، (شوکور مستەفا کردویە بە کرمانجی خواروو) ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

وتم : ئاوێکی ڕەحمەت ، گەیە ڕۆحم ئاگری فیرقەت
وتی : لەم دۆزەخە زەحمەت کە دەر بێ هەر کەسی تێکەوت

(مەحوی ، ل ۸۵)[۱۹]

ئەگەر نووسەر نەیەوێ پێوەندی روون کردنەوە دەست نیشان بکات ، ئەوە لەو حاڵەتانەدا بۆی هەیە کۆما دابنێ . وەك :

. . . بەپێچەوانەی ئەوەوە کە مامۆستا عەلائەددین سەججادی دەیڵێ ، مەحوی شاعیرێك نەبووە زۆر لە خۆی بکا بۆ شیعر وتن .

(مەحوی ، ل بیست و نۆ)

وەك بینیمان ، دانانی دوو خاڵ لە سنووری ڕستەدا پێوەندی بە واتاوە هەیە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە وەنەبێ لەگەڵ ئەوە ناکۆکی پەیدا بکات ، ئەگەر بڵێین دانانی دووخاڵ پێوەندی بە پێکهاتنی ڕێزمانی ڕستەشەوە هەیە . دووخاڵ کە شایەتی خاسیەتێکی دیاری کراوی پێوەندی واتایی نێوان ڕستە دەدا ، لە هەمان کاتدا سنوورەکانی ڕستەش نیشان دەدات[۲۰] .

دەربارەی ئەرك و شوێنی دانانی دوو خاڵ گەلێ شتی دی هەیە ، بەڵام بەداخەوە ئێرە جێی درێژە پێدان نییە . ئێستا هەر ئەوەندە دەڵێم ، کە لە گەلێ نووسینی کوردی ئەمڕۆدا تەنانەت لە زۆر شوێنی ئاشکرا و بێدەمەتەقێشدا حیسابی بۆ نەکراوە[۲۱] ، کەچی لە ڕۆژنامەی « تێگەیشتنی ڕاستی » دا نەك مەگەر هەر بەدەگمەن هەڵەی لەو جۆرە بەرچاو بکەوێ ، بەڵکو لە گەلێ شوێنی تری پێویستی ئەوتۆشدا خاڵ دانراوە ، کە گەلێك لە زمانەوانەکانی ئەمڕۆ بۆی ناچن .

---

(۱۹) دیوانی مەحوی ، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی : مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و محەمەدی مەلا کەریم ، بەغدا ، ۱۹۷۷ .

(۲۰) س . گ . بەرخورداروّف و . . . ، دەستووری خاڵبەندیی ڕووسی ، کتێبی « کێشەی ڕێنووسی ڕووسی » ، مۆسکۆ ، ۱۹٦٤ ، ل ۳۱ .

(۲۱) بەوێنە د . ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم لە کتێبی « ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز لەگەڵ ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لە دیالێکتە ناوەندییەکانی زمانی کوردیدا » (بەغدا ، ۱۹۸۰) زۆر جار تەنانەت لەدوای وشەی (دەڵێت) و (بڕوانە) شەوە دووخاڵی دانەناوە .

چەند نموونەیەك :

ایتالیانەکان الـین : (کول دلـروسو) و شـاخی (فالیـلا)مان . . . (ژ ۱ ، ل ۲ ، س ۱ ، د ۳۱) .

لشکرکیرهیك الی : دوشمن لە شرقی (لوس) پلاماری داینی و . . . (ژ ۳ ، ل ۱ ، س ۲ ، د ۲٦) .

اودسا : هەرای (اودسا) کە لەپاش . . . (ژ ۱ ، ل ۲ ، س ۲ ، د ۱٤ ) .

امستردام : وکیل تلغراف . . . (ژ ۱ ، ل ۲ ، س ۲ ، د ۲۱) .

دیانت : مسلمان همو یکن ، یکدل و یك روحن (ژ ٤ ، ل ۱ ، س ۱ ، د ۲) .

سیاست : اما سیاست وا نیە . . . (ژ ٤ ، ل ۱ ، س ۱ ، د ٦) .

. . . هتد .

کۆمەڵە خاڵ ( . . . ) :

ئەم نیشانەیە بە واتاوە بەندە . کـۆمەڵـەخاڵ واتـای شتێکی تەواو نـەکراو دەگەیەنێ .

بۆنموونە :

ـ برا ، دەفەرموو دابەزە ، تۆ میوانی ، هیچ نەبێ نانێ ، ئاوێ . . .
(دمدم ، ل ۱۳۳)

سەربازانی کورد کە بەم نەنـەر و دەستدرێژی‌یـەیان زانی هێنـدەی دیکە ئاگریان گرت و زاتیان بزووت و ئەوەی کردیان ، کردیان . . .
(دمدم ، ل ۳۱۸)

---

= بۆنموونە :

« بـەکـایێف . . . دەڵێت پـەیـوەسـتی هـاویـەنـدایـەتی سیـتـاکـسی لـە زمـانی کوردیدا . . . » (ل ۱۱) .

« نووری عەلێ ئەمین . . . لەبارەی لکاندنی ئەم جۆرە رستە شوێن‌کەوتووانەشەوە دەڵێ بەیارمەتی (ی ، ی‌کە ، کە) بە رستەی سەرەکیەوە دەبەسترێنە وە . . . » (ل ۱۳) .

«بڕوانە فەرهەنگۆکی ئەم کارە» (ل ۱۱ ، پەراوێزی ۲ و ۳ و ٤ و ٥) .

«بڕوانە بەشی یەکەم و لقی سێیەم ، لقی چوارەم بەشی دووەم» (ل ۲٦) .

نووسەر لە ناوەڕاستی ڕستەدا کۆمەڵەخاڵ دادەنێ ، بۆ ئەوەی خوێنەر بۆ شتێکی چاوەڕوان نەکراو یان سەیر ئامادەبکات . وەك :

گومان لە ڕاست ، بەڵام باوەڕ
بە درۆ . . . (ئاخ دیاری خوای شەڕ !)

(گۆران ، ل ١٩٦)

لە وتەی قارەماندا کۆمەڵە خاڵ نیشانەی برینە (لە بیرکردنەوەدا ، لە گەڕاندا بەشوێن وشەی لەباردا ، گومانکردندا ، شێواندا . . .) وەك :

- وەی بەسەر چاوان هاتی ، کاکە خورشید ، ئەمرێ . . . خزمەتێ . . . فەرموو بڵێ . . .

(دمدم ، ل ـ ٣٨)

سوتۆ بەگە زمانی چووە کلیلە و هەرچەندی کرد نەیتوانی وەڵامی حوسێن خانی بداتەوە ، زمانی بەیەکدا ئاڵا و گوتی :

ر ، ر ، ر . . .

زۆر جار کۆمەڵەخاڵ لەجێی ئەو وشانە دادەنرێ ، کە لە دەقێکی وەرگیراودا نەنووسراونەتەوە . وەك :

زۆر جار « تێگەیشتنی ڕاستی » دەکەوتە باسی « خۆشەویستی » و « دڵسۆزی » بێهاوتای ئینگلیز بۆ کورد . بەگەرمی دەیگوت : « حکومەتی ئینگلیز کوردانی زۆر خۆش دەوێ . . . چونکە دەزانێ لە تاریخی عالەمدا کوردان ناوێکی گەورەیان هەیە و بە مەردی و ئازایی هەتا ئێستا خۆیان ڕاگرتووە . حەزناکا وا بڵاویبێننەوە و خزمەتی ئەم و ئەو بکەن . . . هەڵبەتە حکومەتی موعەزەمەی ئینگیلتەرە کە کوردانی لە هەموکەس زیاتر خۆش دەوێ وەکو ئیشی ئەقوامی تری ئاسان کرد ئیش بۆ ئەوانیش ئاسان دەکا . . . »[٢٢]

---

(٢٢) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد ، « تێگەیشتنی ڕاستی » و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ١١٨ .

کۆمەڵەخاڵ لە سەرەتای هەندێ ڕستەوە دادەنرێ ، بۆ نیشاندانی دەستپێکردنی باسێکی نوێ . وەك :

- زۆر سەیرە ئەم کوردانە چییان لێ بەسەرهات ، دەڵێی عەرز قووتی داون . . . بۆ سبەینێ کە ڕۆژبووەوە و قەڵا بەدیارکەوت ، سەردار خان لێی ڕوون بووەوە کە کوردەکان خۆیان لە حەسار داوە .

(دمدم ، ل ٣٣٧)

**کۆما (،) :**

کۆما بۆ جیاکردنەوەی ڕستەی سادە لەناو ڕستەی لێکدراودا ؛ بۆ جیاکردنەوەی پارچەیەك لە ڕستەیەکی تێکەڵ ؛ بۆ جیاکردنەوەی ڕستەی شوێنکەوتوو لە ڕستەی سەرەکی ؛ بۆ جیاکردنەوەی ئەندام (وشە یان دەستەواژە) ی هاوچەشنی ڕستە ؛ جیاکردنەوەی وشەکانی بانگهێشتن و ڕووی دەم تێکردن و بەرپەرچدانەوە . . . دادەنرێ . ئەم ئەرکانەی کۆما لە پلەی یەکەمدا ئەرکی ڕێزمانین و لێرەدا ڕێزمان بەجۆرێکی چڕ پێوەندی بە واتاوە هەیە ، لەبەرئەوەی تەنیا ڕێزمان سنووری ڕستە نییە ، بەڵکو واتاش سنووریێتی . ئەگەرچی ئەندامەکانی ڕستە بریتین لە کۆمەڵێ وشەی دیاری کراو ، بەڵام بە ڕێکەوت نییە ، کە دیاری کردنی ئەندامەکانی ڕستە بە مەسەلەی واتاوە بەندە .

چەند نموونەیەك

* جیاکردنەوەی ڕستەی سادە لەناو ڕستەی لێکدراودا :

من بۆ خۆم بانگی یەك لە بەگزادان دەکەم ، بۆمان چاکا . . .

(دمدم ، ل ٦٩)

* جیاکردنەوەی پارچەیەك لە ڕستەیەکی تێکەڵ :

لەوەتی هەم خواردنم لە خواردنی دەشت و دەران بەتام و خۆشتر ، بەتایبەتی قلیانە شوانانە ، نەخواردووە .

(دمدم ، ٣١٨)

* جیاکردنەوەی ڕستەی شوێنکەوتوو لە ڕستەی سەرەکی :

وەك ئاشکرایە ، لە زمانی کوردیدا ژمارەیەك ئامرازی سینتاکسی هەیە : (بەڵام ، چونکە ، هەرچی ، کە ، تا ، بەڵکو ، وەکو ، نەوەکو ، ئینجا ، ئەگینا ، ئەگەر . . .) کە ڕستەی شوێنکەوتوو دەگەیەنە ڕستەی سەرەکی ، پێویستە لە پێشیانەوە کۆما دابنرێ . وەك :

مزگەوتەکە دوو ساڵ دەبوو بینا نرابوو ، بەڵام هێشتا هەر بێمەلا بوو . . .

(دمدم ، ل ٥١)

لەکاتی مازووچنیندا کەس لێمان ناگرێ و بە شوورەیی دانانرێ ، چونکە بووە بە دەستووری هەموو لایەك .

(دمدم ، ل ٢١٣)

عەشیرەتی مللا لە دیاربەکرەوە نێزیك بوون ، هەرچی ئێمە بووین تەواوێ دوور بووین .

(دمدم ، ل ٢٨)

بۆ هەر سەر لقێ چەند ئێشکچی یەکی دانا ، کە بە نۆرە یەکی سێ سەعاتان ئێشك بگرن ، تا ئێشکگرەکانیش بحەسێنەوە . . .

هتد . . .

(دمدم ، ل ١٨٥)

گەلێ جار ڕستەی شوێنکەوتوو و ڕستەی سەرەکی بە بێ ئامراز بەیەكدەگەن . بێگومان لەم حاڵەتەشدا دیسان دانانی کۆما پێویستە بۆ جیاکردنەوەیان . بەوێنە :

ئەوێ ڕۆژێ نەك هەر خەڵکی شار ، خەڵکی قەزا و ناحیە و گوندەکانیش جێژنانە و دیاری خۆیان هێنابوو . . .

(دمدم ، ل ٦٠)

* جیاکردنەوەی وشە ئەندامی هاوچەشنی ڕستە :
قومی کە لەم فکرە بێ‌بش بێ دائیما بریشانە ، اسیرة ، بێ‌دسەلاتە .
(تێگەیشتنی ڕاستی ، ژ ۳ ، ل ۱ ، س ۱ ، د ۸ ـ ۹)

* جیاکردنەوەی دەستەواژە ئەندامی هاوچەشنی ڕستە :
قژکاڵی ، لێوئاڵی ، پرشنگی نیگا کاڵ ،
ئەی کچە جوانەکەی سەرگۆنا نەختێك ئاڵ !

(گۆران ، ل ٤٥)

* بانگهێشتن و ڕووی دەم تێ‌کردن :
یوسف ، ڕۆستەم ، ڕمب وا ناگیرێ ، ڕمبەکانتان چاك لە کەلەکەتان بچەسپێنن .
(دمدم ، ل ٧١)

فەرموون ، جارێ بەرکوڵێکی بکەن تا قلیانە شوانەکە پێ‌دەگا .
(دمدم ، ل ٦٧)

* بەرپەرچ‌دانەوە :
نەخێر ، ئەم نێچیرە لە هەموو نێچیرەکانی دیکە چاکترە . . .
(دمدم ، ل ٦٧)

وێڕای ئەوە ، باری تایبەتی ئەوتۆ هەیە ، کە دانان یان دانەنانی کۆما بە واتاوە بەستراوە .

دەربارەی کۆما هەرچی‌یەك بنووسی هەر کەمە . هێندە ئەرك و دەور دەبینێت ، کە لێرەدا بەکورتیش مەودای لێدوانی نییە . جا تەنیا ئەوە دەڵێم ، کە بەداخەوە زوربەی زمانەوانانی ئەمڕۆی کورد نەك هەر لە زۆر شوێنی ئاشکرا و پێویستدا دایانانێن ، بەڵکو لە شوێنی ئەوتۆشدا قوتی‌دەکەنەوە ، کە دەبێتە هۆی

تێکچوونی پێکهاتن و واتای ڕستەکە[23] . بەڵێ « تێگەیشتنی ڕاستی » یش لە هەندێ شوێنی پێویستدا کۆما دانانێ ، بەڵام دەبێ ئەو ڕاستی یە لەبیرنەکەین ، کە لەگەڵێ جێدا نووسیویێتی و لە دیاری کردنی شوێنیدا هەڵەی نەکردووە .

چەند نموونەیەك :

هەزاران ماڵ ویران بو ، سوتا ، وەك جگری خانەخوی بو بە کوی زوخاڵ . (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٥ ـ ١٦) .

کەلی کس ایوارە بێ چرا دەما ، شەو بێ شیو سەریان انایەوە . (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٨ ـ ١٩) .

قومی کە لەم فکرە بێ بش بێ داٸما بریشانە ، اسیرە ، بێ دسەلاتە . (ژ ٣ ، ل ١ ، س ١ ، د ٨ ـ ٩) .

. . . هتد .

**کۆمای خاڵدار (٤):**

کۆمای خاڵدار کاتێ دادەنرێ ، کە پارچەکانی ڕستە نیهادەکانیان جیاکردبێتەوە ؛ یاخود لەنێو ڕستەدا نیشانەی خاڵبەندی دی هەبێ . لەو حاڵەتانەدا لە ڕێگەی هۆی ڕێزمانی یان پێکهاتنەوە دەکرێ باسی کۆمای خاڵدار بکرێ ، ئەگەرچی ئەم جۆرە بەکارهێنانەی کۆمای خاڵدار وەنەبێ دژی تێدا خوێندنەوەی واتا بێ . بەوێنە :

---

(٢٣) بەوێنە د. نەسرین فەخری لە سێ دێری سەرەتای (پێشەکی) ی کتێبی « چاوگی بێ واتا لە زمانی کوردیدا » (بەغدا ، ١٩٧٣) کە نووسیویێتی : « دەتوانین بڵێین کە ئەم باسەی لێرەدا بڵاوی دەکەینەوە بەشێکی ئەو باسەیە کە چەند ساڵە خەریکین کۆی دەکەینەوە و لێ ی دەکۆڵینەوە بەگوێرەی توانا و ساڵ بە ساڵیش بەرهەمی . . . » (ل ٣) یەك کۆما چی یە دای نەناوە ، کەچی ئاشکرا دیارە کە چەند شوێنێکی ئەو نووسینە پێویستی بە کۆمایە . . .

هەروەها لە چەند دێری (ئەنجام)ی وتاری ( پەرەسەندنی واتای وشە و دەوری لە دەوڵەمەندکردنی زماندا » (مجلة الاستاذ ، ژ ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ـ ١٩٧٩ ، ل ٦٤٣ ـ ٦٧١) دا کە نووسیویە : « ئەوەندە دەڵێین کە خوێنەر خۆی بە سەرنجدانی باسەکە و وردبوونەوە لێی دەتوانێت لە دەور و توانای ئەم وشەیە بگات لەپاڵ ناسینی گشت ئاڵوگۆڕێکیدا کە بەسەر ڕواڵەت و ناوەرۆکیدا هاتووەو ئەمەش چ کارێکی کردوتە سەر زمانەکە و چەند فراوانی پێداوە و . . . » (ل ٦٦٠) دیسان نەك هەر تاکە کۆمایەك چی یە دای نەناوە ، بەڵکو هیچ نیشانەیەکی تری خاڵبەندیشی بەکارنەهێناوە .

یەکێك جوانیی وەك هەتاوە ،
تین و تیشکی لەپێش چاوە ؛
یەکیك مانگی شۆخ و شەنگە ،
سیحری جوانیەکەی بێدەنگە ؛
یەکێك شێوەی دوان خۆشە ،
جوان نییە ، بەڵام جوان پۆشە ! . . .

(گۆران ، ل ٥٣ ـ ٥٤)

ئەگەر کۆمای خاڵدار لە جێی کۆما دابنرێ ، ئەوە دەوری واتا بەسەر دەوری ڕێزماندا زاڵ دەبێ ، چونکە کۆمای خاڵدار هەندێ پتر نیشانی جیاکردنەوەی بیر دەدات بەوێنە :

ئێوە لە سەرێکەوە هەقتانە ؛ کاتێکی شاعەبباس لەشکری لێ کردن ، وە جواب نەهاتن ؛ خەریکی گا و گەردوون کردن بوون ، بەڵام کە لەشکری لەمەش کرد ئەوێ ڕۆژێش هیچتان نەکرد .

(دمدم ، ل ٥٥)

هەندێ جار کۆمای خاڵدار تەنانەت دەتوانێ لە گەیاندنی واتادا سەرەکی بێت ، وەك :

ئەو میللەتانە موسڵمان نین ، کافر و دین دژمنن ؛ دەبێ پیر و لاو و ژن و منداڵ و ورد و درشتیان قڕکەین ، ئەگەر ماڵ و کلووریشیان تاڵان و بڕۆکەین گوناه نیە و لێمان حەڵاڵە . . .

(دمدم ، ل ٦٢)

تەقەڵ (-) :

ئەو کۆمەڵە دەستوورەی تەقەڵ لەسەر بناغەیان دادەنرێ ، بەپێی ڕەچاوکردنی ڕێزمانیی ڕستە دادەمەزێ . بەوێنە :
١ ـ دانانی تەقەڵ لەنێوان دەستەی نیهاد و گوزارەدا . وەك :

مردن مردنه ـ لنگەبزاوتن چی یە ؟
شەش کەرەت شەش ـ سی و شەش
٢ ـ جیاکردنەوەی وتەی ڕاستەوخۆ ، واتە جیاکردنەوەی گفتوگو لەنێوان دوو کەسدا . وەك :
شەباب دەبیرکردنەوەیدا بوو ، لەنکاو ژنێکی ڕەشتاڵەی سەر و کەللە خشتی ، مل بە متومۆری ، دەست پر لە بازنی بەغدایی بەپیریەوە هات ، گوتی :
ـ برا فەرموو پیادەبە ، بۆ بە سواری وەستاوی ؟
ـ خوشکم پیادە نابم ، کارم بە مێردەکەتە ، پێی بڵێ وەدەرکەوێ . . .
ـ مێردەکەم لێرە نیە ، دوێنێ بۆ قەلا گەڕاوە . نازانم چۆن ملی ئەو ڕێگا دوورەی گرت ڕۆی ؟ قەتیش بە پێ نەڕۆییوە .
(دمدم ، ل ١٣٣)

٣ ـ تەقەڵ لەپاش وشە هاوخاسیەتەکان و پێش وشەی ڕاگەیەنەر دادەنرێ ، وەك :
ئازایەتی ، وەفا ، سوارچاکی ـ ڕەوشتی کوردە .
٤ ـ لە شێوەی ڕێزمانیدا ، هەروەها دەلوێ تەقەڵ بۆ جیاکردنەوەی ڕستەی سەرەکی لە ڕستەی شوێنکەوتوو بەکاربهێنرێ . وەك :
ئەوان بۆوا دەکەن ـ کەس نازانێ .
٥ ـ تەقەڵ دەشێ لەنێوان وشەی دژواتادا دابنرێ ، ئەگەر وشەی پێوەندی لابرێ . وەك :
ئەو نەدەڕۆیشت ـ ڕاوەستابوو .
کاتێ دارا هات من نەنووستبووم ـ بەخەبەربووم .
تەقەڵ ئەگەرچی لەسەر بناغەی کۆمەڵێ دەستووری ڕێزمانی بەڕێوەدەچێ ، بەڵام هەروەها دەشێ لە چەند لایەنی دیشەوە دەور ببینێ . وەك :
١ ـ ئەگەر تەقەڵ لەجێی کۆما بەکاربهێنرێ ، ئەرکی دەربڕین و خستنەڕووی باری ڕێزمانی دەبینێ .
٢ ـ وا ڕێدەکەوێ تەقەڵ لەسەر بناغەی واتا دادەنرێ . بەوێنە لە ڕستەی لێکدراودا ئەگەر پێویست بکا لە ڕستە شوێنکەوتووەکەدا ئەنجامێکی چاوەڕواننەکراو یان هەواڵێکی سەیر یان گۆڕینی باس یان ڕوونکردنەوە

نیشان بدرێ ، ئەوە بە تەقەڵ دەردەبڕێ . بەوێنە :

هەموویان ماوەیەك لە شوێنی خۆیاندا هاتن و چوون و دوایی قوتابخانەکە تێکرا - وەك قوتابخانەیەکی خوێن گەرم - دوایی هات . .

(مەحوی ، ل سی ویەك)

٣ - تەقەڵ چۆن ئەرکی ڕێزمانی یان ئەرکی واتایی دەبینێ ، هەروەها دەتوانێ لە یەك کاتدا هەردوو ئەرکەکە ببینێ .

٤ - تەقەڵ لە هەندێ باردا دەتوانێ واتای ئاواز بگەیەنێ ، ئەویش کاتێ بۆ گەیاندنی واتای وەستانی تایبەتی دادەنرێ .

٥ - جاری وا هەیە تەقەڵ بۆ نیشان دان و خستنە پێش چاوی وشەیەك دەنووسرێ ، کە لەناکاو دێتە ناو ڕستەوە[٢٤] . بەوێنە :

بە ناسکیی پەل و پۆی تۆ - مەحاڵە - فێر نابێ !

(گۆران ، ل ٩٥)

د . کامیل بەسیر و مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە باسی خاڵبەندیدا ، هەر یەکە لە سێ حاڵەتی بەکارهێنانی تەقەڵ دواون کە هیچ حاڵەتێکیان سەرەکی و گرنگ نییە[٢٥] . ئەو نیشانەیە لە نووسینی ئەمڕۆی کوردیشدا یان نابینرێ ، یان کە دەبینرێ بە زۆری لە شوێنی لەباردا دانەنراوە[٢٦] .

---

(٢٤) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ڤ . ف . ئیڤانۆڤا ، سەرەتاییکی خاڵبەندیی ڕووسی ، ل ٣٠ - ٣٤ .

(٢٥) بڕوانە :
أ - سەرچاوەی ناوبراو ، د. کامیل بەسیر ، خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی ، ل ١٠ - ١١ .
ب - سەرچاوەی ناوبراو ، نووری عەلی ئەمین ، ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی ، ل ٩٨ .

(٢٦) د . ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم لە کتێبی ناوبراویدا کە نووسیویە : « سەبارەت ڕستەی لێکدراویش بەتایبەتی ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز و ڕستەی لێکدراوی پەیوەستدار دەدوێ - وە دەربارەی بەیەکەوە - لکاندن و بەیەکەوە نووساندنی ڕستانیش . . » (ل ١١) ، بێ ئەوەی هیچ پێویست بکا ، نیشانەی تەقەڵی داناوە .

تەقەڵ لە « تێگەیشتنی ڕاستی » دا هەرچەندە کەم بەرچاو دەکەوێ ، بەڵام ئەو شوێنانەی تیایاندا دانراوە ، نەك هەر شوێنی لەبارن ، بەڵکو شوێنی سەرەکیشن . بەوێنە کە نووسیویە : « حکومتیکی مشروطەی (دیموقراتیە) ـ یعنی باشتراك فکر هەمو رعیت ـ تاسیس بکا و . . . » (ژ ٥ ، ل ١ ، س ٢ ، د ٢) و لەو شوێنانەدا نیشانەی تەقەڵی داناوە ، ئەرکی دەربرین و خستنە پێش چاوی باری ڕێزمانی ڕستە شوێنکەوتووەکەی دیاری کردووە . لەم چەشنە شوێنانەدا دانانی تەقەڵ لە کۆما باشترە ، چونکە لەم جۆرە جێگایانەدا کۆما تەنیا جیاکردنەوە نیشان دەدا ، بەڵام تەقەڵ لە یەك کاتدا جیاکردنەوەش و لێك دانیش دەردەبڕێ . . . « تێگەیشتنی ڕاستی » هەروەها کە لە (ژ ٢ ، ل ١ ، س ١ ، د ٦) دا نووسیوێتی : « ام سؤاله معنیداره بی شك جوابی ـ هیچه ـ کردان هەمو وقتی سربست و آزا ژیابون » و لە پێش و پاشی وشەی (هیچە) وە نیشانەی تەقەڵ دادەنێ ، ئەوە واتای وەستان و ئاوازی تایبەتی و خستنە پێش چاوی وشەیەکی لە ناکاو بەکارهێنراو دەگەیەنێ .

**دووکەوانە ( ) :**

دەشێ پارچەیەکی ڕستە یان ڕستەیەکی سەرلەبەر یان چەند ڕستەیەك لە نێو دووکەوانەدا دابنرێ .

دووکەوانە نیشانەیەکی واتایی یە . بە زۆری سەرنجی تەواوکەری واتا و ڕوونکردنەوەی هەمەجۆر دەخرێنە نێو دوو کەوانەوە . لەگەڵ ئەوەشدا ، کە بەکارهێنانی نیشانەی دووکەوانە لە پلەی یەکەمدا بەندە بە واتاوە ، بەڵام وەك ئا . م . پیشکۆڤسکی ڕادەگەیەنێ ، ڕاست نیە وا دابنرێ کە دووکەوانە « هیچ مانایەکی ڕێزمانی نیە »[٢٧] . خۆ ناشێ هەر پارچەیەکی ڕستە بخرێتە نێو دووکەوانەوە . تەنیا ئەو پارچانە دەخرێنە نێو دووکەوانەوە کە نەك هەر لە ڕووی واتاوە ، بەڵکو لە ڕووی ڕێزمانیشەوە دیاری دەکرێن .

---

(٢٧) ئا . م . پیشکۆڤسکی ، دەوری خوێندنەوەی باش لە فێرکردنی نیشانەکانی خاڵبەندیدا ، « کارە هەڵبژاردەکانی » ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ٢٥ .

